# هەڵوەشاندنەوەی

# پەڕگیری

نوێ

## نقض التطرف



چاپی دووەم

پاڵفتە ولێی زیادکراو




عەلی باپیر

# هەڵوەشاندنەوەی پەڕگیریی و پووچەڵکردنەوەی بیروڕایەکانی پەڕگیران

نووسینی : عەلی باپیر



چاپی یەکەم ٢٠١٩ز- ١٤٤٠ك

"بیروبۆچونی ئەم کتێبە، مەرج نیە هەمان بیرو بۆچونی نوسینگەی تەفسیر بێ"



نوسینگەی تەفسیر
بۆچاپ و بڵاوکردنەوە
هەولێر- شەقامی 30 مەتری تەنیشت منارەی چۆلی
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com
/TafseerOffice

ئامادەکردنی پێڕست - نوسینگەی تەفسیر

**هەڵوەشاندنەوەی پەڕگیریی و پووچەڵکردنەوەی بیروڕایەکانی پەڕگیران**

عەلی باپیر (نووسەر)

٤٤٤ لاپەڕە

١٧* ٢٤ سم

بابەت، فیکري

ISBN: 978-9922-620-03-9

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان
هەرێمی کوردستان ژمارە سپاردنی ( ٧٨٤ ) ی ساڵی ٢٠١٥ پێدراوە.

دیزاینی ناوەوە :جمعە صدیق کاکە

دیزاینی بەرگ : زەردەشت کاوانی

خەتی بەرگ :نەوزاد کۆیی

# هەڵوەشاندنەوەی پەرگیری

عەلی باپیر

چاپی دووەم
١٤٤٠ك/ ٢٠١٩ز

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

١- ﴿ فَٱسۡتَقِمۡ كَمَآ أُمِرۡتَ وَمَن تَابَ مَعَكَ وَلَا تَطۡغَوۡاْۚ إِنَّهُۥ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ ١١٢ ﴾ هود.

٢- ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلۡنَٰكُمۡ أُمَّةٗ وَسَطٗا لِّتَكُونُواْ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيۡكُمۡ شَهِيدٗاۗ ١٤٣ ﴾ البقرة.

٣- {... **وَإِيَّاكُمْ وَالْغُلُوَّ فِي الدِّينِ فَإِنَّمَا أَهْلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ الْغُلُوُّ فِي الدِّينِ**} أخرجه أحمد: ٣٢٤٨، والنسائي:٣٠٥٧، وابن ماجه: ٣٠٢٩.

# پێشکەش بێ

١) بەهەموو ئەوانەی دەیانەیٚو هەوڵدەدەن: ڕێكو ڕاست لە ئیسلامی بەرجەستە لە قورئانو سوننەتدا تێبگەنو، هاوسەنگانەو دوور لە تێپەڕاندنو بە زایەدان، پێیەوە پابەندنو لێی لانەدەنو، سەرەنجام ژیانێکی پاكو چاك لە دنیادا بەڕێ بکەنو، لە دوارۆژیشدا بەدیداری خوا عز وجل شاد بنو، ژیانی نەبڕاوەی نێو بەهەشتی ڕازاوە بۆخۆیان دەستەبەر بکەن.

٢) بەهەر کەسێك کە لە پشت پەردەی ڕەشەوە، تەماشای هیچ کەسێكو هیچ شتێك ناکاتو، هەڵەو لادانی شوێنکەوتووانی هیچ بەرنامەیەك لەسەر خودی بەرنامەکە حیساب ناکات.

# پێشەكی

إن الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا، مَنْ يهده الله فلا مضل له، وَمَنْ يضلل فلا هادي له، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له، وأشهد أن محمداً عبده ورسوله.

{يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ } آل عمران.

{يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ﴿١﴾} النساء

{يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ﴿٧٠﴾ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾ } الأحزاب.

أَمَّا بَعْدُ:

فإِنَّ أَصْدَقَ الحَديث كَلامُ الله، وَخَيْرَ الْهَدِي هدْيُ مُحَمَّد - صَلَّى الله عَلَيْه وَسَلَّمَ - وَشرَّ الأُمُورِ مُحْدَثَاتُها، وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَة، وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلاَلَةٌ، وَكُلَّ ضَلاَلَةِ فِي النَّار.

خوای تاك‌و پاك سبحانه وتعالى كه خاوەنی هەرچی ناوی چاك‌و سیفەتی بەرزو پەسندە، دروستكراوەكانی خۆی بەباشترین شێوەو دوور لە هەر كەم‌و كوڕیی‌و

ناڕێکییەك وەدیهێناون، وەك فەرموویەتی:

﴿ ٱلَّذِى خَلَقَ سَبۡعَ سَمَٰوَٰتٖ طِبَاقٗاۖ مَّا تَرَىٰ فِى خَلۡقِ ٱلرَّحۡمَٰنِ مِن تَفَٰوُتٖۖ فَٱرۡجِعِ ٱلۡبَصَرَ هَلۡ تَرَىٰ مِن فُطُورٖ ﴿٣﴾ ثُمَّ ٱرۡجِعِ ٱلۡبَصَرَ كَرَّتَيۡنِ يَنقَلِبۡ إِلَيۡكَ ٱلۡبَصَرُ خَاسِئٗا وَهُوَ حَسِيرٞ ﴿٤﴾ ﴾ الملك.

واتە: (خوا) ئەو کەسەیە کە حەوت چینە ئاسمانی دروستکردوون، هیچ جۆرە ناڕێکییەك لە دروستکراوی (خوای) بەبەزەییدا نابینی، جار لە دوای جار چاو بگێڕە، بزانە هیچ کەلێنو ناڕێکیی بەدی دەکەی! دوایی دوو کەڕەتان چاو بگێڕە، سەرەنجام چاوت بە ماندوویێتییو هیچ دەستگیر نەبوویی دێتەوە لات.

ئنجا بێگومان بەرچاوترین ڕووی وردەکارییو یاساداریی لە دروستکراوەکانی خوادا، بریتیە لە: هاوسەنگیی (إتِّزان)، وەك خوای بەرزی مەزن فەرموویەتی:

﴿ وَٱلسَّمَآءَ رَفَعَهَا وَوَضَعَ ٱلۡمِيزَانَ ﴿٧﴾ ﴾ الرحمن، واتە: (خوا) ئاسمانی بەرز کردۆتەوەو تەرازوو (سیستم)ی تێدا داناوە.

ئنجا بێگومانیش هاوسەنگیی لە دروستکراوەکانی خوادا، زادەو بەرهەمی حیکمەتو بەزەیی بێ سنووری خوایە، هەروەك چۆن ڕاستی و دادگەریی فەرمانو یاسایەکانیشی هەڵقوڵاوی زانیارییو شارەزایی ڕەهای خوان، وەك خوای زاناو توانا فەرموویەتی:

﴿ قُلۡ أَنزَلَهُ ٱلَّذِى يَعۡلَمُ ٱلسِّرَّ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ إِنَّهُۥ كَانَ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ﴿٦﴾ ﴾ الفرقان.

واتە: بڵێ: (قورئان) ئەو کەسە دایبەزاندوە کە نهێنی نێو ئاسمانەکانو زەوی دەزانێ، بێگومان ئەو لێبوردەی بەبەزەییە.

هەروەها فەرمایشتی خواش لەو پەڕی ڕاستییو دادگەریی دایە، وەك خوای

بـەرز فەرمووویـەتی: ﴿ وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًا ۚ لَّا مُبَدِّلَ لِكَلِمَاتِهِ ۚ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ﴿١١٥﴾ ﴾ الأنعام.

هەر بۆیەش:

کاتێـك مسـوڵمانان بـەبێ لادان، پابەنـد دەبـن بـە ئیسـلامەوە، چ وەك تـاك تاكیـانو، چ وەك كۆمـەڵگایان، هاوسـەنگ دەبـنو لـە هەڵبـەزو دابـەزو كەمتەرخەمیو تێپەڕاندن دوور دەبن، وەك چۆن هاوەڵانی پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّم) بە گشتیو بەتایبـەت پێشـكەوتووە یەكەمـەكان لـە كۆچكەرانو پشـتیوانان وابوون، بۆیەش خـوای بەخشـەر مـوژدەی بەهەشـتو ڕەزامەنـدیی خـۆی بـەخۆیانو بەوانەش داوە كە بەچاكیی شوێنیان دەكەون:

﴿ وَالسَّابِقُونَ الْأَوَّلُونَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالْأَنصَارِ وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُم بِإِحْسَانٍ رَّضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي تَحْتَهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا ۚ ذَٰلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ﴿١٠٠﴾ ﴾ التوبة.

هەروەها پێغەمبەری خواش (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّم) سـێ سـەدەكەی سـەرەتای بـە چاكترین سەدەو بەباشترین خەڵك پێناسە كردوون:

**{خَيْرُ النَّاسِ قَرْنِي ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ ثُمَّ يَجِيءُ مِنْ بَعْدِهِمْ قَوْمٌ تَسْبِقُ شَهَادَتُهُمْ أَيْمَانَهُمْ وَأَيْمَانُهُمْ شَهَادَتَهُمْ}** رواه البخاري: ٢٦٥٢، ومسلم: ٢٥٣٣.

(عبدالله بن مسعود)یش خـوا لێـی ڕازی بـێ لـەبارەی هـاوەڵانی پێغەمبـەرەوە گوتوویەتی:

**{مَن كانَ منكم مُستَنًّا، فَلْيَستَنَّ بأصحاب محمد** (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ)**، فإنَّهُم كانوا أبرَّ هذه الأمة قلوباً، وأعمقَها علمًا، وأقلَّها تكلُّفًا، وأقومها هدياً، وأحسَنها حالاً، قومٌ اختارهم الله لصحبة نبيِّه، ولإقامة دينه، فاعرِفوا لهم**

**فضلَهم، واتبعُوهم على أثرهم، فإنهم كانوا على الهُدَى المستقيم}**[1].

واتە: هەر کەستان دەیەوێ سەرمەشقێکی هەبێ، با هاوەڵانی موحەممەد (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) سەرمەشقی بن، چونکە:

دڵو دەروونیان لەهی هەموو ئۆممەت چاکتر بوو و، لە هەموویان زانیارییان قووڵتر بوو و، ڕوو دەربایسیو تەکەللوفیان کەمتر بوو و، لە هەموویان ڕێو شوێنیان ڕاستترو، حاڵیان چاکتر بوو، کۆمەڵێك بوون خوا بۆ هاوەڵایەتیی موحەممەدو بەرپاکردنی ئاینەکەی هەڵیبژاردبوون، بۆیە پێگەی بەرزیان بزاننو بکەونە شوێن شوێنەوارەکانیان، بە دڵنیایی ئەوان لەسەر ڕێنماییەکی ڕاستو ڕێك بوون.

ئنجا لە سۆنگەی ئەوەوە کە جیهانی ئیسلامیی ئێستا، زۆرێك لەو تاقمو گرووپە پەرگیرو تێپەڕێنەرانەی تێدان، کە ڕووی گەشو هاوسەنگی ئیسلامیان بەبیر کردنەوەو ڕەفتارە کرچو کاڵە لادەرەکانیان، شێواندوەو لەبەرچاوی گەلێك کەسی نەشارەزا بە ئیسلام، بێزاندوویانە، بۆیە پاش ئیستیخارەو ڕاوێژ کردن، بەئەرکی سەرشانی خۆمم زانی، کە چەند باسێك لەبارەی پەرگیریو تێپەڕاندن (الغلو والتطرّف)ەوە بنووسم، لەبەر ڕۆشنایی قورئانو سوننەتداو بەبەهرە وەرگرتن لە بەرهەمی زانایانو پێشەوایان، ئیدی سەرەنجام ئەو باسانە بوونە سێ زنجیرەی چەند ئاڵقەیی بەجۆرەی خوارێ:

١ - زنجیرەی یەکەم: پەرگیریی: پێناسەی پەرگیریی، پەرگیرانو نیشانەکانیان، هۆکارەکانی پەرگیریی، شوێنەوارەکانی پەرگیریی، ڕێیەکانی چارەسەری پەرگیریی. پێنج (٥) ئاڵقە.

[1] جامع بيان العلم وفضله، ج٢ ص١٢٤، إبن عبدالبر.

٢- زنجیرەی دووەم: نابێ لادانو تاوانی پەڕگیران، بەرانبەر بە ئیسلام بمانخاتە دوو دڵییو گومان. دە (١٠) ئاڵقە.

٣- زنجیرەی سێیەم: هەڵوەشاندنەوەی بیروڕاو ڕەفتارەکانی ڕێکخراوی داعش. حەوت (٧) ئاڵقە.

شایانی باسیشە: وامان پێباش بوو کە بەر لەوەی بیستو دوو (٢٢) ئاڵقەکەی ئەو سێ زنجیرەیە، لە شێوەی کتێبدا بڵاو بکەینەوە -لە چاپی یەکەمدا هەر کام لەو سێ زنجیرەیە بە کتێبێکی سەربەخۆ بڵاو کرایەوە- ئاڵقە دوای ئاڵقەبە هەردووك زمانی کوردییو عەرەبیی[1]، لە لاپەڕەی تایبەتی خۆم لە تۆڕی کۆمەڵایەتییدا: (www.facebook.Com/alibapir) بڵاو بکرێتەوە، تاکو خێراتر بکەوێتە بەرچاوی خوێنەرانی بەڕێز.

هەڵبەتە ئێستاش کە لەم چاپی دووەمەدا،[2] هەرسێك زنجیرەکە لە دوو تویی کتێبێکدا چاپو بڵاو دەکەینەوە، پاش دووبارە چاو پێداگێڕانەوەو پاڵفتە کردنەوە، ناوی زنجیرەمان بە (بەش) گۆڕیوەو بەمجۆرەی لێهاتوە:

بەشی یەکەم: پەڕگیریی: پێناسەی پەڕگیریی، پەڕگیرانو نیشانەکانیان، هۆکارەکانی پەڕگیریی، شوێنەوارەکانی پەڕگیریی، ڕێیەکانی چارەسەری پەڕگیریی.

بەشی دووەم: نابێ لادانو تاوانی پەڕگیران، بەرانبەر بە ئیسلام بمانخاتە دوو دڵییو گومان.

بەشی سێیەم: هەڵوەشاندنەوەی بیروڕاو ڕەفتارەکانی ڕێکخراوی داعش.

---

[1] مامۆستا یاسین حسن محمد لە کوردییەوە کردیە عەرەبیی، خوا پاداشتی هەرە باشی بداتەوەو، سەربەرزو سەرفرازی ئێرەو ئەولای بکات.

[2] شایانی باسە: ئەم کتێبە تەرجەمە عەرەبییەکەی دوو چاپی کراون، یەکیان لە (لەندەن)/ دار الحكمة و، دووەمیشیان لە (قاهرة)/ دار الحكمة و مركز القاهرة للدراسات الكوردية، هەروەها ئەم کتێبە بۆ زمانەکانی فارسی و ئینگلیزیش وەرگێڕراوەو، تەرجەمە تورکییەکەشی بەڕێوەیە.

لە خوای بەرزی مەزنو زاناو تواناش عز وجل داواکارم کە هاوکاریی مسوڵمانان بکاتو بە کتێبی خۆیو ڕێبازی پێغەمبەرەکەی (محمد (صَلّی اللّهُ عَلَیْهِ وَسَلَّمَ)) ئاشنا ترو بەرچاو ڕوونتریان بکاتو، لە تێپەڕاندنو پەرگیریی بیانپارێزیو، جارێکی دیکە بەهۆی ڕاست تێگەیشتنەوەی مسوڵمانان لە ئایینەکەیانو، چاك پێوە پابەند بوونیەوە، خۆری بەختەوەریی ئیسلام بەسەر جیهانییاندا بدرەوشێنێتەوەو، تەمی توندو تیژییو کوشتاور تێکدان، لەسەر مرۆڤایەتیی بڕەوێنێتەوە.

سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ
وَسَلَامٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ
وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ.

١٣ محرم ١٤٤٠ك
٢٣ ئەیلوولی ٢٠١٨ز
هەولێر

# بەرایی

خوێنەری بەڕێزو سەنگین!

ئەم بەشی یەکەمە، لێکۆڵینەوەیەکی -تا ڕاددەیەك- چڕو پڕە، لەبارەی دیاردەیەکەوە، کە لەهەر کۆمەڵگایەکدا سەرهەڵبدات، لێی دەبێتە خۆرکەو مۆرانەو، سەری بەفەتارەت دەدات، ئەویش بریتییە لە پەڕگیریی (تطرف)و تێپەڕاندن (غلو).

ئنجا هەرچەندە وشەکانی: پەڕگیریی (تطرف) و تێپەڕاندن (غلو) مانایەکانیان گشتیین، بەڵام لەبەکارهێنانی مسوڵمانانندا، چەمكو واتایان، دیاریيکراوە، کە مەبەست پێیان: پەڕگرتنو تێپەڕاندنە لەئیسلامداو، لادانە لە شەریعەتو، سەرکێشییو زێدەڕۆیی تێدا کردنیەتی، وەك خوای کاربەجێ بەپێغەمبەری خاتەم (محمد) (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ)ی فەرموەوە: ﴿ فَٱسۡتَقِمۡ كَمَآ أُمِرۡتَ وَمَن تَابَ مَعَكَ وَلَا تَطۡغَوۡاْۚ إِنَّهُۥ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ ﴿١١٢﴾ ﴾هود.

واتە: دەجا وەك فەرمانت پێکراوە: خۆتو ئەوانەی لەگەڵت گەڕاونەوە (بۆلای خوا) ڕێك وەستاوبنو، سەرکێشیی مەکەن، بێگومان ئەو (خوا) بینەری ئەوەیە کە دەیکەن.

دیارە جوانییو ڕەونەقی مسوڵمانەتییو دینداریيش، لەوەدایە کە خاوەنەکەی تێیدا هاوسەنگو ڕێك (مُتَّزِن و مُعتَدِل) بێ، هەر بۆیەش خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلۡنَٰكُمۡ أُمَّةٗ وَسَطٗا لِّتَكُونُواْ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيۡكُمۡ شَهِيدٗاۗ ﴾البقرة.

واتە: بەو شێوەیە ئێوەمان گێڕاوە بە کۆمەڵێکی میانجیی، تاکو ئێوە بەسەر خەڵکەوە شایەدبن و، پێغەمبەریش بەسەرتانەوە شایەدبێ...

پێغەمبەری خواش(صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) وشەی: (وسطاً) بە (عَدْل) تەفسیر کردوەو فەرموویەتی: (**الوسط : العَدْل**)[1]، کەبێگومان مەبەست لە (عدل) لێرەدا حاڵەتی هاوسەنگیی و خەتی نێوەڕاست گرتن و، خۆدوورگرتنە لە هەرکام لە کەمتەر خەمیی (تقصیر)و زێدەڕۆیی (إفراط)، چونکە لەزۆربەی سیفەت و کردەواندا هەرکام لە: کورتهێنان (تفریط)و تێپەڕاندن (إفراط) خراپن و، هەق و چاکە دەکەوێتە نێوانیان، هەر لێرەشەوەیە کە زانایان گوتوویانە:(كِلا طرفي الأمر مذموم) ئەملاو لای هەر شتێك، ناپەسندن، بۆ وێنە:

١. بەخشندەیی (كَـرَمْ) دەکەوێتە نێوان: ڕژدیی (بُخْـل)و دەستبڵاویی (تبذیر)یەوە.
٢. ئازایەتیی (شجاعة) لەنێوان: ترسنۆکیی(جُبْن) وهەڵەشەیی (تهوُّر) دایە.
٣. خۆپارێزیی وداوێن پاکیی (عفّة) لەنێوان: بێ ئارەزوویی (خُمول)و ئارەزووبازیی (شهوانية)دایە.
٤. لێزانیی و کارامەیی (حكمة) لەنێوان: کەودەنیی (غَباء)و فێڵبازیی (شيطنة)دایە.
٥. نەفسبەرزیی (عزة النفس) لەنێوان سووکیی(مهانة)و خۆبەزلگریی (تكبُّر)دایە.

ئەمانە چەند نوونەیەك بوون لەبواری ڕەوشت و ئاکاداردا، ئنجا لەهەموو بوارەکانی دیکەشدا هەروایەو، بەزۆریی ڕاستیی و هەق لەنێوەڕاستدایەو، هەمیشە

[1] رواه البخاري: ٤٤٨٧.

کورتهێنان لەوەی شەریعەت گوتوویەتی، یان لێ تێپەڕاندنو زێدەڕۆیی تێداکردنی، هەردووکیان خراپن.

هیواداریشم ئەم بەرهەمم ببێتە مایەی بەرچاو ڕوونبوونەوەی مسوڵمانانو، گێڕانەوەو پاراستنیان لەنەخۆشییو دەردی کوشندەی پەڕگیرییو سەختگیریی، کەمایەی فەوتانی مرۆڤەو، بۆ کۆمەڵگاش خۆرکەیەکی بێڕەزایەو، سەرەنجامیش پەڕگیران: پاش زیان گەیاندن بەخۆیانو ئایینە هاوسەنگەکەیانو کۆمەڵگاکەیان، تەمەنیان کورتەو زۆر بڕناکەنو لەبەین دەچن.

# ڕێ خۆشکردن

خوێنەری بەڕێزو خۆشەویست!

لەم ڕۆژگارەماندا ژمارەیەکی زۆرلە مسوڵمانان لەهەردوو ڕەگەزەکە، لەکەمتەرخەمیی و بەزایەدان (قصور وتفريط)دان بەرانبەر بەئایینەکەیان، چ لەبواری فیکرو عەقیدەو، چ لەبواری خواپەرستییو، چ لەبواری ئاکارو ڕەفتارو، چ لەبواری کۆمەڵایەتییو، چ لەبواری حوکمو سیاسەتدا، کە دیارە ئەم واقیعە شپرزو هەڵبزڕکاوو بێ هێزو پێزەی جیهانی ئیسلامیش، هەر زادەو دەرهاویشتەی ئەو کەمتەرخەمیی و خۆبواردنەیە!

بەڵام لەبەرانبەریشدا دیسان ژمارەیەك لە مسوڵمانانێك، کە بەحیساب ڕەخنەیان لەکەمتەرخەمو خۆبوێرەکان هەیەو، دەیانەوێ واقیعەکە چارەسەر بکەنو، پاکسازییو چاکسازیی تێدا بکەن، بەلای زێدەڕۆییو پەرگیرییو تێپەڕاندنو سەرەڕۆییدا شکاونەوەو، بیروڕاو سەرنجو ڕەفتارو هەڵسو کەوتی وایان لێ پشکوتۆتەوەو دەرکەوتوە، کە پێچەوانەو دژی شەریعەتەو، سەربارەش مایەی لەبەرچاوان بێزراندنو شێواندنیشیەتی!

ئنجا لەسۆنگەی ئەوەوە کە مەگەر چۆن دەنا هیچکەس نیە نەزانێ، کە ڕەفتارو هەڵسو کەوتی کەمتەرخەمان (مُقصِّرين)و بەزایەدەران (مُفَرِّطِين)، ناشەرعییو هەڵەیەو، گوناهوتاوانە، بەڵام لەبارەی بەهەڵەو ناشەرعییو، بەلادانو تاوان لەقەڵەمدانی تێپەڕاندنو پەرگیریی (إِفراط و غُلُوّ)ی پەرگیران (متطرِّفِين)ەوە، تارادەیەکی زۆر تەمو مژو نابەرچاوڕوونیی هەیەو، بەحوکمی لەئاوی لێڵدا ڕاوکردنی کەسانێکی ناحەزو بوغزاوییش بەرانبەر بەئیسلام، گەلێك جار ئەو

ڕەفتارو هەڵسو كەوتە تێپەڕێنەرانەو پەڕگیرانەیەی ئەو جۆرە كەسانەش، دەقۆزرێنەوە، بۆ چەواشەكارییو بەناهەق تۆمەتباركردنی قورئانو شەریعەت! بۆیە پێویستی كرد، باسێكی پوختو گوشراو، لەبارەی پەڕگیرییەوە بنووسین.

ئنجا خوا پشتیوان بێ هەوڵدەدەین ئەم بابەتە گرنگە لەپێنج ئاڵقەدا بخەینەڕوو و، تیشك بخەینە سەر دیاردەی (پەڕگیریی –التَطرُّف) لەژێر ئەم ناو و نیشانانەی خوارێدا[1]:

١- پێناسەی پەڕگیریی.
٢- پەڕگیران (مُتطرِّفون) كێنو نیشانەكانیان چین؟
٣- هۆكارەكانی سەرهەڵدانی پەڕگیریی.
٤- شوێنەوارو دەرهاوێشتەكانی پەڕگیریی.
٥- چۆنیەتی چارەسەری پەڕگیریی.



١) شایانی باسە بۆ نووسینی ئەم بەشە، تا ڕاددەیەك سوودم لەم كتێبانە وەرگرتوە:
١- الغلو في الدين في حياة المسلمين المعاصرة، عبدالرحمن مُعلاّ اللّوَيْحق.
٢-مشكلة الغلو في الدين في العصر الحاضر، ج١، ج٢، ج٣ د. عبدالرحمن مُعلاّ اللّوَيْحق.
٣- الصحوة الإسلامية من المراهقة إلى الرشد، د. يوسف القرضاوي.
٤-الصحوة الإسلامية بين الجحود والتطرف، د. يوسف القرضاوي.

## أ- پێناسەی پەڕگیریی لەڕووی زمانەوانییەوە:

پەڕگیریی تەرجەمەی كوردیی وشەی (تطرُّف)ە، ئنجا هەرچەندە وشەی (تطرُّف) لە دەقەكانی شەریعەتدا نەهاتوە، بەڵام چوار وشەی دیكە لەوبارەوە هاتوون، كە هەمان مەبەستی وی دەگەیەنن، كە بریتین لە:

١- الغُلوّ
٢- العُنْف
٣- التشدُّد
٤- التنطّع

ئنجا با ئێستا سەرنجی چەمكو واتای هەركام لەو پێنج وشەیە بدەین:

**١-التطرُّف**: لە (المعجم الوسيط)[1] دا هاتوە: (الطَّرَفُ من كل شيءٍ: مُنْتَهاه والطَّرَفُ: الناحية والجانب.. وتطرَّف: أَتَى الطَّرف في كذا، جاوز حَدَّ الإعتدال ولم يتوسَّط..). كەواتە: (طَرَف) بە ئەوپەڕی شتێكو بەتەنیشتو قەراغو سنووری شتێك دەگوترێ، و (تطرُّف)یش یانی: پەڕگیریی‌و ئەوسەرگرتن‌و تێپەڕاندن‌و سنووربەزاندن‌و، خەتی نێوەڕاست نەگرتن‌و هاوسەنگ نەبوون.

**٢-الغُلُوّ**: وشەی (غُلوّ) كە لە (غلا يغلو غُلواً)ەوە هاتوە، وەك خاوەنی(مختار الصحاح)[2] گوتوویەتی: (غلا في الأمر: جاوز فيه الحدَّ) واتە: لەوكارەدا سنووری بەزاندو تێپەڕاند، كە دیارە ئەوە هەركام لە(ابن فارس) لە (معجم مقاييس اللغة)و (إبن منظور) لە(لسان العرب)و(الفيروز آبادي) لە (القاموس المحيط)دا دووپاتیان كردۆتەوە.

---

١) ص ٥٥٥.
٢) ص٤٢٠.

**٣-العُنْف:** ئەمیش وەك(إبن فارس) لە (معجم مقاييس اللغة)دا گوتوویەتی: (العين والنون والفاء (ع، ن، ف) أصلٌ صحيحٌ يدلُّ على خلاف الرِّفق)[١] واتە: پیتەکانی (ع) و (ن) و (ف) لەبنەڕەتدا پێچەوانەی نەرمو نیانیی (رفق) دەگەیەنن.

دیارە لە کوردییشدا (عُنْف) بەتوندوتیژیی مانا کراوە، کە هەم بواری قسەو، هەم کردەوەش دەگرێتەوە.

**٤- التشدّد:** ئەمیش (إبن فارس) گوتوویەتی:(..فالشِّينُ والدّال، أصلٌ يدلُّ على قوةٍ في الشّيء) [٢] واتە: پیتەکانی (ش) و (د) توندیی لەشتێکدا دەگەیەنن.

**٥- التنطّع:** ئەمیش وەك (إبن فارس) گوتوویەتی: (النونُ والطّاءُوالعَيْنُ، أصلٌ يدلُّ على بسط في الشيء وملاسةٍ، ومنه النِّطع، والنَّطْعُ وهو مبسوط أمْلَسٌ)[٣] واتە: پیتەکانی(ن) و (ط) و (ع) لەبنەڕەتدا ڕاخرانو لووسیی شتێك دەگەیەنێ،کە چەرم(نَطْع)یش لەوەوە هاتوەو، ئەویش پانو لووسە.

شایانی باسیشە: وشەی(تَنَطُّع) لە(النَّطْع)ەوە هاتوە کە بەمەلاشووی سەرەوەی زاردەگوترێو، بۆیەش بەبابای(مُتَنطِّعْ)گوتراوە:(مُتنَطِّعْ)، چونکە لەکاتی قسەکردندا، کە بەفیزو دەمارەوەو پڕ بەزاری قسە دەکات، مەلاشووی دیار دەبێ![٤]

دیارە بەسەرنجدانی ئەو پێنج وشەیەش، بۆمان دەردەکەوێ، کە مانای هەرکام لە: (تطرف)و (غلو) زۆر لێك نیزیکنو، هەردووکیان ئەو پەڕگرتنو تێپەڕاندنو

---

١) ج٤ ص٢٣.

٢) هەمان سەرچاوە، ج٣ ص٣٥.

٣) هەمان سەرچاوە، ج٥ ص٣٥.

٤) بڕوانە:النهاية في غريب الحديث، ج٥ ص٧٤.

سنوور بەزاندن، دەگەیەنن.

ئنجا سێ وشەکەی دیکەش:(العنف والتشدّد والتنطّع) سیفەتو دەرهاویشتەکانی پەڕگیریی دەگەیەنن.

چونکە بابای پەڕگیرو تێپەڕێنەر:

١- لەبواری مامەڵەکردن لەگەڵ خەڵكو دەوروبەردا، توندوتیژ (عنیف)ە.

٢- لەبواری دینداریيدا، سەختگیرو وشكو ڕەقە.

٣- لەقسەوکرداریدا، زۆر قووڵبووەو خۆئەزیەت دەرە، بێ ئەوەی پێویست بێ.

## ب ـ پێناسە پەڕگیریی لەڕووی زاراوەییەوە:

مرۆڤ لەبواری دینداریيو پابەندیی بەشەریعەتدا، بەگشتی سێ حاڵەتی هەن:

١- گرتنی خەتی نێوەڕاست بەبێ لادان بەملاولادا:

کە دیارە ئەمیش بەوە دەبێ، مرۆڤ پابەندبێ بەشەریعەتەوەو، نەلێی تێپەڕێنێ، نەلێی بەجێ بمێنێ، واتە: نە زێدەڕۆییو تێپەڕاندن (إفراط)ی هەبێ، نە کەمتەرخەمیيو بەزاندن (تفریط).

٢- کەمتەرخەمیيو کورتهێنان:

ئەویش ئەوەیە کە بابای دیندار بەشێك لە ئەرکەکانی شەریعەت، زایە بکاتو پشتگوێ بخات.

٣- تێپەڕاندنو سنووربەزاندن:

ئەویش ئەوەیە کە بابای مسوڵمان لەهەندێك بواردا، لە بازنەو سنووری شەریعەت بەولاوەتر بچێو، لێیان تێپەڕێنێ.

ئنجا ئەوەی سێیەمیان پەرگیریی (تطرُّف)یـە، کـە پێچـەوانەو دژی دووەمیانـە، کە بریتیە لە کەمتەرخەمیی‌و بەزایەدان(التفریط والتضییع).

دیـارە جـوانیی‌و ڕەونـەقی ئیسـلامیش، بەوحاڵەتـەی هاوسـەنگیی (إعتـدال)و، خەتی نێوەڕاست گرتن (الوسطیة)و، خۆ دوورگرتن لە تێپەڕاندن‌و بەزایەدان(الإفراط والتفـریط)ە، بۆیـەش خـوای کاربـەجێ‌و پێغەمبـەری خاتـەم (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فەرمانیان بە ئەهلی ئایین کردوە، کـە ڕاسـتە شـەقامی شـەریعەت بگـرن‌و، نـەڵێی تێپەڕێنن‌و نەڵێی بەجێ بمێنن، بۆ نموونە:

١- ﴿ ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ﴿٦﴾ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ﴿٧﴾ ﴾الفاتحـة، واتـە: - خوایـە- بمانخـە سـەر ڕاسـتە ڕێ، ڕێـی ئەوانەی چاکەت لەگەڵ کردوون، نەك ڕێی لێتووڕەبووان‌و، نەك گومڕایان.

٢- ﴿ تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ فَلَا تَعْتَدُوهَا ۚ وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٢٩﴾ ﴾ البقـرة، واتـە: ئـا ئەوانـە سـنوورەکانی خـوان، مەیانبـەزێنن‌و، هەرکـەس سنوورەکانی خوا ببەزێنێ، ئائەوانەن ستەمکاران.

٣- ﴿ فَٱسْتَقِمْ كَمَآ أُمِرْتَ وَمَن تَابَ مَعَكَ وَلَا تَطْغَوْا۟ ۚ إِنَّهُۥ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿١١٢﴾ ﴾ هود، واتە: دەجا خۆت‌و ئەوانەی لەگـەڵت گەڕاونـەوە (بـۆلای خـوا) وەك فـەرمانت پێکـراوە، ڕاوەسـتاو و نەلەخشـاوبەو، سەرکێشـیی مەکەن، بێگومان ئەو (خوا) بینەری ئەوەیە کە ئەنجامی دەدەن.

٤- ﴿ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لَا تَغْلُوا۟ فِى دِينِكُمْ وَلَا تَقُولُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْحَقَّ ﴾النسـاء، واتـە: ئـەی خـاوەن کتێبینـە! لەدینداریيتانـدا تێمەپەڕێنن‌و، جگە لە هەق بەناوی خواوە مەڵێن..

٥- {**عن ابنُ عبَّاسٍ قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ غَدَاةَ جمع: هَلُمَّ الْقُطْ لِي، فَلَقَطْتُ لَهُ حَصَيَاتٍ هُنَّ حَصَى الْخَذْفِ، فَلَمَّا وَضَعْتُهُنَّ فِي يَدِهِ، قَالَ بِأَمْثَالِ هَؤُلَاءِ، وَإِيَّاكُمْ وَالْغُلُوَّ فِي الدِّينِ، فَإِنَّمَا أَهْلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ الْغُلُوُّ فِي الدِّينِ**} (رَوَاهُ أَحْمَد برقم:(٣٤٧)، وَابْنُ خُزَيْمَة برقم:(٢٨٦٨)، وَالنَّسَائِيْبرقم: (٣٠٥٧) وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٠٢٩)، وَالحَاكِمْبرقم: (١٧١١)، وَصَحَّحَهُ عَلَى شَرطِ الشيخين، وَوَافَقَهُ الذَّهبي)

واتە: پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) بەیانی ڕۆژی دەیەمی مانگی (ذي الحجة) پێی فەرمووم: بچۆ ورده بەردانم بۆ هەڵگرەوە، منیش چەند ورده بەردێك كە بەپەلاپیتكە دەهاویشترێن، بۆم هەڵگرتنەوە، ئنجا كاتێك لەدەستی كردن فەرمووی: بەڵێ، وێنەی ئەوانە بەكاربێنن (بۆ بەردپێدادانی سێ جەمرەكان)و خۆتان لە تێپەڕاندن لەدینداریيدا دووربگرن، چونكە ئەوانەی پێش ئێوە، بەتێپەڕاندن لە دینداریيدا فەوتان.

٦- {**عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن مَسْعُودٍ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم «هَلَكَ الْمُتَنَطِّعُونَ»، قَالَهَا ثَلاثًا**}(أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم:(٢٦٧٠)، وَأَبُو دَاوُدَبرقم: (٤٦٠٨)، وغيرهما).

واتە: سەختگیران فەوتاون- سێ جاران فەرمووی.

(النووی) گوتوویەتی: (الْمُتَنَطِّعُونَ: أي المتعمِّقون المغالون المجاوزون الحدود في أقوالهم وأفعالهم). [1]

واتە: (المتنطِّعون) یانی: قووڵبووەوانی تێپەڕێنەری سنووربەزێن، لە قسەو كردەوەكانیاندا.

٧- {**لاَ تُشَدِّدُوا عَلَى أَنْفُسِكُمْ فَيُشَدَّدُ عَلَيْكُمْ، فَإِنَّ قَوْمًا شَدَّدُوا عَلَى أَنْفُسِهِمْ فَشُدِّدَ عَلَيْهِمْ، فَتِلْكَ بَقَايَاهُمْ فِي الصَّوَامِعِ وَالدِّيَارَاتِ، رَهْبَانِيَّةً ابْتَدَعُوهَا**

١) شرح صحيح مسلم: ج١٦ ص ٢٢٠.

**مَا كَتَبْنَاهَا عَلَيْهِمْ**}(رَوَاهُ أَبُو دَاوُد برقم: (٤٩٠٤) قال الألباني ضعيفٌ، وَأَبُو يَعْلى برقم: (٣٦٩٤) وقال محقق مسند أبي يعلى: إسناده حسن، ج٦ ص ٣٦٥،قال الهيثمي (٢٥٦/٦) : رجاله رجال الصحيح غير سعيد بن عبد الرحمن بن أبي العمياء وهو ثقة).

واتە: سەختگیریی لەسەرخۆتان مەکەن، ئەگەرنا خواش سەختگیرییتان لەسەر دەکات، چونکە (پێش ئێوە) کۆمەڵێك دینداریی یان لەسەرخۆیان سەختکرد، خواش لەسەری قورس کردن، ئنجا ئەوە شوێنەوارەکانیانن لەصەومیعەو دێرەکاندا،(ڕەهبانییەتێکیان داهێنا، ئێمە لەسەرمان پێویست نەکردبوون))

٨- {**إِنَّ الدِّينَ يُسْرٌ وَلَنْ يُشَادَّ الدِّينَ أَحَدٌ إِلاَّ غَلَبَهُ، فَسَدِّدُوا وَقَارِبُوا وَأَبْشِرُوا وَاسْتَعِينُوا بِالْغَدْوَةِ وَالرَّوْحَةِ وَشَيْءٍ مِنْ الدُّلْجَةِ**}(أَخْرَجَهُ البَخَارِيّ:(٣٩)، والنسائي:(٥٠٣٤).

واتە: بێگومان ئایین -ی ئیسلام- ئاسانەو، هیچکەس پێشبڕکەی لەگەڵ ئاییندا نەکردوە، مەگەر ئایین پێشیکەوتۆتەوە، دەجا خەتی

نێوەڕاست بگرنو میانجیی بنو دڵخۆشکەربنو، بەهرە لەبەیانیانو ئێوارانو بەشێك لەکۆتایی شەوگار وەربگرن.

٩- {**إِنَّ هَذَا الدِّينَ مَتِينٌ فَأَوْغِلْ فِيهِ بِرِفْقٍ وَلا تُبْغِضْ إِلَى نَفْسِكَ عِبَادَةَ اللَّهِ، فَإِنَّ الْمُنْبَتَّ لا أَرْضًا قَطَعَ وَلا ظَهْرًا أَبْقَى**}(رَوَاهُ البزّار (٧٤/١) وقد وردت الجملة الأولى في رواية عن أنس مرفوعاً عند أحمد (١٩٩/٣)، وقد حسّن الألباني في الجامع الصغير الجملة الأولى منه: ٢٤٤٢).

واتە: ئەم ئایینە پتەوە، دەجا بەنەرمیی پێیدا بچۆ خوارێو، پەرستنی خوا لەلای خۆتان بوغزێنراو مەکەن، چونکە کەسێك باری زۆر قورس لەولاخ بنێ، نەرێگاکە دەبڕێو، نە ولاخەکەشی دەمێنێ.

## پوختەی قسان لە پێناسەی پەڕگیرییدا:

پەڕگیریی بریتییە لە تێپەڕاندنو سنووربەزێنییو زێدەڕۆیی لەدیندارییدا، بەشێوەیەك کە بابای پەڕگیر(متطرِّف)چ لەڕووی فیکرییەوە، چ لەڕووی کردەییەوە، لەبازنەی شەریعەت بەولاوەتر بچێو، بەجێی بهێڵێو، بیەوێ لە ئیسلام ئیسلامتربێ!

(الحافظ ابن حجر) لەوبارەوە گوتوویەتی: (الغُلوّ: المبالغة في الشيء والتشديد فيه بتجاوز الحَدِّ) [1]

واتە: غولوو: زێدەڕۆییو سەختگیریی کردنە لە شتێکدا، بەجۆرێك کە سنوورەکەی ببەزێنرێ.

شایانی باسیشە هەمیشە کەسانێك دووچاری دەردی پەڕگیریی دەبن، کە بەحیساب دەیانەوێ لەدینداریياندا جیددییتر بنو باشتربن، بەڵام بێگومان چاکتردینداریی کردن، بەئارەزوو و میزاج نیەو، پێویستە بەپێوەرو تەرازووی خودی شەریعەت، شوێن شەریعەت بکەوینو، بەوجۆرەی کە خوا "عز وجل" خۆی دیارییکردوە، لە قورئانداو لە سوننەتی پێغەمبەرەکەیدا(صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) خواپەرستیی بکەین.

دیارە لەدرێژەی ئاڵقەکانی داهاتووشدا، چەمكو واتای پەڕگیرییو کەسایەتیی پەڕگیران، زیاتر ڕوون دەبێتەوە.

---

١) فتح الباري، ج١٣ ص ٧٨.

# دەستپێک

دەتوانین بەکورتیی و پوختیی بڵێین: پەرگیران و تێپەڕێنەران (المتطرِّفون والمُفْرِطون) ئەو کەسانەن کە چ لەڕووی بیروبۆچوون و تێڕوانینەوە، چ لەڕووی هەڵس و کەوت ڕەفتارەوە، لەبازنەی شەریعەت دەچنەدەرو سنوورەکانی ئایین دەبەزێنن، بەخەیاڵی خۆیان بەمەبەستی باشتر دینداریی کردن.

شایانی باسیشە: پەرگیرو تێپەڕێنەران، پێچەوانەو دژی کەمتەرخەم و بەزایەدەران (المُقَصِّرون والمُفَرِّطون)ن، چونکە ئەوانەی پێشێ، لەدین تێدەپەڕێنن و، ئەوانەی دواییش، لەدین بەجێ دەمێنن و کورتی دێنن.

دیارە مسوڵمانەتیی و دینداریی ڕاست و ساغیش، ئەوەیە کە خەتی نێوەڕاست(الصراط المستقیم)ی ئایین بگری و بەملاولادا لانەدەی و، نە لەدین تێپەڕێنی و نەلێشی بەجێ بمێنی.

وەك (عمربن عبدالعزیز) لەنامەیەکیدا کە بۆ یەکێك لە (عامِل)[1]ەکانی ناردوە، ئامۆژگاریی کردوە: کە ڕێبازی پێشین بگرێ، پاشان بۆ پێناسەی ڕێبازی پێشین نووسیویەتی:

**{لَقَدْ قَصَّرَ قَوْمٌ دُونَهُمْ فَجَفَوْا، وَطَمَحَ عَنْهُمْ أَقْوَامٌ فَغَلَوْا، وَإِنَّهُمْ بَيْنَ ذَلِكَ لَعَلَى هُدًى مُسْتَقِيمٍ}** (رَوَاهُ أَبُو دَاوُد برقم:(٤٦١٢).

---

١) ئەو کاتە بەرپرسی شارە گەورەکان (عامل)ی پێگوتراوە، کە ئێستا پارێزگار (محافظ)ی پێدەڵێن.

واتە: کۆمەڵانێك لەخواروانەوەن (واتە: لەخوار ئەوانەوەن کە ڕاستەڕێیان گرتوە) کەمتەرخەم دەرچوونو، کۆمەڵێکی دیکە لەوان هەورازترچوون، پەرگیردەرچوونو، ئەوانیش لەونێوانەدا لەسەر ڕاستەڕێن.

هەروەها با لەسەر بناغەی بنچینەی: (وبضدِّها تتبيَّن الأَشياءُ) واتە: شتەکان بەبەراورد لەگەڵ دژو پێچەوانەکانیاندا باشتر ڕوون دەبنەوە، چەند قسەیەکی (ابن القيِّم)یش لەوبارەوە بێنینەوە، گوتوویەتی:

(ما أمر الله بأمرٍ الاّ وللشيطان فيه نزغتان: إمّا إلى تفريط وإضاعة، وإمّا إلى إفراطٍ وغلو، ودين الله وسط بين الجافي عنه والغالي فيه، كالوادي بين الجَبَلَيْن، والهدى بين ضلالَتيْنِ، والوَسَطِ بين طَرَفين ذَميمين، فكما أن الجافي عن الأمر مُضَيِّعٌ لَهُ، فالغالي فيه مُضَيّعٌ له، ذاك بتقصيره عن الحدِّ، وهذا بتجاوزِه الحَدَّ)[1].

واتە: خوا فەرمانی بەهەر ئەرکێك کردبێ، شەیتان لەدوولاوە دژایەتیی کردوە: یان بەرەو کەمتەرخەمییو بەزایەدان، یان بەرەو تێپەڕاندنو زێدەڕۆیی.

ئایینی خواش لەنێوان کورتهێنەرو تێپەڕێنەر دایە، وەك شیوی نێوان دوو چیایانو، ڕێنمایی نێوان دوو گومڕاییانو، نێوەڕاستی نێوان دوولای سەرزەنشتکراو، ئنجا وەك چۆن کەسێك کەمتەرخەم بێ بەرانبەر کارێك، زایەی کردوە، کەسێکیش تێیدا پەرگیر بێ، دیسان هەر زایەی کردوە، ئەویان بەنەگەیشتنە سنوورو، ئەمیشیان بە تێپەڕاندن لە سنوور.

کەواتە: ئەگەر بمانەوێ زۆربەکورتییوگوشراویی پێناسەی پەرگیرانو تێپەڕێنەران بکەین، دەبێ بڵێین:

پەرگیران کەسانێکن کە لەخەتی نێوەڕاستی شەریعەت لادەدەنو سنوورەکانی دەبەزێنن.

١) مدارج السالكين، ج٢ص٤٩٦.

بەڵام لێرەدا پێویستە پرسیارێکی گرنگ بورووژێنین: ئایا کێ مافی ئەوەی هەیە پەرگیران (مُطَرِّفِين)مان پێ بناسێنێ‌و، نیشانەکانیانمان پێ بڵێ؟!

ئنجا بەرلەوەی وەڵامی ئەو پرسیارە بدەینەوە، دەڵێین:

بێگومان ئەو پرسیارە پرسیارێکی گرنگ‌و لەجێیە، چونکی ئەگەر بێت‌وپێوەروتەرازوویەکی ڕاست‌وداد‌گەرانەمان نەبێ، لەدیاریکردنی پەرگیریی‌و ناساندنی پەرگیران‌و خستنەڕووی نیشانەکانیاندا، بواری زۆر هەیە بۆ خلیسکان‌و بەهەڵەداچوون‌و، سەرەنجام ستەم‌و لادان!

با لێرەدا بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەست، بەسەرهاتێکی کورت بگێڕمەوە:

جارێکیان سەردانی ناسیاوێکمان کرد،ئەویش گلەیی زۆری لەکوڕێکی خۆی کردو گوتی: زۆر توندو ئیشك‌و پەرگیرەو، حەزدەکەم ئامۆژگاریی بکەی، دیارە لەوکاتەدا کوڕەکەی لەماڵ نەبوو، منیش گوتم: باشە، بەڵام باخۆیشی بێتەوە،گوێ لەویش بگرم، بزانم ئیشکیی‌و پەرگیرییەکەی لەچی دایە؟

دیارە کاتێك کوڕەکەی هاتەوە لەوبارەوە لێم پرسی، هیچی وام تێدا بەدی نەکرد، کە پشتگیریی دەعوایەکەی بابی بکات، بۆیە لەبابی کوڕەکەم پرسی:توندیی‌و پەرگیریی کوڕەکەت لەچی دایە؟

گوتی: نوێژی سوننەت زۆر دەکات‌و، پێنج شەممەو دووشەممە بەڕۆژوو دەبێ‌و، زۆر قورئان دەخوێنێ‌و.. هتد!

منیش گوتم: فلانکەس! کوڕەکەت توند ڕەوو وشك نیەو ئاساییە، بەڵام چونکە خۆت زۆر شل‌و کەمتەرخەمی، ئەوت لەچاو خۆت، توندو پەرگیر هاتۆتە بەرچاو!

ئێستاش دێینەوە سەر وەڵامدانەوەی پرسیارەکەو دەڵێین:

بێگومان تەنیا خوا، پاشان پێغەمبەرەکەی (صَلّی اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) مافی ناساندنی پەرگیرو تێپەڕێنەران‌و خستنەڕووی نیشانەکانیان هەیە، هەڵبەتە لەبواری

دیندارییدا، ئەگەرنا لەبوارەکانی دیکەدا، کە پەکیان لەسەر سروش (وحي) نەکەوتوە، دەستمان کراوەیە.

ئەو مەسەلەیەشم بۆیە خستەڕوو، چونکە لەم ڕۆژگارەدا هەندێك لەوانەی لەپەنای دژایەتیی کردنی پەرگیریی دا، دژایەتیی تەوژمی ئیسلامییو بگرە خودی ئیسلامیش دەکەن، دەیانەوێ تەنانەت نیشانەو دروشمە سادەکانی دینداریش وەك: نوێژی بەکۆمەڵ کردنو، نوێژو ڕۆژووی سوننەتو،ڕیش هێشتنەوەو، پۆشاکی شەرعییانەی پۆشتەو بەحورمەتی ئافرەتانو، جیهادو بەرگریی کردن لەدینو ژینی خۆو... هتد، بەنیشانەو بەڵگەی پەرگیریو توندڕەویی ئەژمار بکەن!!

## نیشانەكانی پەرگیران لەقورئان وسوننەت دا:

کەواتە: بابچینە خزمەت قورئانو سوننەتو، بزانین چۆن پێناسەو وەسفی پەرگیران دەکەنو، ئەو دروشمو نیشانانە چین کە لێیان هەڵدەدەن؟!

### ١)- شوێنکەوتنی ئارەزوو:

بەڵێ، پەرگیران بەهۆی شوێنکەوتنی ئارەزووەکانی گومڕایانەوە، لاڕێ دەبن، وەك خوای کاربەجێ فەرموویەتی: ﴿قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لَا تَغْلُوا۟ فِى دِينِكُمْ غَيْرَ ٱلْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعُوٓا۟ أَهْوَآءَ قَوْمٍ قَدْ ضَلُّوا۟ مِن قَبْلُ وَأَضَلُّوا۟ كَثِيرًا وَضَلُّوا۟ عَن سَوَآءِ ٱلسَّبِيلِ ﴿٧٧﴾﴾ المائدة.

واتە: بڵێ ئەی خاوەن کتێبینە! لەدینداریتاندا بەناهەق پەرگیریی مەکەنو، بەدوای ئارەزووەکانی کۆمەڵێك مەکەون، کە پێشتر گومڕابوونو، زۆرکەسیان گومڕاکردوەو لەڕاستە ڕێ لایانداوە.

بەڵێ ، یەکەمین نیشانەودروشمی پەڕگیران،بریتیە لە شوێنکەوتنیان بۆ ئارەزووەکان (أهواء)، ئنجا چ هی خۆیان، چ هی غەیری خۆیان.

دیارە (أهواء)یش کۆی (هوى)یەو، ئەمیش لە کوردییدا بە: ئارەزوو، حەز، پێخۆشبوون، تەرجەمە دەکرێو، مەبەستیش پێی ئەو حەزو ئارەزووانەی نەفسە، کە دژو پێچەوانەی شەریعەتن، چونکە (هَوى) ڕاست پێچەوانەی (هُدى)یە!

٢و٣و٤و٥و٦و٧:

**پەڕگیران: کەم زانستو، بیر تەسکو، دڵڕەقو، قسە زبرو، وشکە پارێزکارو، خۆپەسندو، بەد گومانن:**

هەرکام لەم شەش وەسفو نیشانانەی پەڕگیرانیش، لەم دەقەی سوننەت وەردەگرین:

**{عن أبي سعيد الخدري: بَعَثَ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ "صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ" مِن الْيَمَنِ بِذَهَبَةٍ فِي أَدِيمٍ مَقْرُوظٍ ، لَمْ تُحَصَّلْ مِنْ تُرَابِهَا ، قَالَ : فَقَسَمَهَا بَيْنَ أَرْبَعَةِ نَفَرٍ.. فَقَالَ رَجُلٌ مِنْ أَصْحَابِهِ: كُنَّا نَحْنُ أَحَقَّ بِهَذَا مِنْ هَؤُلَاءِ ، قَالَ: فَبَلَغَ ذَلِكَ النَّبِيَّ "صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ" ، فَقَالَ :أَلَا تَأْمَنُونِي؟ وَأَنَا أَمِينُ مَنْ فِي السَّمَاءِ ، يَأْتِينِي خَبَرُ السَّمَاءِ صَبَاحًا وَمَسَاءً ، قَالَ: فَقَامَ رَجُلٌ غَائِرُ الْعَيْنَيْنِ، مُشْرِفُ الْوَجْنَتَيْنِ، نَاشِزُ الْجَبْهَةِ، كَثُّ اللِّحْيَةِ، مَحْلُوقُ الرَّأْسِ، مُشَمَّرُ الْإِزَارِ، فَقَالَ : يَا رَسُولَ اللَّهِ! اتَّقِ اللَّهَ ، فَقَالَ: وَيْلَكَ أَوَلَسْتُ أَحَقَّ أَهْلِ الْأَرْضِ أَنْ يَتَّقِيَ اللَّهَ ، قَالَ: ثُمَّ وَلَّى الرَّجُلُ، فَقَالَ خَالِدُ بْنُ الْوَلِيدِ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! أَلَا أَضْرِبُ عُنُقَهُ؟ ، فَقَالَ : لَا ، لَعَلَّهُ أَنْ يَكُونَ يُصَلِّي ، قَالَ خَالِدُبن الوليد: وَكَمْ مِنْ مُصَلٍّ يَقُولُ بِلِسَانِهِ مَا لَيْسَ فِي قَلْبِهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِنِّي لَمْ أُومَرْ أَنْ أَنْقُبَ عَنْ قُلُوبِ النَّاسِ، وَلَا أَشُقَّ بُطُونَهُمْ، قَالَ: ثُمَّ نَظَرَ إِلَيْهِ وَهُوَ مُقَفٍّ ، فَقَالَ: إِنَّهُ يَخْرُجُ مِنْ ضِئْضِئِ هَذَا قَوْمٌ يَتْلُونَ كِتَابَ اللَّهِ رَطْبًا لَا يُجَاوِزُ**

حَنَاجِرَهُمْ، يَمْرُقُونَ مِنَ الدِّينِ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ، قَالَ: أَظُنُّهُ قَالَ: لَئِنْ أَدْرَكْتُهُمْ لَأَقْتُلَنَّهُمْ قَتْلَ ثَمُودَ} (رَوَاهُ البَخَارِيّ برقم: (٧٤٣٢)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٤٤٩)).

واتە: عەلی کوڕی ئەبی طالیب لەیەمەنەوە هەندێك زێڕی جیانەکراوە لەخۆڵەکەی، لەپێستێکی دەباغکراودا، بۆلای پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) ناردبوو، گوتی: ئەویش لەنێوان چوار کەسدا دابەشیکرد... پیاوێك لە هاوەڵەکانی گوتی: ئێمە لەوانە پێی شیاوتر بووین، گوتی: ئنجا ئەوە بە پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) گەیشتەوە، فەرمووی: ئایا بە ئەمیندارم نازانن؟ لەحاڵێکدا کەمن ئەمینداری ئەو کەسەم (یانی: خوا) کە لەسەرەوەیە، بەیانیانو ئێواران هەواڵی ئاسمانم بۆدێ!

گوتی: پیاوێك هەڵسا: چاو قووڵی، ڕوومەت لەپێشی، نێوچەوان هەڵتوقیوی، ڕیش چڕوپڕی، سەرتاشراوی، پۆشاك هەڵکراو، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! پارێز لەخوا بکە! فەرمووی: بێ قەزابی! ئایا من شایستەترین کەسی سەرزەوی نیم کە پارێز لەخوا بکات!

گوتی: دوایی کابرا ڕۆیی، خالیدی کوڕی وەلید گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! لەملی نەدەم؟ فەرمووی: نەء، ڕەنگە نوێژ بکات، خالید گوتی: ئنجا زۆر نوێژکەری وا هەن، شتێك بەزمانی دەڵێ، کە لەدڵی دانیە!

پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فەرمووی: من فەرمانم پێنەکراوە کە دڵی خەڵك بپشکنم، یان سکیان هەڵدڕم.

دوایی لەکاتێکدا پشتی لە پێغەمبەر بوو، سەرنجی دایەو فەرمووی: بێگومان لەتۆرەمەی ئەمە ((واتە: لەشێوەو مەشرەبی وی، وەك وەچەی بن)) کۆمەڵێك یاخی دەبن، کتێبی خوا بەتەڕوتازەیی (واتە: زۆر) دەخوێننەوە، لەگەروویان تێپەڕناکا ((واتە: تێیناگەن، یان کار لەدڵو دەروونیان ناکات))، لەئایین دەردەچن، وەك چۆن تیر لە نێچیر دەردەچێ.

گوتی: پێم وایە فەرمووی: ئەگەر بیانگەمێ: وەك كوژرانی گەلی ثەموود دەیانكوژم.

چۆنیەتی وەرگێرانی ئەو شەش وەسفو نیشانانەی پەرگیرانیش، لەو دەقەی سوننەت، ئاوایە:

## ٢) و ٣)- كەم زانستیی‌و، بیر تەسكیی:

دیارە كەسێك ڕەخنە لە پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) بگرێ‌و، تەقدیری ئەوە نەكات كە پێغەمبەری خوا هیچ هەڵوێستێكی هەڵقولاوی نەفسی نیەو حەتمەن حیكمەتی تێدایە -كە حیكمەتی ئەو دابەشكردنەشی بریتی بووە، لە دڵڕاگرتنی ئەو چوار كەسە، وەك لە ڕیوایەتێكی دیكەدا هاتوە: (أَتـألّفهم)- ئەوە بێگومان بابایەكی نەزان‌و نەفامە!

پێغەمبەری خواش(صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) لەو بارەوە فەرموویەتی: (**سيخرج قومٌ في آخرِ الزمانِ، أحداثُ الأسنانِ، سفهاءُ الأحلامِ، يقولون من قولِ خيرِ البريّةِ، يقرؤون القرآن لا يجاوزُ حناجرَهم**) رواه البخاري: ٦٩٣٠، ومسلم: ٢٤٥٩.

واتە: لەكۆتایی ڕۆژگار (ڕۆژگاری حوكمڕانیی ڕەشیدی چوار خەلیفەكان)دا كۆمەڵێك یاخی دەبن: كەمتەمەنی و عەقڵ سووكن، لە قسەی باشترین كەس (كە پێغەمبەری خوایە) باس دەكەن، قورئان دەخوێنن، بەڵام لە گەروویان بەولاوە ناچێ.

## ٤)و ٥)- دڵڕەقیی‌و قسە زبریی:

ئەم دووەش لەدەقی فەرمایشتەكەدا زۆرجوان دیارن، كە:

١ - گوتوویانە:(كُنّا نحن أحقَّ بهذا من هؤلاء).

٢ - گوتوویانە: (يا رسول الله! اتق الله).

٣- هەروەها وەسفی پێغەمبەریش بۆیان: (**يتلون كتاب الله رَطْباً لا يُجاوز حَناجرهم**)، هۆکاری تێدا پەیدابوونی ئەو دوو سیفەتەیان، دەردەخات.

## ٦)- وشکە پارێزکاریی:

کە مەبەستم پێی هەبوونی هەندێك ڕەفتارو ئاکارو دروشمی بەڕواڵەت دیندارانەی بێ کاکڵو جەوهەرو بێ هێزو پێزە، وەك: ڕیش چڕوپڕکردنو، دامێن هەڵپێچانو، زۆر قوڕئان خوێندنی بێ تێگەیشتنو ... هتد.

## ٧)- خۆپەسەندیی‌و بەدگومانیی:

ئەمیش زۆر ڕوونو ئاشکرایە لەدەقەکەدا، چونکە: بابایەك ڕەخنە لە پێغەمبەری خوا بگرێو ئامۆژگاریی بکات! دیارە زۆر لەخۆی ڕازییەو، بەرانبەر پێغەمبەری خواش(صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) دڵکرمێو بەد گومانە!

## ٨) و ٩)- بەکافردانانی مسوڵمانان و، خوێن حەڵاڵکردنیان:

پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) مرۆڤی مسوڵمانی بەوە پێناسەکردوە، کە مسوڵمانان لە زمانو دەستی سەلامەتو بێ زیان بن، وەك فەرموویەتی:

(**المسلم من سَلِمَ المسلمون من لسانِهِ ويَدِهِ**) رواه البخاري بلفظ قريب منه:١١ ومسلم:١٦٢والترمذي:٢٥٠٤، والنسائي: ٥٠١٤.

واتە: مسوڵمان کەسێکە کە مسوڵمانان لەزمانو دەستی پارێزراوبن.

بەلاَم پەرگیرانی تێپەڕێنەر، مسوڵمانان نە لە زمانیان پارێزراو دەبن، نە لەدەستیان، وەك پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) لە پێناسەی (خوارج)دا فەرموویەتی:

(**يقتلون أهل الإيمان ويَدَعون أهلَ الأوثان**) رواه البخاري: ٧٤٣٢، ومسلم: ٢٤٤٨.

واتە: خاوەن بڕوایان دەکوژنو، واز لەخاوەن بتان دێنن.

هەڵبەتە دوای ئەوەش دەستیان دەچێتە خوێنڕشتنی ئەو مسوڵمانانەوە، کەزمانیان چۆتە تاوانی بەکافردانان (تکفیر)یانەوە، وەك (ابن تیمیة) لەوبارەوە گوتوویەتی:

(الفرق الثاني في الخوارج وأهل البِدَع: أنَّهم يكفِّرون بالذنوب والسَّيئات، ويترتَّبُ على تكفيرهم بالذنوب: إستحلالُ دماءِ المسلمين وأموالهم، وأن دار الإسلام دار كفرٍ، ودارهم هي دار الإيمان، وكذلك يقول جمهور الرافضة، وجمهور المعتزلة، والجهمية، وطائفة من غلاة المُنْتَسبةِ إلى الحديث والفقه ومتكلِّميهم..).[1]

واتە: جیاوازیی دووەمی خەواریجو خاوەن بیدعەتەکان، ئەوەیە کە: بەهۆی گوناهو خراپانەوە، خەڵك كافر دەکەنو، سەرەنجام لە سۆنگەی بەکافر دانانەوە، بەهۆکاری گوناهان: خوێنو ماڵو سامانی مسوڵمانان بۆخۆیان حەڵاڵ دەکەنو، وڵاتی مسوڵمانان بەمەنزڵگای کوفرو، وڵاتی خۆیان بەمەنزڵگای ئیمان دادەنێن، هەروەها جەماوەری ڕافیزەو جەماوەری موعتەزیلەو جەهمییەش هەروان، دیسان کۆمەڵێك لەپەڕگیرانی کە خۆیان پاڵدەدەنە لای ئەهلی حەدیسو ئەهلی فیقهو ئەهلی کەلامیش، هەروان.

## ١٠)- سەختگیریی‌و ناهاوسەنگیی:

دروشمو نیشانەیەکی دیکەی پەڕگیران (غُلاة) بریتییە لە زۆر خۆئەزیەتدانو، سەختگیریی‌و ناهاوسەنگیی لە دینداریيدا، وەك لەم دەقەی سوننەتەوە دیارە:

**(عن أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ قال: جَاءَ ثَلَاثَةُ رَهْطٍ إِلَى بُيُوتِ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَسْأَلُونَ عَنْ عِبَادَتِهِ، فَلَمَّا أُخْبِرُوا كَأَنَّهُمْ تَقَالُّوهَا، فَقَالُوا: أَيْنَ نَحْنُ**

---

١) مجموع الفتاوي، ج١٩ص٧٣.

مِنَ النَّبِيِّ صَلَّى اللّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ؟ قَدْ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ وَمَا تَأَخَّرَ.
فقَالَ أَحَدُهُمْ: أَمَّا أَنَا فَإِنِّي أُصَلِّي اللَّيْلَ أَبَدًا.
وَقَالَ آخَرُ: أَنَا أَصُومُ الدَّهْرَ وَلَا أُفْطِرُ.
وَقَالَ آخَرُ: أَنَا أَعْتَزِلُ النِّسَاءَ فَلَا أَتَزَوَّجُ أَبَدًا.
فَجَاءَ رَسُولُ اللّهِ صَلَّى اللّه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ:
إِنِّي لَأَخْشَاكُمْ لِلَّهِ وَأَتْقَاكُمْ لَهُ ، لَكِنِّي أَصُومُ وَأُفْطِرُ، وَأُصَلِّي وَأَرْقُدُ، وَأَتَزَوَّجُ النِّسَاءَ، فَمَنْ رَغِبَ عَنْ سُنَّتِي فَلَيْسَ مِنِّي) البخاري: ٥٠٦٣، ومسلم: ١٤٠١.

واتە: سێ کەس هاتنە ماڵەکانی هاوسەرانی پێغەمبەر(صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەبارەی خواپەرستیی پێغەمبەری خواوە پرسیاریان دەکرد، ئنجا کاتێك هەواڵیان پێدرا، وەك پێیان کەم بێ! گوتیان: ئێمە کوا دەگەینە پێغەمبەر(صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، خوا لە گوناهی ڕابردوو و داهاتووی خۆشبووە؟!

یەکیان گوتی: من بەردەوام هەموو شەوگار شەونوێژ دەکەم‌و، یەکیان گوتی: من هەموو ڕۆژێ بەڕۆوو دەبم، لێی نابوێرم، ئەوی دیکەش گوتی: منیش کەنارگیریی لەئافرەتان دەکەم‌و هەرگیز ژن ناهێنم.

پێغەمبەری خواش هات –گەڕایەوە ماڵ‌و بۆیان گێڕایەوە- و فەرمووی: من لەهەمووتان لەخواترسترم‌و بۆی پارێزکارترم، بەلام ڕۆژووش دەگرم‌و ناشیگرم – واتە: هەندێك ڕۆژان ڕۆژووی سوننەت دەگرم‌و، هەندێك ڕۆژیش بەڕۆژوو نابم‌و-، شەو نوێژیش دەکەم‌و دەشخەوم‌و، ژنانیش دێنم‌و، هەرکەس بەڕێبازی من قایل نەبێ، لەمن نیە- واتە: بەئەندازەی لادانەکەی لەمن دوور دەکەوێتەوە-.

هیچ گومانیشی تێدانیە کە زێدەڕۆیی کردن لە بوارێك یان چەند بوارێکدا،هاوسەنگیی(توازن)ی دینداریی‌و خواپەرستیی تێك دەدات‌و، لەسەر حیسابی لایەنەکانی دیکە دەبێ، دیارە جوانیی‌و ڕەونەقی ئیسلامەتییش

لەهاوسەنگیی (إتّزان)یەکەیدایەو، هەمیشەش حاڵەتی هاوسەنگ، توانای بەردەوامیی هەیە، بەڵام حاڵەتی لاسەنگ (مُختلّ) ناتوانێ بەردەوام بێ.

کەواتە:

ئەمانە دە(١٠) دروشمو نیشانەی پەڕگیرانن،کەپێیان دەناسرێنەوە:

١ - شوێن کەوتنی ئارەزووەکان (إتّباع الأهواء).

٢ - کەم زانستیی (قلّة العلم).

٣ - بیرتەسکیی (ضیق الفکر).

٤ - دڵڕەقیی ( الغِلْظة).

٥ - قسە زبریی (الفظاظة).

٦ - وشکە پارێزکاریی.

٧ - خۆپەسەندیی‌و بەدگومانیی (العُجْب وسوءُ الظن).

٨ - بەکافردانانی مسوڵمانان (تکفیر المسلمین).

٩ - ڕەواکردنی کوشتنی مسوڵمانان (إستباحة قتل المسلمین).

١٠ - سەختگیریی‌و ناهاوسەنگیی (التشدُّد وعَدَم الإتّزان).

هەڵبەتە دەگونجێ زۆر شتی دیکەش، وەك وەسفو نیشانەکانی ناسینی پەڕگیران (أوصاف وعلامات المتطرفین) باسبکەین، بەڵام پێم وایە ئەو دە (١٠)یەی باسمان کردن، سەرەکییەکانیان.

# دەستپێک

دەگونجێ لەبارەی هۆکارەکانی پەڕگیریی‌و تێپەڕاندن (الغلوّ و التطرُّف)ەوە، زۆر شت باسبکرێ، چونکە بێگومان دیاردەی ناوبراو لەوجۆرانەیە، کە بەپێی ژینگەو بارودۆخەکان، دەگۆڕێن‌و جۆراوجۆرن‌و، ناشگونجێ بگێردرێنەوە بۆ هۆکارێك، یان چەند هۆکارێکی دیارییکراو.

بەڵام بەڕای من دەگونجێ سەرجەم هۆکارەکانی سەرهەڵدانی پەڕگیریی‌و توندوتیژیی‌و تێپەڕاندن لەنێو مسوڵمانان دا، بگێڕینەوە بۆ حەوت هۆکاری سەرەکیی:

١- ستەم‌و دەستدرێژیی زلهێزان بۆسەر مسوڵمانان.

٢- توندوتیژیی‌و ستەمی ڕژێمەکان بەرانبەر بەخەڵك‌و، پێشێلکردنی ماف‌و ئازادییەکانیان.

٣- لادان‌ودوورکەوتنەوەی کۆمەڵگایەکان لەئیسلام‌و شەریعەتەکەی.

٤- ڕێ نەدان‌و تەنگ پێهەڵچنینی حیزب‌و ڕژێمە سیکۆلاریستەکان، بەتەوژمی ئیسلامیی هاوسەنگ.

٥- لادان‌وکرچ‌وکاڵیی فیکریی، زۆرێك لەگرووپەئیسلامییە جیهادییەکان.

٦- گرفتەکانی ژیان‌و گوزەران.

٧- نەخۆشیی‌و لاریی دەروونیی‌و ڕەفتاریی.

ئنجا ئێمە پێش ئەوەی دەست بکەین بە تیشك خستنەسەر، هەرکام لەو حەوت هۆکارە سەرەکییەی سەرهەڵدانی پەڕگیریی لەواقیعی ئەمڕۆی مسوڵمانان

دا،بەباشی دەزانم زۆربەگوشراویی سەرژمێرێکی سەرجەم ئەو هۆکارانە بکەین، کە مایەی سەرهەڵدانی پەڕگیریین‌و، لەژێرناوونیشانی ئەو حەوت هۆکارە سەرەکییەدا کۆ دەبنەوە، کە دەوری پەنجا (٥٠) هۆکارن، بەڕای (عبدالرحمن بن معلاّ اللُّويحق) نووسەری کتێبی:(مشكلة الغلوِّ في الدين في العصر الحاضر)[1].

کە ئەو لەژێر سێ ناوونیشانی سەرەکیی دا هێناونی و، ئێمەش بەپێی ڕیزبەندیی وی، بەسەرژمێرکردنیان دا دەچینە خوارێ:

**بەشی یەکەم : هۆکارە زانستیی‌و میتۆدییەکان (الأسباب العلمية والمنهجية):**

## یەکەم: ئەو هۆکارانەی پەیوەندییان بەنەزانینییەوە هەیە (الأسباب المُتعلّقة بالجهل):

١- نەزانیی بەکتێبی خوا (الجهل بالكتاب).

٢- نەزانیی بەسوننەت (الجهل بالسنة).

٣- نەزانیی بەڕێبازی پێشین (الجهل بمنهج السَّلف).

٤- نەزانیی بەئامانجەکانی شەریعەت (الجهل بمقاصد الشريعة).

٥- نەزانیی بەیاساکانی خوا لە ژیانی بەشەردا (الجهل بالسنن الربانية).

٦- نەزانیی بەچییەتی ئیمان‌و پەیوەندیی بەکردەوانەوە (الجهل بحقيقة الإيمان وعلاقته بالأعمال).

٧- نەزانیی بە پێگەکانی حوکمەکان (الجهل بمراتب الأحكام).

٨- نەزانیی بەپێگەکانی خەڵك (الجهل بمراتب الناس).

١) بڕوانە: ج١ ص٧٠-٤٢٩،ج٢ ص٤٣١-٦٥٦.

٩- نەشارەزایی لەزمانی عەرەبیی (الجهل باللغة العربية).

١٠- نەشارەزایی لەمێژوو (الجهل بالتأريخ).

## دووەم: ئەو هۆکارانەی پەیوەندییان بەمیتۆدی زانستییەوە هەیە:

١- پشتکردنە زانایان ( الإعراض عن العلماء).

٢- تەئویلکردنو لادان (التأويل والتحريف).

٣- شوێنکەوتنی دەقە مانا ناڕوونو لێکچووەکان ( إتِّباع المتشابه).

٤- پێکەوە کۆ نەکردنەوەی بەڵگەکان (عدم الجمع بين الأدلَّة).

٥- مامەڵەی ڕاستەوخۆ لەگەڵ دەقداو، لێتێگەیشتنی ڕواڵەتییانە (التعامل المباشر مع النص، والفهم الحرفي له).

٦- ئیجتیهادکردن بەبێ شایستەیی (الإجتهاد من غير أهليَّةٍ).

٧- زێدەڕۆیی کردن لە گرنگییداندا، بەو فەرموودانەی باسی ئاژاوەکانی پێش تێکچوونی دنیا دەکەن (الإغراق في الإهتمام بأحاديث الفتن).

٨- پشت بەستن بەخەونو زرەخەونەکان (الإعتماد على الرؤى والأحلام).

## سێیەم: ئەو هۆکارانەی کە پەیوەندییان بە ڕێبازی کردەوەییەوە هەیە:

١- پەلەکردن (الإستعجال).

٢- دەمارگیریی (التعصّب).

٣- ڕەچاونەکردنی هەلو مەرجی خەڵكو عوزرەکانیان(عَدَم تقدير ظروف الناس وأعذارهم).

## بەشی دووەم : هۆکارە دەروونیی و پەروەردەییەکان (الأسباب النفسية والتربوية ):

### یەکەم: هۆکارە دەروونییەکان:

١- نەبوونی ئۆخژنو تەبایی (إفتقاد التوافق).

٢- تێرنەبوونی مرۆڤ لە پێداویستییە دەروونیی و جەستەییەکان( عدم إشباع الحاجات الإنسانية).

٣- شێوانە دەروونیی و ئاکارییەکان (الإضطرابات النفسية والسلوكية).

٤- هەڵچوونە شێواوەکان (الإضطرابات الإنفعالية).

٥-سروشتی کەسایەتیی ئاراستەکەر یان قیادەکەر(طبيعةالشخصية الموجِّهة أو القائدة).

### دووەم: هۆکارە پەروەردەییەکان:

١- کەم خۆڕاگریی (ضعف الصَّبْر).

٢- نائومێدیی ( اليأس).

٣- سروشتی گەنجێتیی ( طبيعة الشباب).

٤- شوێنکەوتنی ئارەزوو (إتباع الهوى).

٥- شەڕە قسەکردن (الجِدال).

٦- نارێکیی بەرنامەکانی فێرکردن (إختلال مناهج التعليم).

## بەشی سێیەم :هۆکارە کۆمەلأیەتییو جیهانییەکان (الأسباب الإِجتماعية والعالمية):

### یەکەم: هۆکارە کۆمەڵایەتییەکان:

١- نەبوونی بەرنامەی خوا لە حوکمڕانیی دا، لەزۆربەی وڵاتانی مسوڵمانان دا ( غياب شرع الله عن الحكم في كثير من بلاد المسلمين).

٢- تێکچوونی عەقیدەیی (الفساد العَقَديُّ).

٣- وازلێهێنانی فەرمان بەچاکەو ڕێگریی لە خراپە (تركَ الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر).

٤- تێکچوونی پەیوەندیی نێوان حوکمڕانو خەڵك (إختلال العلاقة بين الحاكم والمحكوم).

٥- تۆمەتبارکردنو گاڵتەپێکردنی ئیسلام (الإتهام والهُزْء).

٦- توندوتیژییو ئەشکەنجەدان (العُنْف والتعذيب)

٧- داڕووخانی ڕەوشت ( الإنحلالُ الخُلُقيُّ).

٨- تێکچوونی بارودۆخی ئابووریی( إختلال الأوضاع الإقتصادية).

٩- دیارنەبوونی ڕۆڵی زانایان (غياب دور العلماء).

١٠- گرفتی ونبوونی ناسنامەی ئۆممەت (مشكلة غياب هوية الأمة).

١١- بلأوبوونەوەی سیکۆلاریزم لەزۆرێك لەکۆمەڵگا مسوڵمانەکاندا (إنتشار العلمانية في كثير من المجتمعات المسلمة).

١٢- خراپیی زۆرێك لە هۆکارەکانی ئاڕاستەکردنو کارتێکردن (فساد كثير من وسائل التوجيه والتأثير).

١٣- نەبوونی ڕاوێژ (غياب الشورى).

١٤- کێشەی کەمایەتییە ئایینییەکان ( المشكلة الطائفية).

١٥-شکستەسیاسیی‌وسەربازییەکان(الهزائم السياسية والعسكرية).

## دووەم: هۆکارە جیهانییەکان:

١- پیلانگێڕانی جیهانیی لەدژی ئایینی ئیسلام (التآمر على الدين الإِسلامي عالمياً).

٢- کەوتنی دەوڵەتی عوسمانیی (خەلیفایەتیی)(سقوط الدولة العثمانية ((الخلافة)).



# حەوت هۆکارە سەرەکییەکەی پەڕگیریی

ئێستاش پاش سەرژمێری وردی هۆکارەکانی پەڕگیریی لەواقیعی ئەمڕۆی مسوڵمانانداا، باسەرو تیشك بخەینەسەر ئەو حەوت هۆکارە سەرەکییەی، کە وەك پێشتر گوتمان: کۆکەرەوەی سەرجەم هۆکارەکانن:

## ١- ستەمو دەستدرێژیی زلهێزان بۆسەر مسوڵمانان:

وەك گوتراوە:(الضغط يُولِّد الإنفجار)فشار تەقینەوە پەیدادەکات، ئەو ستەمە زۆرو جۆراوجۆرەی کە لەم رۆژگارە دا، لەلایەن ئەهلی کوفرەوە بەگشتیو زلهێزانەوە بەتایبەت، دەکرێتە سەر مسوڵمانان، چ لەوڵاتانی ئیسلامیی داو چ لەوڵاتانی دیکەدا، کە مسوڵمانان تێیاندا کەمینەن، گەورەترین کاریگەریی هەیە، لەسەر سەرهەڵدانی توندوتیژییو پەڕگیریی ژمارەیەك لە مسوڵمانان، بەتایبەت چینی گەنج، کە پشکی زۆری لە دڵ گەرمییو حەماسەتدا هەیە. دیارە ئەو ستەمو دەستدرێژییەش لەزۆر شێوەدا بەرجەستەیە، وەك:

١- کوشتنو برینو سووتاندنو دەرکردن، بۆ نموونە: کوردستان، فەلەستین، بۆرما، شیشان، بۆسنە، کۆسۆفۆ، خوارووی ئەفریقیا.

٢- خێروبێر بەتاڵان بردنو دەست بەسەرداگرتن، بۆ نموونە: نەوتی کەنداو!

٣- داگیرکردنو خستنەژێر کۆنتڕۆڵی خۆ، بەبیانووی جۆراوجۆر: ئەفغانستانو عیراق بەنموونە.

٤- گوشار خستنەسەر بۆ گۆڕینی بەرنامەی خوێندنو، سەرەنجام گۆڕینی ئایینو عەقیدەو کلتوور.

٥- پشتگیریی کردنی ڕەها لە قەوارەی زایۆنیی، لەدژی گەلی فەلەستین.

٦- دژایەتیی کردنی تەوژمی ئیسلامیی هاوسەنگو، لەبەرانبەردا پشتگرتنی ڕژێمە دیکتاتۆرو میلیتاریستەکان: جەزائیرو فەلەستین و میصر، بەنموونە.

٧- سووکایەتییو بێڕێزیی کردن بەئیسلامو قورئانو پێغەمبەری خاتەم (محمد) (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ)، لەڕێی کەناڵەکانی ڕاگەیاندنەوە، بۆنموونە: سووتێنرانی قورئان، لەلایەن قەشە (جۆنز)ەوە، لە ئەمەریکا.

## ٢- توندوتیژیی و ستەمی ڕژێمەکان بەرانبەر بەخەڵك و، پێشێلکردنی ماف و ئازادییەکان:

هۆکارێکی دیکەی کاریگەری سەرهەڵدان و تەشەنەکردنی دیاردەی پەرگیریی و توندوتیژیی لەنێو مسوڵمانان دا، بریتیە لەو هەموو توندوتیژیی و ستەمەی کە ڕژێمەکان بەرانبەر بەخەڵك و کۆمەڵگاکانیان دەیکەن، لەپێشێلکردنی ماف و ئازادییەکانیان و، حیساب بۆنەکردن و نادیدە گرتنیان لە بەڕێوەبردنی وڵاتدا، پێچەوانەی ئەوە کە خوا فەرموویەتی، بۆشێوازی بەڕێوەبردنی کاروباری کۆمەڵگاو وڵات، کە دەبێ بەراوێژکردن بێ: (...وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ...﴿٣٨﴾) الشوری، هەروەها هەر حوکمڕانێك ڕاوێژ بەخەڵك و جەماوەر و دەوروبەری نەکات و، تەنیا بەکەیفی خۆی ڕەفتار بکات، ئەوە پێچەوانەی فەرمانی ڕوون و ڕاشکاوی خوا عزوجل جووڵاوەتەوە، کە فەرموویەتی: (..وَشَاوِرْهُمْ فِي الْأَمْرِ...﴿١٥٩﴾) آل عمران.

ئنجا لەڕاستییدا کاتی خۆی -لەحەفتایەکاندا- گرووپی (التکفیر والهجرة) لەزیندانە تاریکەکان و لەژێر گوشاری ئازاروئەشکەنجەی هەمەجۆری ڕژێمی دیکتاتۆریی میسردا هاتەدی و، لەهەناوی توندوتیژیی و پەرگیریی عەلمانیی و دژی ئیسلامییدا، پەرگیریی ئیسلامیی، وەك کاردانەوە (ردُّ الفعل) لەدایك بوو.

کە دیارە گرووپی (التکفیر والهجرة) -بە کافردانان و کۆچکردن- لە توندوتیژییدا یەکەمین ئاڵقەی زنجیرەی پەرگیریی (سلسلة الغلوّ) بوون، لەساڵەکانی حەفتایەکاندا.

هەروەها توندوتیژییو پەرگیریی لەرادەبەدەری رژێمەکەی (بشار الأسد) لەسووریاو، خۆسەپێنییو تائیفە گەریی رژێمەکەی (نوری المالکی)یش لەعێراق، کاریگەریی زۆریان هەبووو بگرە هۆکاری سەرەکیی سەرهەڵدانی گرووپی (داعش)بوون، لەو دوو وڵاتەدا، کە هەرچەندە بەناوی:
رێکخراوی دەوڵەتی ئیسلامیی (تنظیم الدولة الإسلامية)وەن، بەڵام زیانمەندی گەورە بەدەستیان، ئیسلامو مسوڵمانان بەگشتیو، بەتایبەتی خەڵکی سوننەو تەوژمی ئیسلامییە!
هەڵبەتە من لێرەدا نامەوێ پاساو (مُبَرِّر) بۆ سەرهەڵدانی گرووپە پەرگیرەکان بهێنمەوە، بەڵام دەمەوێ هۆکارو چۆنیەتی دروستبوونو سەرهەڵدانی پەرگیریی بخەمە روو، کە هەرچەندە پەرگیریی بەناوی ئیسلامەوە، لە هەموو کاتێکدا هەرنارەواو تاوانە، بەڵام دەبێ بشزانرێ کە پەرگیریی سیکۆلاریزمی بەرجەستە لەحیزبو رژێمە خۆسەپێنو دیکتاتۆرەکان دا، تاوانبارو هۆکاری یەکەمی بەرپرسیارە، بەرانبەر سەرهەڵدانو تەشەنەکردنی پەرگیریی ئیسلامیی و، لەهەناوی وی هاتۆتە دەرێو، رۆنی خۆیەتی لەسەری دەدرێتەوەو، شەروخراپەی خۆیەتی یەخەی دەگرێتەوە!!
ئاخر چۆن خەڵکی مسوڵمانی وڵاتێکی وەك میسر: تووشی بێ هیوایی (إحباط)و هەستکردن بەبنبەست گەیشتن، ناکەن، لە کاتێکدا دەبینن (محمد مُرسي) هەڵبژێرراو لە پرۆسەی دەنگداندا، لەلایەن (عبدالفتاح السيسي)یەوە کودەتای سەربازیی لێدەکرێو، سەرەنجام خۆیو سەرۆکی حیزبەکەیو، زۆربەی قیادەو کادیرەکانی بەرجەستەی حیزبەکەی، بەبریاری دادگایەکی ئیرادە زەوتکراو، سجن دەکرێنو، بای کودەتاچییو هاوکارەکانیشی، بەناهەق دەچنە سەرکورسی حوکم؟!!

## ٣- لادانو دوورکەوتنەوەی کۆمەڵگایەکان لەئیسلامو شەریعەتەکەی:

هۆکارو فاکتەرێکی دیکەی کاریگەری سەرهەڵدانی توندڕەوییو پەرگیریی (التشدّد والتطرّف) لەنێو مسوڵمانان دا، بریتییە لەلادانی کۆمەڵگایەکانی مسوڵمانان لە شەریعەتو، دوورکەوتنەوەیان لە ئەدەبو بەهاو ڕێساکانی ئیسلام، لەبوارەکانی حوکمو سیاسەتو ئابوورییو ڕەوشتو ئاکارو... هتددا.

چونکە مسوڵمانان –ئەگەر هەر تۆزێك هۆشیارو بێداربن- کاتێك بارودۆخی نالەبارو ناشەرعییانەی خۆیان دەبینن، ڕژێمە سیکۆلاریستەکانیان دەبینن، کە چۆن وەك فیل مەحموود تەنیا ڕوو لە کەعبە ناکەنو، ڕوو لەهەموو ڕووگە (قبلة)یەکی ڕۆژهەلاتییو ڕۆژئاوایی دیکە دەکەن! لەبەرانبەر ئیسلامو شەریعەتە پشتگوێ خراوەکەی دا، هەست بەبەرپرسارێتیی دەکەنو، دەکەونە بیرو خولیای گۆڕینو پاکسازییو چاکسازیی تێداکردنی واقیعی کۆمەڵگاکانیانو، سەرەنجام هەندێکیان لەئەنجامی سەرکێڵییو کرچو کاڵیی خۆیانو، لەژێر کاریگەرییو لە کاردانەوەی واقیعە نەخوازراوە جیهانییو ناوچەیی یەکەدا، گیرۆدەی بیرۆکەی تێپەڕاندن و پەرگیریی دەبنو، کەمو زۆریش هەوڵدەدەن ئەوەی لێیان بۆتە قەناعەتو خولیا، مومارەسەی بکەن!

## ٤- ڕێ نەدانو تەنگ پێ هەڵچنینی حیزبو ڕژێمە سیکۆلاریستەکان، بەتەوژمی ئیسلامیی هاوسەنگ:

بەڵێ هۆکارێکی دیکەی گرنگو کاریگەری سەرهەڵدانو پەرەستاندنی توندوتیژییو تێپەڕاندن (العُنْف والغلُوّ) لەنێو مسوڵمانان دا، ئەوەیە کە حیزبو ڕژێمە سیکۆلاریستەکان، وێڕای ئەوەی کە بەگشتی مافو ئازادییەکانی کۆمەڵگا پێشێل دەکەنو، بەئاگرو ئاسن خۆیان بەسەردا دەسەپێننو حوکمڕانییان دەکەن، بەتایبەتیش دژایەتیی تەوژمی ئیسلامیی هاوسەنگ (التیار الإسلامي المتَّزن) دەکەنو، بەهەموو شێوەیەك ڕێگریی لێ دەکەنو، تەنگی پێ هەڵدەچننو، ئەگەر لەبواری بانگەوازو هۆشیارکردنەوەی خەڵك دا، لەگەشەکردنو بەرەوپێشچوون دابن، زیندانیان دەکەن و، هەرکاتێکیش لەهەڵبژاردنەکان (إنتخابات)دا لێیان بردنەوە — واتە: لەعەلمانییەکان- ئەوە لەجیاتی ئەوەی وەك دیموکڕاسییو، پێش ئەوەش شەریعەتی ئیسلامو، بگرە عەقڵو مەنتیق دەڵێن: لێیان گەڕێن حوکمڕانیی بکەنو وڵاتەکەیان بەڕێوە ببەن، کودەتایان بەسەردا دەکەنو، هەرچی لەدەستیان بێ، پێیان دەکەن!!

دیارە مەبەستیشمان لە تەوژمی ئیسلامیی هاوسەنگ، سەرجەم ئەو ڕێکخراوو لایەنە ئیسلامییانەیە، کە بڕوایان بەتەبایيو پێکەوە ژیان هەیەو، دەیانەوێ لەڕێی قەناعەت پێهێنانی خەڵكو هۆشیارکردنەوەو بێدارکردنەوەیەوە، گۆڕانکاریيو پاکسازیيو چاکسازیی بکەن، کە لەڕاستیی دا هەر ئەوەش ڕێبازی سەرجەم پێغەمبەرانی خوا بووە، لەئادەمەوە هەتا

خاتەم (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ)، وەك لە سیرەی ژیانیان دا -كە قورئان بۆی گێڕاوینەوە- دیارە.

پێغەمبەری پێشەواشمان لەوبارەوە فەرموویەتی:

١- (**المؤمن مَألَفَةٌ ولا خير فيمن لا يألِف لا يُؤلَفُ**) رواه أحمد (٣٣٥/٥) والخطيب في (تأريخ بغداد) (٣٧٦/١١ ) وصحَّحَهُ الألباني في (السلسلة الصحيحة) ج١ص٧١١.

واتە: بڕوادار گونجاوو تەبایەو، هەركەسێك خەڵك هۆگری خۆی نەكاتو، هۆگری خەڵك نەبێ، خێری پێوەنیە.

٢-(**المسلم، إذا كان مخالطاً للناس ويَصْبِرُ على أذاهم، خيرٌ من المسلم الذي لا يُخالط الناس ولا يَصْبِرُ على أذاهم**) رواه الترمذي:٢٥٠٧ وأحمد (٢٣٤/٢) والبخاري في (الأدب المفرد): ٣٨٨، وقال الحافظ: إسناده حسن.

واتە: مسوڵمانێك كە تێكەڵی خەڵك بێو، لەسەر ئازارەكانیان خۆڕاگربێ، لەمسوڵمانێك باشترە، كە تێكەڵی خەڵك نابێو، لەسەر ئازاردانەكانیشیان خۆڕاناگرێ.

ئاشكراشە لەحاڵێك دا كە خەڵك -بەتایبەتی چینی گەنجو لاو- دەستی لەزانیاریيو شارەزایی ڕاستو دروستو هاوسەنگ، لەبارەی ئیسلامەوە، گیرنابێ، وەك بابایەكی تینوو كە ئاوی پاكو سازگاری چنگ ناكەوێ، بەناچاریی تێنوێتیی خۆی، بەئاوی لیڵو پیسو گەرم دەشكێنێ!

ئنجا لێرەدا ڕەنگە كەسانێك باسی هەندێك لە دامەزراوەو دامودەزگا ئايينيە فەرمییەكانی وەك: ئەزهەرو، یەكیەتی زانایانو، لیژنەی فەتواو وەزارەتی ئەوقافو ... هتد بكەن، بەلاّم دەڵێین:

بەداخەوە حیزبو ڕژێمە عەلمانییە خۆسەپێنو گشتگیر (شمولي)ەکان، ئەو دامەزراوەو دامو دەزگایانەیان –یان زۆربەیان- لە نێوەڕۆکی خۆیان خاڵی کردوونەوەو، لەبەرچاوی خەڵكو جەماوەر بەگشتیو بەتایبەت چینی گەنجو خوێندەوارو شارەزا، بێزراندوویانو، وایان لێکردوون کە متمانەیان پێنەکەن! بۆیە لەکاتێك دا ڕێ لەتەوژمی ئیسلامیی هاوسەنگی بەرجەستە لە حیزبو ڕێکخراوە ئیسلامییەکان دا، دەگیرێ، کە کاری خۆی بکات، مەرجیعێکی دیکەی جێی متمانە نامێنێ، کە ئیسلامی لێوە فێربنو وەربگرنو، سەرەنجام مەیدان بۆ پەڕگیران چۆڵ دەبێ!

## ٥- لادانو کرچوکاڵیی فیکریی، زۆرێك لەگرووپە ئیسلامییە جیهادییەکان:

ئەمیش هۆکارێکی دیکەی کاریگەری سەرهەڵدانی دیاردەی پەرگیرییە لەنێو مسوڵمانانداو، پێشتریش باسمان کرد، کە پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) یەکەمین گرووپی پەرگیرو یاخی –کە (خوارج)ن- بەوە پێناسە کردوە، کە قورئان دەخوێنن، بەلاّم لە گەروویان ئەودیو نابێ: (.. **يقرؤون القرآن لايجاوزُ حَناجرهم..**) رواه البخاري: ٧٤٣٢ ومسلم: ٤٤٨.

کەوا پێدەچێ مەبەست لەو تەعبیرە (لايجاوزُ حَناجرهم) رواڵەت بینییو حاڵی نەبوونیان بێو، دەشگونجێ مەبەست پێی: تامو چێژ لێ وەرنەگرتنیان بێ، یان هەردووکیان بێ، وێکڕا.

ئنجا هەرکام لەو مانایانە مەبەست بێ، بێگومان ئەو حاڵەتە خاڵی هاوبەشی نێوان سەرجەم پەرگیرانو تێپەڕێنەرانە، چ ڕابردووانیانو چ هاوچەرخانیان.

هەروەها ئەوە کە زۆرێك لە گرووپورێکخراوە ئیسلامییە جیهادییەکان، لەشەریعەت لایان داوەو،لەڕووی فیکرییو ڕاستو دروست تێگەیشتنی ئیسلامەوە، سەرکێڵو کرچوکاڵن، بەسەرنجدانی قسەو بیروڕایەکانیانو، ڕەفتارو هەڵوێستەکانیانو، بەرهەمو پەرێزیان، زۆر ڕوونو ئاشکرایە.

شایانی باسیشە ئەو لادانو کرچو کاڵن فیکرییەی، بەشێك لە ڕێکخراوە ئیسلامییە جیهادییەکان، لەچەند بوارێك دا بەرجەستە بووەو زەق بۆتەوە، بۆ وێنە:

١- جەنگو جیهاد.

٢- فەرمان بەچاکەو ڕێگریی لەخراپە.

٣- مامەڵەکردن لەگەڵ نامسوڵمانان،لەکاتی ئاشتیی‌و لەکاتی جەنگ دا.

٤- گۆڕین‌و پاکسازیی‌و چاکسازیی تێداکردنی کۆمەڵگا.

٥- بنیاتنانی قەوارەی سیاسیی.

٦- جێبەجێکردنی شەریعەت.

٧- چەسپاندنی سزا شەرعییەکان.

٨- مامەڵەکردن لە گەڵ ڕژێمە خۆسەپێن‌و حوکمڕانە ستەمکارو لادەرەکاندا.

٩- بەرەنگاربوونەوەی زلهێزان‌و، کۆتایی پێهێنانی ستەم‌و دەستدرێژییان.

ئنجا لەسۆنگەی ئەوەوە کە ئێمە خوا پشتیوان بێ لە هەردووك:

بەشی دووەم: {**نابێ هەڵەو لادانی پەرگیران بەرانبەر بە ئیسلام بمانخاتە دوو دڵیی‌و گومان**}و، بەشی سێیەم: {**هەڵوەشاندنەوەی بیروڕاو ڕەفتارەکانی ڕێکخراوی داعش**}دا، تیشك دەخەینە سەر زۆربەی هەرەزۆری ئەو بابەتانە، لێرەدا بەپێویستی نازانین باسیان بکەین، بەڵام بە کورتیی دەڵێین:

هەر کەسێك بیەوێ لەم ڕۆژگارە دا، واقیعی سیاسی خراپی کۆمەڵگایەك بگۆڕێ، پێویستە خاوەنی هێزو دەسەڵات بێ، چونکە ئەگەر خاوەن هێزو دەسەڵات نەبێ، نە لەڕووی شەرعییەوە لەسەری پێویستەو، نەوەك واقیعیش بۆی دەکرێ، هەربۆیە پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فەرموویەتی:

(**من رأى منكم منكراً فَلْيُغَيّرهُ بيده..**) رواه مسلم: ١٧٦ والترمذي: ٢١٧٣ وأبوداود: ٤٣٤٠ والنسائي (١١١/٨) وابن ماجه: ٤٠١٣.

واتە:هەرکامێکتان خراپەیەکی دی، با بەدەستی (بەهێزی) بیگۆڕێ..

دیارە هێزیش لەم ڕۆژگارەدا، لەسێ دامەزراوە دا بەرجەستەیە:

١- هێزی خەڵك‌و جەماوەر.

٢- هێزی نوێنەرانی خەڵك (پەرلەمان).

٣- هێزی سەربازیی.

ئنجا لەسۆنگەی ئەوەوە كە ئیسلام بڕوای بەكودەتا (إنقلاب)ی سەربازیی نیە، كەواتە: خەڵكێكی ئیسلامیی كە دەیەوێ، واقیعی سیاسی كۆمەڵگایەكەی بگۆڕێ، یان دەبێ زۆربەی خەڵك‌و جەماوەری لەپشت بێ، یان زۆرینەی نوێنەرانی خەڵك، ئەگەرنا خەیاڵپلاو دەكات‌و، ئەگەر گریمان بتوانێ گۆڕانكارییش بكات، مادام بەیەكێك لەو دوو شێوازەی ڕابردووو، لەڕێی ئیرادەی ئازادانەی خەڵك‌و جەماوەرەوە نەبێ، بێ بەرهەم دەبێ‌و، بنەتۆوی خۆی ناكاتەوەو، سەربارەش ئیسلام‌و مسوڵمانان لەسەری قەرزدار دەبنەوە!

## ٦- گیروگرفتەکانی ژیان‌و گوزەران ( مشكلات الحياة والمعيشة):

هۆکارێکی دیکەی گرنگی سەرهەڵدانی پەڕگیریی‌و، پەیوەستبوون بە گرووپە توندوتیژو پەڕگیرەکانەوە، -بەتایبەت چینی گەنج- بریتیە لەگرفتاریی بەشێکیان، لەڕووی ژیان‌و گوزەران‌و دابینکردنی پێداویستییەکانەوە.

ئنجا دیارە هەندێك لە گەنجەکان، لەئەنجامی بێ هیوایی‌و گەیشتنە بنبەست دا، کە بتوانێ پێداویستییە بنەڕەتییەکانی دابین بکات، بەتایبەت:

١- خواردن‌و خواردنەوە.

٢- بەرگ‌و پۆشاك.

٣- جێگاو ڕێگای حەوانەوەو خەوتن‌و حەسانەوە.

٤- هاوسەرگیریی.

وەك هەوڵێك بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییانەو، جێبەجێکردنی ئەو پێداویستییانەو، هەندێکیشیان وەك تۆڵەستاندنەوەو، ڕقی خۆڕشتن بەو کۆمەڵگایە، کە تێدا بێبەش‌و ژینتاڵ کراوە، پەنا بۆ گرووپە پەڕگیرەکان دەبەن.

بەڵام هەڵبەتە ڕاست نیە کە ئەم هۆکارە -وەك هەندێك لە عەلمانییەکان‌و غەیری وانیش گوتوویانە- بکرێتە تاکە هۆکاری سەرهەڵدانی توندوتیژیی‌و پەڕگیریی، یان لەقەبارەی خۆی گەورەتر بکرێ، چونکە بێگومان مرۆڤ -مسوڵمان‌و نامسوڵمان- زۆرلەوە ئاڵۆزترە، کە بیروڕاو ڕەفتارەکانی بەسادەیی تەفسیربکرێن، وەك کاتی خۆی (مارکس) ویستبووی، کەتەنیا بەهۆکاری ئابووریی‌و گەدەو گیرفان‌و، (فرۆید)یش ویستبووی کە تەنیا بە سێکس‌و داوێن، تەفسیری مێژووی بەشەربکەن!

کەواتە:

واقیعی نادادگەرانەی پڕجەورو ستەمی: ئابووریی‌و سیاسیی‌و كۆمەڵایەتیی، كۆمەڵگایەكانیش بەرپرسیارە لە بەرانبەر سەرهەڵدان‌و تەشەنەكردنی دیاردەی پەڕگیریی‌و توندوتیژییدا، دابین نەكردنی ژیان‌و گوزەرانێكی پڕ ڕێزو حورمەت‌و شایستەی مرۆڤی ڕێزلێگیراو لەلایەن خواوە، وەك فەرموویەتی:

﴿ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ ... ﴿٧٠﴾ ﴾ الإسراء، هۆكارێكی دیكەی پەیدابونی دیاردەی ناوبراوە، هەربۆیەش پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) نیشانەیەكی پرسیاری گەورەی خستۆتەسەر ئیمانی كۆمەڵگایەك، كە لەبابایەكی برسییەوە ڕادەمێنن‌و، هاوكاریی ناكەن، وەك فەرموویەتی:

١- **(أَيُّمَا أَهْلُ عَرْصَةٍ أَصْبَحَ فِيهِمْ امْرُؤٌ جَائِعٌ ، فَقَدْ بَرِئَتْ مِنْهُمْ ذِمَّةُ اللَّهِ وَرَسولِهِ)** رواه أحمد (٣٣/٢).

واتە: خەڵكی هەر شوێنێك بابایەكی برسیی ڕۆژیان لەنێودا بكاتەوە، خواو پێغەمبەرەكەی لێیان بەریین.

٢- **(ما آمن بي من بات شبعان، وجاره جائِعٌ إلى جنبه، وهو يعلم به)**

رواه البخاري في الأدب المفرد، ص٣٩ ، والطبراني والحاكم والبيهقي في شعب الإيمان.

واتە:ئەو كەسە بڕوای بەمن نەهێناوە، كە دراوسێیەكەی لە تەنیشتیەوە برسییەو، دەشزانێ.

## ٧- نەخۆشییو لاریی دەروونییو ڕەفتاریی (المرض والإعوجاج النفسي والسلوكي):

مرۆڤ وەك چۆن جەستەی نەخۆش دەبێو، میزاجی تێك دەچێ، ڕووحو دەروونیشی نەخۆش دەبێو، دووچاری لارییو لاسەنگیی ڕەفتارو ئاكار دەبێ. ئنجا یەكی دیكە لەهۆكارەكانی پەرگیرییو تێپەڕاندن (الغلوّ والتطرف) بریتیە لەو حاڵەتەی نەخۆشكەوتنی دەروونو، لارو لاسەنگ بوونی ئاكارو هەڵسوكەوت.

شایانی باسیشە كاتی خۆی هەندێك لەهاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ، بەو حاڵەتەوە گرفتار بوون، بەڵام پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّم) ئامۆژگاریی كردوونو ڕاستیكردوونەوەو، هێناونیەوە سەر ڕاستە ڕێ.

با تەماشای ئەو پێنج دەقەی سوننەت بكەین لەوبارەوە:

**١- (عن عبدالله بن عباس رضى الله عنهما أن رجلاً أتى النّبيَّ صلى الله عليه وسلم فقال: يا رسول الله! إني اذا أصبْتُ اللّحم انتشرت للنساء وأخذتني شهوتي، فحرّمْتُ عليَّ اللّحم، فأنزل الله:** (يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُحَرِّمُواْ طَيِّبَٰتِ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكُمۡ وَلَا تَعۡتَدُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ﴿٨٧﴾) المائدة، أخرجه الترمذي: ٣٠٥٤ والطبراني في المعجم الكبير: ١١٩٨١ والطبري في جامع البيان (٩/٧) وابن أبي حاتم في التفسير: ٦٦٨٧ وقال مؤلّفا: (الإستيعاب في بيان الأسباب): صحيح لغيره، [١]

واتە: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّم) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! من هەركات گۆشتم خوارد، ئارەزووم دەجووڵێو مەیلی ئافرەتان دەكەم،

---

١) ج٢ص٩١.

بۆیە گۆشتم لەخۆم قەدەغە کردوە! خواش ئەم ئایەتەی نارده خوار: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ئەو ڕۆزییە خۆشانەی خوا بۆی حەلاڵ کردوون، لەخۆتانیان قەدەغە مەکەن، سنوورشکێنیی مەکەن، بێگومان خوا سنوورشکێنانی خۆشناوێن.

٢- **(عن عبدالله بن عباس رضي الله عنهما قوله تعالى: (يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُحَرِّمُواْ طَيِّبَٰتِ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكُمْ ..) قال: هم رهط من أصحاب النبيِّ صلى الله عليه وسلم قالوا: نقطع مذاكيرنا ، ونترك شهوات الدنيا، ونسيح في الأرض، كما يفعل الرّهْبان، فبلغ ذلك النبيَّ صلى الله عليه وسلم، فأرسل إليهم، فذكر لهم، فقالوا: نعم، فقال النبيُّ صلى الله عليه وسلم: لكني أصوم وأُفطر، وأصلي وأنام، وأنكح النساء، فمن أخذ بسنتي فهو منِّي، ومن لم يأخذ بسنتي، فليس منِّي)** أخرجه الطبري في جامع البيان (٨/٧) و ابن أبي حاتم في تفسيره: ٦٦٨٩، وقال مؤلِّفا: (الإستيعاب في بيان الأسباب): قُلْنا: وهذا سندٌ حسن.[١]

واتە: ئەوانەی کە فەرمایشتی خوا: (يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُحَرِّمُواْ طَيِّبَٰتِ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكُمْ ..) یان لەبارەوە هاتە خوارێ، کۆمەڵێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) بوون، گوتیان: چووکەکانمان دەبڕین و، واز لەئارەزووەکانی دنیا دێنین و، وەك ڕاهیبەکان بەزەویدا دەڕۆین و دەگەڕێین، ئنجا ئەوە بە پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) گەیشتەوەو، ئەویش لەدوای ناردن و بۆی باسکردن، گوتیان: بەڵێ (وامانگوتوە) پێغەمبەریش فەرمووی: بەلاَم من ڕۆژوو -(ی سوننەت) دەگرم و ناشیگرم و، شەونوێژ دەکەم و دەشخەوم و،

١) ج٢ ص٩٣.

ژنانیش دێنم، ئنجا هەرکەس ڕێبازی من بگرێ، ئەوە لەمنەو، هەرکەس ڕێبازی من نەگرێ، لەمن نیە.

٣- (**عن أنس رضي الله عنه قال: دخل النبيُّ صلى الله عليه وسلم المسجد، فإذا حَبْلٌ ممدود بين الساريتين، فقال: (ما هذا الحبل؟) قالوا: هذا حبل لزينب، فإذا فَتَرت تَعلَّقَتْ به، فقال النبيُّ صلى الله عليه وسلم: (حلُّوه ليصلِّ أحدكم نشاطَه، فإذا فَتَر، فليرقُدْ)** رواه البخاري: ١١٥٠ومسلم: ٧٨٤.

واتە: پێغەمبەر (صَلّی اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) چووە مزگەوت، بینی پەتێك بەنێوان دوو كۆڵەگەكان دا ڕاهێڵراوە، فەرمووی: ئەم پەتە چییە؟ گوتیان: ئەوە پەتی زەینەبە (هاوسەری پێغەمبەری خوا، خوا لێی ڕازی بێ) هەركات لەنوێژكردن دا ماندوو بوو، خۆی پێدەگرێ، پێغەمبەر (صَلّی اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فەرمووی: بیكەنەوە، با هەركامێكتان لەكاتی توانینی دا نوێژ بكات و، هەركات ماندوو بوو، با بخەوێ.

٤- (**عن ابن عباس رضي الله عنهما قال: بَيْنَما النبيُّ صلى الله عليه وسلم يَخْطُبُ إذا هو برجل قائم، فسأل عنه، فقالوا: أبو إسرائيل نذر أن يقوم في الشمس، ولا يستظِلَّ، ولا يتكلم، ويصوم، فقال النبيُّ صلى الله عليه وسلم: مروه فليتكلم، وليستظل، وليقعد، وليتم صومه)** رواه البخاري ٦٧٠٤.

واتە: لەكاتێكدا پێغەمبەر (صَلّی اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) وتاری دەدا، پیاوێكی بینی لەبەر خۆر وەستابوو، لەبارەیەوە پرسی؟ گوتیان: ئەوە ئەبو ئیسرائیلە، لەخۆی گرتوە (نەزری كردوە) كە لەبەر خۆر بوەستێ و، نەچێتە سێبەرو، قسەش نەكات و، بەڕۆژووش بێ، پێغەمبەریش (صَلّی اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فەرمووی: پێی بڵێن: با قسە بكات و، بچێتە بن سێبەرو، دابنیشێ و، با ڕۆژووەكەی تەواو

بکات.

٥- **(عن عبدالله بن عمرو بن العاص رضي الله عنهما قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: ألم أُخبر أنك تصوم النهار وتقوم الليل؟ فقلت: بلى يا رسول الله، قال: فلا تفعلْ، صُمْ وأفطر، ونَمْ وقُمْ، فإن لجسدك عليك حقاً، وإن لعينك عليك حقاً، وإن لزوجك عليك حقاً، وإن لزورك عليك حقاً، وإن بحسبك أن تصوم في كل شهر ثلاثة أيام، فإن لك بكل حسنة عشر أمثالها، فإن ذلك صيام الدهر، فشدَّدت فَشُدِّد عليَّ، قلت: يا رسول الله إِنّي أَجِدُ قوةً، قال: صُم صيام نَبي الله داود، ولا تَزِدْ عليه، قلت: وما كان صيام داود؟ قال: نصف الدهر، فكان عبد الله يقول بعد ما كَبُرَ: يا ليتني قَبِلْتُ رخصة رسول الله صلى الله عليه وسلم)** رواه البخاري ١٩٧٥.

**واتە:** پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) بە عەبداللە بن عەمرو بن العاص)ی فەرموو: ڕاستە هەواڵم پێدراوە کە ڕۆژگار هەر بەڕۆژوویو شەوگار هەمووی شەونوێژ دەکەی؟ گوتم: با، وایە ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: وامەکە، ڕۆژووش بگرەو مەشگرە –واتە: هی سوننەتو- بخەوەو شەونوێژیش بکە، چونکە بێگومان مافی جەستەت لەسەرەو، مافی چاوەکانت لەسەرەو، مافی هاوسەرت لەسەرەو، مافی میوانت لەسەرەو، ئەوەندەت بەسە کە لەهەرمانگێکدا سێ ڕۆژان بەڕۆژوویی، چونکە هەر چاکەیەکت پاداشتی دەقاتەو، ئەوەش وەك ئەوەیە هەموو ساڵەکەت بەڕۆژوویی.

کەچی من سەختگیرییم کردو سەرەنجام لەسەرم قورس بوو، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! توانای زیاتر لەخۆم دا شك دەبەم، فەرمووی: وەك ڕۆژووگرتنی پێغەمبەری خوا داوود بگرەو، لێی زیاد مەکە، گوتم: ڕۆژووگرتنی داوود چۆن بووە؟ فەرمووی: نیوەی ڕۆژگار بووە (واتە: ڕۆژێك

نارۆژێك)، دوایی عەبدوڵلا کە کەوتە تەمەنەوە دەیگوت: خۆزگە مۆڵەتی پێغەمبەری خوام (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وەرگرتبایە.

بەسەرنجدانی ئەو پێنج دەقەش بۆمان دەردەکەوێ کە حاڵەتی زێدەڕۆیی‌و تێپەڕاندن، لەبواری تاعەت‌و دینداریی داو، پاڵنەری زیاتر خواپەرستن‌و، باشتر لەخوا نیزیك کەوتنەوە، گەلێك جار تووشی مرۆڤی مسوڵمان دەبێ‌و، سەرەنجام گیرۆدەی جۆرێك لە نەخۆشیی دەروونیی‌و لاریی‌و لاسەنگیی ڕەفتارو ئاکاری دەکات‌و، حاڵەتی هاوسەنگیی تێك دەدات‌و، ئەگەر نەیەتەوە سەر ڕاستە ڕێ، هەر لەسەر لاسەنگیی‌و لارییەکەی خۆی بەردەوام بێ، لەئاکام دا سەری بەپەڕگیریی دەگات.

باشترین بەڵگەو نموونەش لەوبارەوە گرووپی (خوارج)ن، کە لەسەرەتادا لەبواری خواپەرستیی‌و تاعەتدا، تێیان پەڕاندو زێدەڕۆیی یان کردو، پاشان سەریان بەوە گەیشت کە غەیری خۆیان بەکافر دابنێن‌و، خوێنیشیان بەحەلاڵ بزانن! وەك پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لەبارەیانەوە فەرموویەتی:

(..**يَحْقِرُ أحدكُم صَلاتَهُ مع صلاتهم، وصيامَهُ مع صيامهم**..) رواه البخاري: ٦٩٣ ومسلم: ٢٤٥٣.

واتە: یەکێکتان نوێژی خۆی، لەچاو نوێژی وان،پێ کەمە،وەڕۆژووگرتنی خۆی،لەچاو ڕۆژووگرتنی وان، پێ کەمە.

ئنجا وەك چەندجاری دیکەش گوتوومانە:

جوانیی‌و ڕەونەقی ئیسلام‌و تێروتەواویی یەکەی، لەهاوسەنگیی (إتِّزان)و ڕاست وەستانەکەی دایەو، بەتێپەڕاندن‌و بەزایەدان (إفراط و تفريط) حاڵەتی لاتەڵ بوون‌و لاسەنگیی (إختلال) شوێنی هاوسەنگیی دەگرێتەوەو، بێگومانیش هەموو زێدەڕۆییەك لەبوارێك یان زیاتری دینداریی دا، لەسەر حیسابی بوارەکانی دیکەیەتی.

خوێنەری سەنگین!

پەرگیریی و تێپەڕاندن گەلێك دەرهاویشتەو شوێنەواری خراپ و زیانبەخشی هەن، لەسەر ئاستی تاك و کۆمەڵ، کە هەوڵدەدەین لەو بیست (٢٠) بڕگەیەی خوارەوەدا، سەروتیشکیان بخەینەسەر:

## ١/ گومڕابوون و لادان لەڕاستەڕێی شەریعەت:

ڕێبازی پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) کە لە قورئان و سوننەتدا بەرجەستەیە، ئەو کەشتییەیە کە هەرکەس سواری بێ، سەرفرازو دەرباز دەبێ، وەك خوا "سبحانه وتعالى" فەرموویەتی: ﴿ قُلْ أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُوا۟ ٱلرَّسُولَ ۖ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنَّمَا عَلَيْهِ مَا حُمِّلَ وَعَلَيْكُم مَّا حُمِّلْتُمْ ۖ وَإِن تُطِيعُوهُ تَهْتَدُوا۟ ۚ وَمَا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلْبَلَـٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴿٥٤﴾ ﴾ النور: ٥٤.

واتە: بڵێ فەرمانبەریی خواو فەرمانبەریی پێغەمبەر بکەن، ئنجا ئەگەر پشتیان هەڵکرد، ئەوە ئەو بەرپرسیارێتیی ئەوەی لەسەرە کە پێی سپێراوەو، ئێوەش هی ئەوە کە پێتان سپێردراوەو، ئەگەر فەرمانبەریی (پێغەمبەر) بکەن، بەڕێی ڕاستدا بەئامانج دەگەن، وە جگە لە ڕاگەیاندنی ڕوون لەسەر پێغەمبەر نیە.

پێغەمبەری خواش (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فەرموویەتی: (**تركتُ فيكم أمرين لن تضلّوا ما مسكتم بهما: كتاب الله وسنة نبيِّه**). أخرجه مالك في الموطأ (٨٩٩/٢) والحاكم في المستدرك (٩٣/١) وحسّنه الألباني في (مشكاة المصابيح)(٧٧/١).

واتە: دوو شتم لەنێودا بەجیهێشتوون، کە هەتا دەستیان پێبگرن، هەرگیز گومڕا نابن: کتێبی خواو سوننەتی پێغەمبەرەکەی.

ئنجا ئاشكراشە كە پەڕگیریی (غُلوّ) بەهەموو جۆرەكانییەوە، چ لەبواری فیكریی‌و عەقیدەییدا بێ‌و، چ لەبواری كردارو ڕەفتاردا، دووركەوتنەوەیە لەڕێبازی هاوسەنگ (مُتَّزِن)ی پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ).

## ٢/ تێكدانی سیمای جوان‌و ڕەونەقداری شەریعەت، كە هاوسەنگیی‌و میانجێتییە:

وەك پێشتریش چەندجارێك باسمان كرد: دیمەنی هەرەجوان‌و شیرینی ئیسلام‌و شەریعەتەكەی، لەنێو ئایین‌و بەرنامەكاندا، بریتییە لەو حاڵەتەی هاوسەنگیی‌و، ڕێك‌و ڕاست‌و تەرازوو ڕاوەستانەی كە لەسەریەتی‌و، هەموو خاوەن عەقڵ‌و ویژدانێكی ساغ‌و سەلیم پەسەندی دەكات، ئنجا پەڕگیریی (غُلوّ) ئەو حاڵەتە سروشتیی‌و جوانەی ئیسلام‌و شەریعەت، دەشێوێنێ‌و شێوەیەكی كاریكاتێریی بۆ دروست دەكات!

بێگومان ئەوەش وێڕای تاوانبوونی، خیانەتێكی گەورەشە، بەرانبەر بە ئیسلام‌و شەریعەتەكەی، هەربۆیەش زانایانی پێشین (علماء السَّلف) زۆر قەڵس‌و تووڕەبوون، بەرانبەر بەداهێنەران (مبتدعین)و پەڕگیران (غُلاة)، بۆ نموونە: (سفیان الثوري) گوتوویەتی: (**البدعَةُ أَحَبُّ الى إِبليس من المعْصية، المَعْصية يُتابُ منها، والبدعة لا يُتابُ منها**) رواه البغوي في (شرح السنن): (٢١٦/١) وأبو نعيم في (الحلية): (٢٦/٧).

واتە: ئیبلیس بیدعەتی لەگوناهـ خۆشتر دەوێ، چونكە گوناهـ تۆبەی لێ دەكرێ، بەڵام بیدعەت تۆبەی لێناكرێ.

ئنجا دیارە (ابن تیمیة) مەبەستی ئەو قسەیە ڕوون دەكاتەوە، كە دەڵێ: (بیدعەت تۆبەی لێ ناكرێ) بەوە كە بابای بیدعەتچیی‌و لادەر، كردەوەكەی

بەگوناهو تاوان نازانێ، تاکو لێی پەشیمان بێتەوەو، وازی لێ بێنێ، بەڵکو بەدینداریی‌و چاکەی دەزانێ[1]!

## ٣/ بێزراندنی مسوڵمانان‌و شێواندنی ئیسلام،لەبەرچاوی خەڵك:

بەڵێ، پەرگیریی مایەی لەپێش چاوی خەڵك بێزراندنی مسوڵمانان‌و، شێواندن‌و ناشیرینکردنی ئیسلامەو، ئەمەش لەم ڕۆژگارەدا ڕاستییەکی ڕوون‌و درەوشاوەیەو، هەموو لایەك دەبینن‌و دەبیستن: چۆن بەهۆی ڕەفتارو هەڵوێستە ناشەرعیی‌و قێزەونەکانی

گرووپە پەرگیرەکانەوە – بەتایبەت (داعش)- زاری ئەهلی کوفرو ناحەزو کینەدڵ بەرانبەر بەئیسلام‌و مسوڵمانان کراوەتەوەو، لێیان کەوتوونە تەقە!

## ٤/ سڵەماندنەوەی خەڵك لە ئیسلام:

ئەمیش بەرهەم‌و شوێنەوارێکی دیکەی شوومی پەرگیرییە، وەك لەم دەقەی سوننەتەوە دیارە، کە پەرگیریی‌و تێپەڕاندن لەهەر کەسێکەوە بێ، دەبێتە مایەی دوورخستنەوەی خەڵك‌و سڵەماندنەوەیان:

**(عن أبي مسعود الأنصاري قال: جاء رجلٌ إلى رسول الله صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ فقال: إِني لأتأخَّر عن صلاة الصبح من أجل فلانٍ مِمّا يُطيلُ بِنا، فما رأيت النبيَّ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ غضِبَ في موعظةٍ قط أشدَّ مِما غضِبَ يومئذٍ، فقال: ياأيها الناس! إِن منكم مُنَفِّرين، فمن منكم أمَّ الناس فَلْيُوجِزْ، فإِنَّ من ورائه الكبير والضعيف وذا الحاجة).**

١) بڕوانە: مجموع الفتاوى، ج١١ ص٦٨٥،٦٨٤.

واتە: پیاوێك هاتەلای پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) گوتی: من بەهۆی فلانکەسەوە کە زۆر نوێژەکەمان درێژ دەکاتەوە، لەنوێژی بەیانیان دوا دەکەم -واتە نوێژی بەکۆمەڵ- ئنجا من پێغەمبەرم (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) هەرگیز نەبینیوە لەهیچ ئامۆژگارییەکدا، وەك توورەبوونی ئەو ڕۆژە توورە بووبێ،

فەرمووی: ئەی خەڵکینە! ئێوە کەسانێکی سڵەمێنەرەوەتان لەنێودان! بۆیە هەرکامێکتان پێشنوێژیی بۆ خەڵك کرد، با بەکورتیی بیکات، چونکە بابای پیرو بێ هێزو خاوەن ئیش و کاری لەپشتەوەیە.

هەربۆیەش پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) کاتێك یەکێ لەهاوەڵانی خۆی بەکارێك دەنارد، دەیفەرموو: (**بَشِّروا ولا تُنَفِّروا، ويَسِّروا ولا تُعَسِّروا**) رواه مسلم ٤٥٠٠ والبخاري: ٧١٧٢ بلفظ قريب منه.

واتە: دڵی خەڵکی خۆشبکەن و، مەیانسڵەمێننەوەو، دینداریيان بۆ ئاسان بکەن و، لێیان وەزەحمەت مەخەن.

## ٥/ تەمەن کورتیی و کەم خایەنیی:

هەمیشە حاڵەتی پەرگیریی و لاسەنگیی، تەمەن کورت و کەم خایەنەو زۆر برناکات، وەك لە فەرموودەی پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ)دا هاتوە:

(**إِنَّ هذا الدِّين متينٌ فأَوغِلْ فيه برِفْقٍ، ولا تُبَغِّضوا الى أنفسكم عبادة الله، فإنَّ المُنْبَتَّ لا أَرْضاً قطع ولا ظهْراً أَبْقى**) رواه البزّار (٧٤/١) عن جابر مرفوعاً، ووردت الجملة الأولى منه عند أحمد (١٩٩/٣) عن أنس مرفوعاً، وحَسّن الألباني في الجامع الصغير الجملة الأولى منه: ٢٤٤٢.

واتە: بێگومان ئەم ئایینە پتەوە، دەجا بەنەرمیی پێیدا بچۆ خواری و، خواپەرستیی لەلای خۆتان بوغزێنراو مەکەن، چونکە کەسێك کە زیاد لەولاخەکەی بار دەکات، نەڕێگاکە دەبڕێ و، نە ولاخەکەیشی دەمێنێ.

با هەر لەوبارەوە ئەم دەقەش بێنین:

(**عن عائشة قالت: دخل عليّ رسول الله "صلى الله عليه وسلم" وعندي امرأة، فقال: من هذه؟ فقلت: امرأة، لا تنام تُصَلّي، قال: عليكم من العمل ما تطيقون، فوالله لا يَمَلّ الله حتى تَمَلّوا، وكان أحبُّ الدين إليه ما داوم عليه صاحِبُهُ**) رواه البخاري:٤٣ ومسلم ١٨٣١ والنّسائي:٥٠٥٠.

واتە: پێغەمبەری خوا لێم وەژوورکەوت، ژنێکم لەلابوو، فەرمووی: ئەوە کێیە؟! گوتم: ژنێکە شەوگار ناخەوێ، هەر شەونوێژان دەکات! ئەویش فەرمووی: هەر ئەوەندە کردەوەی باش بکەن کە لەتواناتان دایە، چونکە بەخوا ئێوە ماندوو دەبن (لەکردەوە) بەڵام خوا ماندوو نابێ (لەپاداشتدانەوەتان)و، (پێغەمبەر) خۆشەویستترین دینداریی‌و طاعەت لەلای ئەوەبوو، کە خاوەنەکەی لەسەری بەردەوام بووایە.

## ٦/ دابڕان‌و پەرتەوازەیی (التفرُّق):

دەرهاویشتەیەکی دیکەی زۆر خراپی پەڕگیریی‌و سەختگیریی لەدینداریی‌و تاعەتدا، ئەوەیە کە دەبێتە مایەی دابڕان‌و پەرتەوازەیی لەنێو کۆمەڵگادا.

(الشاطبي) لەکاتی قسەکردن لەبارەی ئەم ئایەتەوە: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمْ وَكَانُواْ شِيَعًا لَّسْتَ مِنْهُمْ فِي شَيْءٍ إِنَّمَآ أَمْرُهُمْ إِلَى ٱللَّهِ ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُواْ يَفْعَلُونَ ﴿١٥٩﴾ ﴾ الأنعام: ١٥٩.

واتە: بێگومان ئەوانەی ئایینەکەیانیان بەش بەش کردو، بوونە چەند دەستەو تاقمێك، تۆهیچ پەیوەندییت پێیانەوەنیە، سەرەنجامی کاریان تەنیا عایدی خوایە، پاشان بەوەی دەیکەن هەواڵیان دەداتێ- کەچەند شتێکی خراپە!.

گوتوویەتی: (ظاهر القرآن يدلّ على أن كلَّ من ابتدع في الدين بدعةً من الخوارج وغيرهم، فهو داخلٌ في هذه الآية: لأنهم اذا ابتدعوا تجادلوا وتخاصموا وتفرَّقُوا وكانوا شيعاً)[1].

واتە: ڕواڵەتی قورئان ئەوە دەگەیەنێ کە هەرکەس داهێنراوێك لە ئایین دا دابێنێ، لە خەواریجو ئەوانی دیکەش، ئەوە دەچێتە نێو بازنەی ئەم ئایەتەوە، چونکە هەرکات شتیان-لەئاییندا- داهێنا، شەڕەقسە دەکەنو، ناکۆك دەبنو پەرتەوازە دەبنو، دەبنە دەستەو تاقمی زۆر.

## ٧/ دەمارگیریی کوێرانە (التعَصُّب الأعمى):

ئەمیش یەکی دیکەیە لەشوێنەوارە خراپو شوومەکانی پەڕگیریی‌و سەختگیریی. شایانی باسیشە هەمیشە گیرۆدەبووانی پەڕگیریی، کەسانی کەللە وشكو دۆگماو داخراوو، سەرسام بەبیروڕای خۆ (مُعْجَب بالرأي)نو، لەجیاتی ئەوەی (شافعي) گوتەنی بڵێن: (رأيي صواب يَحْتَمِلُ الخطأ، ورأي غيري خطأ يحتملُ الصَّواب)، ڕای من ڕاستەو ئەگەری هەڵەی هەیە، وە ڕای بەرانبەرم هەڵەیەو، ئەگەری ڕاستیی هەیە.

دەڵێن: (رأيي صواب لا يحتْمل الخطأ، ورأي غيري خطأ لايحتمل الصواب) ڕای من ڕاستەو ناگونجێ هەڵەبێ‌و، ڕای بەرانبەرم هەڵەیەو ناشگونجێ ڕاست بێ!!

ئاشکراشە بیرکردنەوەی ئاوا، هیچ دەرفەتو بوارێك بۆ لێك تێگەیشتنو گفتوگۆ (التفاهم والحوار) ناهێڵێتەوە!

[1]) الإعتصام، ج١ص٨١.

## ٨/ زێدەڕۆیی کردن لە قەدەغەکردندا:

ئـەمیش شـوێنەوارێکی دیکـەی پەڕگیرییـەو، کاریگـەریی زۆر خراپیشـی هەیە،لەسەر شێواندنی ئیسلامو خەڵك لێ سڵەماندنەوەی.

بەڵێ پەڕگیران (متطرفين) دێنن بەناوی حەرامەوە، دنیا لەخەڵك دەکەنە چەرمی چۆلەکەو، هەرچی بـەدڵیان نـەبوو لەهـەموو بوارەکانـدا، دەیخەنـە بازنـەی قەدەغـە (حرام)ەوە، بێ خەبەر لەوەی کە خوای میهرەبان زۆری پێناخۆشە، هیچ کەس بـەبێ بەڵگەیـەکی ڕوونو ڕاشـکاوی وەحیـی، شـتێك لەبەنـدەکانی قەدەغـە بکـات، وەك فەرمووییـــەتی: ﴿ وَلَا تَقُولُوا۟ لِمَا تَصِفُ أَلْسِنَتُكُمُ ٱلْكَذِبَ هَٰذَا حَلَٰلٌ وَهَٰذَا حَرَامٌ لِّتَفْتَرُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ لَا يُفْلِحُونَ ﴿١١٦﴾ ﴾ النحل.

واتە: وە بەوەی کە زمانەکانتان بەدرۆ وەسفی دەکـات – لەخۆتانـەوە- مـەڵێن: ئەمـە حەلاڵـەو ئەمـە قدەغـەیـە،تاکو–بـەوکارەتان- سـەرەنجام درۆ بـەناوی خـواوە هەڵبەستن، بێگومـان ئەوانەی درۆ بەناوی خواوە هەڵدەبەستن، سەرفراز نابن.

پێغەمبـەری خـواش (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فەرموویـەتی: (**إِنَّ الله تعـالى فـرض فرائض فلا تُضَيِّعوها، وحدَّ حلوداً فلا تعتلوها، وحرَّم أشياءَ فـلا تنتهكوهـا، وسكت عن أشياءَ رحمة لكم غير نسيان، فـلا تَبْحَثوا عنهـا**) أخرجـه الـدار قطنـي (١٨٤/٤) والطبراني في الكبير (٢٢/٢٢١-٢٢٢) و البيهقي في السنن الكبرى (١٢/١٠)، وحسّنه النووي في رياض الصالحين: ١٨٣٠.

واتە: بێگومـان خوای بەرز چەند ئەرکێکی پێویست کردوون، زایەیان مـەکـەنو، چـەند سـنوورێکی کێشـاون، مـەیانبـەزێننو، چـەند شـتێکی قەدەغـەکردوون، مـەیانشکێننو، لەڕووی بەزەییەوە، بەبێ لەبیرچوون، لەچەند شتێك بێدەنگ بـووە، لێیان مـەپرسن.

ئنجا لەسۆنگەی ئەوەوە کە ئەم مەسەلەی شت قەدەغەکردنە، بەبێ بەڵگەی شەرعیی ڕوون، هەم تاوانێکی زلەو، هەم زیانێکی گەورە بەدین‌و ژینی کۆمەڵگا دەگەیەنێ، با بە هێنانەوەی وێنەیەك زیاتر ڕوونی بکەینەوە:

**دامێن کورتکردنەوە:**

پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) لەبارەی شۆڕکردنەوەی دامێنی جزداشە (إزار) بەجۆرێك کە لەزەوی بخشێ، فەرموویەتی: (**ما أسفل من الكعبين من الإزار ففي النار**) رواه البخاري:٥٧٨٧.

واتە: هەرچی لەجزداشە لەخوار گوێزینگانەوەبێ، لەئاگردایە.

شایانی باسە کە بەپێی بنچینەی: (يحمل المطلق على المُقَيَّد) (ڕەها لەبەر تیشکی بەندداردا فام دەکرێ) کە بنچینەیەکی شەرعیی کۆڕا لەسەر دامەزراوە، هەرکات دوو دەقمان هەبوون، یەکیان ڕەها (مطلق)و یەکیان بەنددار (مُقيَّدْ)، پێویستە ڕەهایەکە لەبەر ڕۆشنایی بەنددارەکەدا، کاری پێبکرێ.

ئنجا لێرەدا چەندان دەقی دیکەمان هەن، کە بەنددارکەر (مُقَيِّد)ی ئەو دەقەی پێشوون، کە بەڕەهایی پۆشاك شۆڕکردنەوە قەدەغە دەکات، بۆ بوێنە:

١. (**لا ينظر الله يوم القيامة الى مَنْ جَرَّ إزارهُ بَطَراً**) رواه البخاري: ٥٧٨٨، ومسلم: ٢٠٨٧.

واتە: لەڕۆژی قیامەتدا، خوا تەماشای کەسێك ناکات، کە بەفیزو خۆبەزلگریی، پۆشاکەکەی ڕادەکێشێ.

(**من جرَّ ثَوْبَهُ خُيَلاءَ لم ينظر الله إليه يوم القيامة ، فقال أبوبكر : يا رسول الله إن إزاري يسْتَرْخي إلاّ أن أتعاهَده ، فقال له : رسول الله "صلى الله عليه وسلم" : إنك لست مِمَّن يفعله خُيَلاءَ**) رواه البخاري : ٣٦٦٥.

واتە: هەرکەس بەفیزوکەشخە پۆشاکەکەی ڕاکێشێ، خوا لەڕۆژی قیامەتدا بۆی ناڕوانێ، ئەبوبەکرگوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! من مەگەر ئاگاداری بم، دەنا پۆشاکەکەم هەردادەکەوێ! فەرمووی: تۆ لەوانە نی کە بەفیز وادەکەن.

کەواتە: هەڕەشەکە لە کەسانێکە کە بەفیزودەمارو بۆخۆنواندن، پۆشاکی خۆیان بەردەدەنەوەو ڕایدەکێشن، کە ئەوەش عادەتێکی سەردەمی نەفامیی بووەو، خۆبەزلگرەکان کردوویانەتە پیشەو، جاری وابووە بابای پۆشاك شۆڕ، کەسێکی تایبەت بەدامێنی پۆشاکەکەی بۆ هەڵگرتوەو، لەپشتیەوە ڕۆیشتوەو، هی وا هەبووە زیاتر لە مەترێك پۆشاکەکەی لەدوا خشاوە!

بۆیە ئەوانەی کە هەر لەبۆسەدان، بۆ بەگوناهباردانانی خەڵك‌و، زیادکردنی قەدەغەکراوەکان: بەڕەهایی لەگوێزینگ بەرەوخوار چوونی پۆشاکی هەرکەسێك، بەگوناهو حەرام دادەنێن، بێ ئەوەی سەرنجی پاڵنەری ڕەفتارەکەیان بدەن، پێچەوانەی ڕێبازی پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) ڕەفتار دەکەن.

ئەوە بەنسبەت پۆشاکی عەرەبییەوە وەك جزداشە، کە دامێنی هەیە، بەڵام بەنسبەت جۆرەکانی دیکەی پۆشاکەوە، کە گەلانی دیکە دەیانپۆشن، بۆوێنە:

کورتەك‌و شەڕواڵی کوردیی، یان چاکەت پانتۆڵی ڕۆژئاوایی، ئەوە فەرموودەکان باسیان ناکەن‌و، دروستیش نیە فەرمایشتی پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) کە بۆ جۆرە پۆشاکێکی تایبەت فەرموویەتی، بەبێ بەڵگە بەسەر جۆرەکانی دیکەی پۆشاك دا بگشتێنرێ.

دیارە لەهەموو فەرمایشتەکانیشدا باسی (إِزار)و (ثَوْب) کراوە، کە مەبەست پێیان جزداشەو، هەرپۆشاکێکە کە لەنیوەی خوارەوەی جەستەوە دەپێچرێ: (الإِزار: ثوبٌ يُحيط بالنصف الأسفل من البدن، يُذَكَّرُ ويؤنَّث).[1]

---

١) المعجم الوسيط، ص١٦.

دیـاره لـەرۆژگاری پێغەمبـەری خـواداو لـەنێو گـەلی عەرەبـدا، وێـڕای (إزار) (سَرْوال)یش هەبووه، بەڵام فەرمایشتەکان، تەنیا باسی پۆشاکی بەدامێنو شۆڕەیان کردوه، نەك شەڕواڵ (سَرْوال)!

## ٩/ لەخۆبایی بوونو خۆپەسەندیی:

ئەمیش دەرهاویشتەیەکی دیکەی خراپی پەڕگیرییەو، بە ئـەزموون دەرکـەوتوه، کە هەموو ئەوانەی زێدەڕۆیی دەکـەن، لەهەنـدێك خواپەرستیی تایبەتییـدا – وەك نوێژو ڕۆژوو- بیّ ئەوەی ڕەچاوی هاوسەنگیی (إتّـزان) بکـەن لەدینـداریی یـان داو، بیّ ئەوەی ئەو خواپەرستییەیان لەسەر بناغـەی تێگەیشـتنیکی ڕاسـتو ئیمـانێکی پتەو بنیات نرابیّ، دوایی خۆیان لیّ دەگۆڕیّو لەکـەوڵی خۆیـان دەردەچـن، چـونکە هەست دەکەن کە شتێکیان کردوه، خەڵکی دیکە نەیکردوه!

گرووپی (خوارج)یش لەوبارەوە باشترین نموونـەن، کـە وەك پێشـتر فەرموودەکـەم لـەبارەوەهێنان، پێغەمبـەری خـوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّم) لەیـەکێك لەوەسـفەکانیدا لەبارەیانەوە، فەرموویـەتی: (**يَحْقِرُ أحدكُم صَلاتَهُ مع صلاتهم، وصيامَهُ مع صيامهم**) متفق عليه.

هەروەها نموونەیەکی دیکە، کە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی گوتمـان: هەڵوێسـتی ئـەو سیّ کەسـەیە کـە هاتنـە لای هاوسـەرانی پێغەمبـەری خـوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) و لەبارەی تاعـەتی ئەوەوە پرسیاریان کردو، پاشان تاعـەتی پێغەمبەریان پیّ کەم بـوو (كأنّهم تقالّوها)!! بۆیە بڕیاریاندا، بەهەرسێکیان لە پێغەمبەری خـوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) تاعـەتی زیاتر بکەن!

دیاره (عطاءالله السكندري)یش مـەبەستی ئەو جۆرە تاعـەتە ڕووکەشـییە بـووە، کە گوتوویـەتی: (ومعصـية أورثـت ذُلاً وانكسـاراً، خـيرٌ مـن طاعـة أورثـتْ عُجْبـاً

واستكباراً)، واته: گوناهێك ببێته مایەی زەبوونیی‌و شەرم‌و شكۆت (لەخوا)، باشتره له فەرمانبەرییەك، ببێته مایەی بەخۆسەرسام بوون‌و خۆبەزلگریی!

واش پێدەچێ ئەو حیكمەتەی (عطاءالله) لەو قسەیەی(علي بن أبي طالب)ەوە"خوا لێیی ڕازی بێ"هاتبێ كه گوتوویەتی: (سيئة تسوؤك، خير عندالله من حسنةٍ تُعْجِبُك) واته: خراپەیەك كه نارەحەتت دەكات، لەلای خوا، له چاكەیەك باشتره كه سەرسامت دەكات!

## ١٠/ گومانی خراپ بەخەڵك بردن:

ئەمیش -كه پەیوەندیی ڕاستەوخۆی بەشوێنەواری پێشووەوە هەیە، چونكه هەمیشه بابای خۆپەسەندو لەخۆڕازیی، بەدگومانه بەرانبەر بەخەڵكی- دەرهاویشتەیەكی دیكەی خراپی پەرگیرییەو، مایەی گوناهباریی‌و فەوتانی خاوەنەكەشیەتی، وەك پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّم) فەرموویەتی: (**مَن قال: هلك الناس، فهو أهلكم**) رواه مسلم: ٢٦٢٣، وأبوداود: ٤٩٨٣، ومالك في (الموطأ) (٩٨٤/٢)، وأحمد في المسند (٢٧٢/٢).

واته: هەركەس بڵێ: خەڵك فەوتاون (بەهۆی گوناهانەوە) ئەوه خۆی فەوتاندوونی، یان خۆی فەوتاوترینیانه.

چونكه بێژه (لَفْظ)ی (أهْلَكَهم)، به (أهْلَكُهُمْ) و(أَهلَكُهمْ) هاتوه.

## ١١/ زبریی‌و توندیی:

ئەمیش دەرهاویشتەیەكی دیكەی سەركێشیی‌و تێپەڕاندنه لەدینداریيداو، ئاشكراشه بابای خۆپەسەندو لەخۆڕازیی له دەروونییدا، زبرو سەختگیرو توندوتیژ دەبێ، لەڕواڵەتیدا!

هەڵبەتە خوای کاربەجێ "عزو جل" پێغەمبەری خاتەمی (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) بەسیفەتەکانی: نەرمیی‌و بەزەیی‌و پەرۆش (اللِّين والرحمة والرأفة) وەسف کردوە، کە پێچەوانەی زبریی‌و توندیین، وەك فەرموویەتی: ﴿ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ... ﴿١٥٩﴾ ﴾ آل عمران.

واتە: وە بەهۆی بەزەیی خواوە، لەگەڵیان نەرمبووی..

وە فەرموویەتی: ﴿ لَقَدْ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢٨﴾ ﴾ التوبة.

واتە: بەدڵنیاییەوە پێغەمبەرێکتان لەخۆتان بۆتان هاتوە، نارەحەتیتانی لەسەر دڵ قورسە، لەسەر (بەرژەوەندیی)تان سوورەو، بەرانبەر بەبڕواداران بەبەزەیی‌و پەرۆشە.

پێغەمبەری خواش (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) لەبارەی گرنگیی نەرم‌و نیانیی‌و، خراپیی زبریی‌و توندیی، لەبواری بانگەوازو هەڵس‌و کەوتدا، فەرموویەتی: (**إِنّ الرِّفق لايكون في شأنٍ إلاّزانَهُ، ولا يُنْزَعُ مِنْ شيءٍ إلاّ شانَهُ**) رواه مسلم: ٢٥٩٤.

واتە: نەرم‌و نیاینی لە هەرشتێکدا بێ، جوانی دەکات‌و، لەهەرشتێك دابڕنرێ، ناشیرینی دەکات.

هەروەها فەرموویەتی: (**مَنْ يُحْرَمِ الرفْقَ يُحْرَمِ الخَيْر كُلَّه**) رواه مسلم ٢٥٩٢.

واتە: هەرکەس لەنەرم‌و نیانیی بێبەش بێ، لەهەموو چاکەیەك بێبەشە.

## ١٢/ پابەندكردنی خەڵك بەشتێكەوە، كە خوا پێوەی پابەندنەكردوون:

خوای كاربەجێ لەكتێبی بێ هەڵەو پەڵەی خۆیدا، ڕایگەیاندوە: كە ئاسانیی لەبەندەكانی دەوێ –لەشەریعەتەكەیدا- نەك زەحمەتو نارەحەتیی، هەروەها ڕایگەیاندوە: كە لەئایینو بەرنامەكەیدا، هیچ شتێكی مایەی سەغڵەتیی (إحراج)ی دانەناوە، وەك فەرموویەتی:

١- ﴿يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلۡيُسۡرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلۡعُسۡرَ......﴿١٨٥﴾﴾ البقرة.

واتە: خوا ئاسانیی بۆتان دەوێو زەحمەتو قورسیی لێتان ناوێ.

٢- ﴿...وَمَا جَعَلَ عَلَيۡكُمۡ فِي ٱلدِّينِ مِنۡ حَرَجٖ....﴿٧٨﴾﴾الحج.

واتە: خوا لەئاییندا سەغڵەتیی نەخستۆتە سەرتان.

هەروەها پێغەمبەری خاتەمیش (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّم) هەركات لەنێوان دووشتاندا سەرپشك كرابێ، هەرئاسانترەكەی هەڵبژاردوە، مادام گوناە نەبووبێ، وەك لەم دەقەوە دیارە:

٣- **(عن عائشة رضي الله عنها قالت: ما خُيِّر رسولُ الله صلى الله عليه بين أمرَيْنِ قَطُّ، إلا أَخَذَ أيسرَهما مالم يكن إثماً..)** رواه البخاري: ٣٥٦٠ ومسلم: ٢٣٢٧.

كەچی پەرگیران هەمیشە داڵغەیان بەوشتانەوە لێداوە، كە توندو سەغڵەتكەرن، هەرچەندە ئاسانیش هەبێ، یان ئاسانەكە بەڵگەی بەهێزتریشی لەسەربێ!

**پێچەگرتنەوە (إنتقاب) وەك نموونە:**

زاناو شەرعزانان لەبارەی حوكمی پێچە (نقاب)ەوە، هەر لەدێر زەمانەوە، ڕاجیاییو مشتومڕیان هەبووەو ئێستاش بەردەوامە، بەڵام زۆربەی هەرەزۆری توێژەرەوانی قورئانو، زۆربەی فەرموودەناسانو، زۆربەری شەرعزانان –وەك

لەکتێبی: (ئافرەتو خێزان لەسایەی شەریعەتدا)و، لە کتێبی: (چەند بابەتێکی هونەریی..)دا، بەدرێژیی باسمان کردوەو ڕوونمان کردۆتەوە- ڕایان وایە کە ئافرەت دەمو چاوو هەردوو دەست هەتا بازنەی دەست (الوجة واليدان إلى الرُّسغ)ی عەورەت نینو، پابەند (ملْزَم) نیە بەداپۆشینیان، وەك (الطبَري) لە تەفسیری فەرمایشتی خوادا: ﴿ وَقُل لِّلْمُؤْمِنَٰتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَٰرِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا ...﴿٣١﴾ ﴾النور.

واتە: بە ئافرەتانی بڕوادار بڵێ: با لەنیگای چاوەکانیان بگرنەوەو، داوێنیان بپارێزنو، جوانیی خۆیان جگە لەوەی (بەعادەت) دەردەکەوێ، دەرنەخەن..

گوتوویەتی: (وأولى الأقوال في ذلك بالصَّواب، قول مَنْ قال: عُنيَ بذلك: الوَجْهُ والكفّان، يدخل في ذلك — اذا كان كذلك- الكحل والخاتم والسِّوار والخِضاب)[1].

واتە: لەپێشترین قسە بەلای ڕاستییدا لەوبارەوە، قسەی کەسێکە کە گوتوویەتی: مەبەست لەوە (إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا) ڕوو و هەردووك لەپەدەستن، ئنجا مادام وابێ: هەرکام لە کلو ئەنگوستیلەو بازنەو خەنەش، هەمان حوکمیان هەیە.

ئنجا مادام وابێ —زۆربەی زانایان: دەمو چاو و هەردووك دەستی ئافرەتانیان پێ عەورەت نەبێ- چ ڕەوای هەقە ڕایەکەی دیکە، کە هی کەمینەیە، لەخەڵکی بکرێتە تاکە ڕای ئیسلامو، سەرەنجام دامێنو دەلینگ هەڵپێچانی پیاوانو، پێچەگرتنەوەی ژنان (تشمير الرجال وانتقاب النساء) بکرێنە سەنگی مەحەکی: دینداریی و پابەندیی بەشەریعەتو ڕێبازی پێشینی چاکەوە؟!

لەحاڵێکدا کە ئەو دوو هەڵسوکەوتە ، وێڕای بێ هێزیی بەڵگە کانیشیان، دوو شتی گچکەو لاوەکیین، لەچاو بابەتەکانی ئیمانو عەقیدەو، پایەکانی ئیسلامو، حەلاڵو حەرامە سەرەکییەکانو، ڕەوشتو ئاکارەمەزنەکان.

---

[1] بڕوانە: زاد المسير في علم التفسير، لابن الجوزي، ص٩٩٤، الحاشية.

## ١٣/ زیادکردن لە شەریعەت:

بێگومان پەڕگیران (غُلاة) کە لەبازنەی شەریعەت دەردەچن، مانای وایە شتی دیکە لەشەریعەت زیاد دەکەن، کە دیارە ئەوەش بەرهەمو شوێنەوارێکی دیکەی شوومی پەڕگیرییە.

باشترین پێوەریش بۆ زانینی زیادکردن لەشەریعەت، بریتیە لەوە کە سەرەنج بدەین: هەر شتێك بووبێتە مایەی زەحمەتو سەرئێشە بۆ خەڵكو جەماوەر بەگشتیو، پێچەوانەی بەرژەوەندییان بوو، ئەوە با دڵنیابین کە شتێکی زیادکراوو نامۆیە بەشەریعەت، چونکە:

أ- خوا فەرموویەتی:﴿ وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ ... (٧٨) ﴾الحج.

ب- هەروەها فەرموویەتی: ﴿ وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ (١٠٧) ﴾ الأنبياء.

کەواتە: هەر شتێك مایەی سەغڵەتکردنو سەرئێشە بوو بۆ خەڵك بەگشتیو، هۆکاری خستنە نارەحەتییو زەحمەتیان بوو، دیارە بەئایینی خواو، پەیامو ڕێبازی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نامۆیە.

ئنجا بەتێوەڕامانی هەڵسوکەوتو ڕەفتاری گرووپە پەڕگیرەکانیش، لەو شوێنانەدا کە دەستەڵاتیان هەیە، زەحمەتدانو سەغڵەتکردنی خەڵكو جەماوەر لەلایەن وانەوە، زۆر ڕوونو ئاشکرایە، بەتایبەت گرووپی (داعش)و، پێویست بەنموونە هێنانەوەش ناکات.

## ١٤/ خۆئەزیەتدانی بێ سوود:

بێگومان ئیسلام ئایینی عەقڵی سەلیمو فیترەتی ساغەو، بۆ بەختەوەرکردنی مرۆڤ هاتوە لەدنیاو دوارۆژو، ڕازی نیە هیچ کەس بەبیانووی شوێنکەوتنی

ڕێبازەکەیەوە، خۆی بخاتە گرفتارییەوە، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ طه ۝١ مَآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْقُرْءَانَ لِتَشْقَىٰٓ ۝٢ إِلَّا تَذْكِرَةً لِّمَن يَخْشَىٰ ۝٣ ﴾ طه.

واتە: طا، ها، ئێمە قورئانمان بۆیە دانەبەزاندۆتە سەرت کە گرفتار بی، بەڵکو تەنیا بیرخەرەوەیە بۆ هەرکەس کە (لەسزای خوا) بترسێ.

هەروەها دەقی سوننەت لەوبارەوە زۆرن، کە پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّم) زۆر دژی خۆئەزیەتدان بووە، بەبیانووی خوا پەرستییەوە، بۆ وێنە: (**عن أنس بن مالك رضي الله عنه أن رسول الله صلى الله عليه وسلم رأى رجلاً يُهادى بين ابنيه، فقال: مابالُ هذا؟ قالوا: نَذَرَ أن يَمشي، قال: إِنَّ الله عن تعذيب هذا نَفْسَهُ لَغَنيٌّ، وأَمَره أن يركب**) رواه البخاري: ١٨٦٥ ومسلم: ١٢٦٤ وأبوداود: ٣٣٠١ والترمذي: ١٥٣٧ والنسائي: ٣٨٥٠.

واتە: پێغەمبەری خوا پیاوێکی بینی بەلۆژەلۆژ لەنێوان دوو کوڕەکەیدا دەڕۆیی، فەرمووی: ئەوە چییەتی؟ گوتیان: لەخۆی گرتوە (نەزری کردوە) کە بەپێیان بڕوات! فەرمووی: بێگومان خوا بێنیازە لەخۆ ئەزیەتدانی وی‌و، فەرمانی پێکرد کە سواربێ.

بەڵێ ئەوە هەڵوێستی ئیسلامە، کەچی پەرگیران بەپێچەوانەی فەرمانی قورئان‌و سوننەتەوە، خۆیان دەخەنە نارەحەتیی‌و گرفتارییەکەوە،کە ئیسلام نایەوێ‌و،ئەوە هیچ کەپاداشتی لەسەرنیە، بگرە سزادانیشی لەسەرە، ئنجا زۆرجار ئەو جۆرەکەسانە ماڵ‌و خێزان‌و دەوروبەریشیان لگەڵ خۆیاندا گرفتارو نارەحەت دەکەن.

## ١٥/ بەزایەدانی مافەکان:

هەمیشە زێدەڕۆیی کردن لەلایەنێك دا، لەسەر حیسابی لایەنەکانی دیکە دەبێ، هەربۆیە هەمیشە پەرگیریی، بەزایەدانی مافەکان (تضييع الحقوق)ی لێ

دەکەوێتەوە، بالەوبارەوە سەرنجی ئەم دەقەی سوننەت بدەین: (**عن أبي جُحَيْفَةَ قال: آخى النبيُّ صلى الله عليه وسلم بين سلْمان وأبي الّدرداءِ، فزَارَ سَلمانُ أبا الدرداءِ، فرأى أمَّ الدَّرداءِ مُتَبَذِّلَةً: فقال: ماشأْنُكِ؟ قالت: أخوك أبو الدَّرداء ليس لَه حاجةٌ في الدنيا، فجاءَ أبوالدرداء فَصنَع لَه طعاماً، فقال لهَ: كُلْ فإني صائِمٌ، قال: ما أنا بآكلٍ حتى تأكلَ، فأكَلَ، فلماّ كان اللّيلُ ذهب أبو الدرداءِ يَقومُ، فقال له: نَمْ، فنامُ، ثم ذهب يقوم، فقال لَه، نَمْ، فنامَ، فلماّ كان من آخر اللّيل، قال سلمان: قُم الآن، فَصلّيا جميعاً، فقال له سلمان: إن لربك عليك حقاً، وإن لنفسك عليك حقاً، ولأهلك عليك حقاً، فأعْطِ كلَّ ذي حَقٍ حَقَّهُ، فأتى النبيَّ صلى الله عليه وسلم فذكر ذلك له، فقال النبيُّ صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ: صدق سلْمانُ**). رواه البخاري: ١٩٦٨.

واتە: پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) سەلمانو ئەبی دەدەرِدائی کردبوونە برا، ئنجا سەلمان سەردانی ئەبوددەرِدائی کرد، ئوموددەرِدائی بینی: پۆشاکی ئیشوکاری لەبەردا بوو، گوتی: بۆچی وای؟ گوتی: ئەبو ددەرِدائی برات پێویستی بەدنیا نیە، ئنجا ئەبو ددەرِداء هاتەوەو خواردنێکی بۆ (سەلمان) سازکرد، پێی گوت: بخۆ! من بەرِۆژووم، (سەلمان) گوتی: هەتا نەخۆی ناخۆم، ئیدی خواردی.

ئنجا کاتێك شەوگار هات، ئەبو ددەرِداء بەسەلمانی گوت: تۆ بخەوە، چوو بۆ شەونوێژان، سەلمان پێی گوت: بخەوە، ئەویش خەوت، دوایی جارێکی دیکە (پاش رۆیشتنی بەشێك لەشەوگار) دووبارە هەڵسایەوە بۆ شەونوێژان، ئەویش پێی گوت: بخەوە، نووست، هەتا کۆتایی شەوگار داهات، سەلمان پێی گوت: ئێستا هەڵسەو، پێکەوە شەونوێژیان کردن، ئنجا سەلمان پێی گوت: بێگومان مافی پەروەردگارتت لەسەرەو، مافی خۆشتت لەسەرەو، مافی هاوسەریشتت لەسەرە، دەجا هەرخاوەن هەقە مافی خۆی بدەیە!

دوایی (ئەبوددەرداء) چووە لای پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ)و ئەوەی بۆ گێڕایەوە، پێغەمبەریش (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فەرمووی: سەلمان ڕاستی کردوە.

وەك لەم دەقەوە ئاشکرایە:

تێپەڕاندنو زێدەڕۆیی لەپێدانی ماف بەبوارێکدا، هۆکاری بەزایەدانی مافی لایەنو بوارەکانی دیکەی دینداریيەو، ئەوەش شتێکە کە خوا نایەوێو، خاوەنەکەی لەسەری قەرزدار دەبێتەوە.

## ١٦/ بەکافردانانی مسوڵمانان:

ئەمیش دەرهاویشتەیەکی دیکەی شوومی پەڕگیرییە، بەلای کەمەوە هی هەندێك لەجۆرەکانی، کە لەپەڕگیرییدا دەگەنە لووتکە، بۆ وێنە: (خوارج)و گرووپە بیدعەتچییەکانی دیکەی وەك (جهمیة)و (رافضة) لەمێژووداو، لەم ڕۆژگارەشدا (التکفیر والهجرة) لە حەفتایەکانی سەدەی ڕابردوودا لە میسرو، (داعش)و، بەشێك لە میلیشیا (شیعة)کان لە عێراقو سووریا، لەم ڕۆژگارەدا.

دیارە هۆکاری بنەڕەتیی ئەو ڕەفتارە کوشندەیەشیان بەکافردانانی مسوڵمانان(التکفیر المسلمین) ئەوەبووە کە ئەو ئایەتانەی باسی کافران دەکەن، بەسەر مسوڵمانانیاندا چەسپاندوون، وەك(عبدالله بن عمر)"خوا لێیان ڕازی بێ" لەوبارەوە لەبارەی (خوارج)ەوە، گوتوویەتی: (**إِنّهم انطلقوا إلى آيات نزلت في الكفار، فجعلوها على المؤمنين**). رواه البخاري تعليقاً، ص١٢٥٧ (باب قتل الخوارج والملحدين بعد إقامة الحجة عليهم).

هەروەها (إبن تيمية) لەوبارەوە گوتوویەتی (طريقة أهل البِدَع: يجمعون بين الجهل والظلم، فَيَبْتَدِعون بِدْعةً مخالِفةً للكتاب والسّنّة وإجماع الصحابة، ويُكَفِّرون

مَنْ خالفهم في بِدَعِهِمْ)[1].

واتــە: ڕێبــازی خــاوەن بیدعەتــەکان ئەوەیــە کــە نــەزانییو ســتەم پێکــەوە کۆدەکەنــەوە، بیدعــەتێکی پێچــەوانەی قورئــانو ســوننەتو کــۆڕای هــاوەڵان، دادەهێنن، پاشان هەرکەس دژی بیدعەتەکانیان بێ، بەکافری دادەنێن.

بەڕاستیی ئەو پێناسەیەی (إبن تيمية) بەسەر تێکڕای داهێنەرەکاندا دەچەسپێ، لەکۆنو تازەو لە چەکدارو بێچەك!

## ١٧/ کوشتنی مسوڵمانان:

دیارە ئەم دەرهاویشتەیەش هەرزادەو بەرهەمی ئەوەی پێشوویە، هەرچەندە وەك دواتر باسی دەکەین لەشەریعەتی ئیسلامدا، کوفری کافران هۆکاری جەنگ لەدژکرانو ڕەوابوونی کوژرانیان نیە، بەڵکو دەستدرێژییو ستەمیانە، کە مایەی ڕەوابوونی جەنگ لەدژکرانو کوشتنیانە، بەڵام پەرگیرانی پەیڕەوانی خەواریجو بیدعەتچییەکانی دیکە، لەو مەسەلەیەش دا تێیان پەڕاندوەو، پێیان وایە هەرکەس چووە بازنەی ئەهلی کوفرەوە، سەروماڵی حەڵاڵە، هەربۆیەش پاش بەکافردانانی هەر مسوڵمانێك، بێ سێودوو کوشتنیشی بەڕەوا دەزانن، وەك (أبو قلابة) لەوبارەوە گوتوویەتی: (**ما ابتدع رجلٌ بدعةً إلاّ استحلّ السَّيف**) رواه الدارمي: ١٠٠.

واتــە: هــیچ پیاوێــك بیدعــەتێکی دانــەهێناوە، مەگــەر بــەکارهێنانی شمشــێری بەڕەوادانـاوە (لەدژی نەیارانی).

پێشتریش ئەو فەرموودەیەمان هێنا کە باسی (خوارج)ی دەکردو تێیدا هاتوە: (**يقرؤون القرآن لايجاوزُ حَناجرهم، يقتلون أهل الإسلام، ويَدَعُونَ أهل الأوثان**) رواه البخاري: ٣٣٤٤، ومسلم: ٢٤٤٨.

---

١) الردّ على البكري، ج٢ص٢٥٥.

واتە: قورئان دەخوێنن: بەڵام لەگەروویان بەولاوە ناچێ، ئەهلی ئیسلام دەکوژنو، لە ئەهلی بتان دەگەڕێن.

## ١٨/ لەخوا دووركەوتنەوە:

پەڕگیریی‌و داهێنان لەئاییندا، هۆكاری لەخوا دووركەوتنەوەی خاوەنەكەیەتی، چونكە: مرۆڤ دەبێ تەنیا خوا بپەرستێ، دەبێ تەنیا بەوشێوەیەش بیپەرستێ، كە خوا دیاریكردوە، بۆیە بابای لاڕێو پەڕگیر، هەتا زیاتر خۆی ماندوو بكات، گوناهبارتر دەبێو، زیاتر لەخوا دوور دەكەوێتەوە، وەك چۆن كەسێك بیەوێ بچێتە شارێك، كە لەلای ڕۆژهەڵاتە، كەچی ئەو بەرەو ڕۆژئاوا بڕوات، بێگومان هەتا زیاتر بەرەو ڕۆژئاوا بچێو، خێراتر ڕێ بكات، زیاترو خێراتر لەئامانجەكەی دوور دەكەوێتەوە.

(أبو أيوب السَّختياني) لەوبارەوە گوتوویەتی: (ما ازداد صاحب بِدْعَـةٍ اجتهـاداً إلاّ ازداد مـن الله بُعْداً) رواه أبونعيم في (الحلية) (٣/٩).

واتە: بابای خاوەن بیدعەت، هەتا زیاتر كۆشش بكات، پتر لەخوا دوور دەكەوێتەوە.

هەربۆیەش (خوارج)، نوێژو ڕۆژوو و قورئان خوێندنی زۆریان لەگەڵ پەڕگیرییدا، هیچ سوودی پێنەگەیاندن، وەك پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْـهِ وَسَلّمَ) لەبارەیانەوە فەرموویەتی:(**يَحْقِرُ أَحَدُكم صلاتَه مع صلاتهم، وصيامَهُ مع صيامهم، يقرؤون القرآن لايجاوزُ تراقيهم، يَمْرقون من الإِسلام كما يَمْرُقُ السَّهْمُ من الرَّمِيَّةَ..**) رواه البخاري:٣٥١٠ ، ومسلم: ٢٤٥٣.

واتە : یەكێكتان نوێژی خۆی لەچاو نوێژی ئەوانو، ڕۆژووگرتنی خۆی لەچاو ڕۆژووگرتنی ئەوان، پێ كەمە، قورئان دەخوێنن، لەگەروویان بەولاوە ناچێ، وەك چۆن تیر لەنێچیر دەردەچێ (دەراودیو دەبێ) ئاوا لەئیسلام دەردەچن.

## ١٩/ بوونە خراپترین کەس لەنێو ئۆممەتدا:

دیارە کەسانێك ئەو هەموو سیفەتە خراپانەیان تێدابن‌و، ئەو هەموو زیانانەیان بۆ مسوڵمانان‌و خەڵکی دیکەش هەبن، بەتایبەت بەکافردانانیان‌و، خوێن ڕشتنیان بەناوی ئایینەوە! لەنێو مسوڵمانان‌و ئەهلی قیبلەدا، لەوانە خراپتر نیە، یان دەگمەنە! ئنجا بۆیەش پێم وایە پەرگیران -بەڵام بەمانای تەواوی پەرگیریی- لەنێو ئەهلی ئیسلامدا خراپترین کەسن، وێڕای ئەو بەڵگەیەی هێنامەوە، چونکە پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) لەبارەی (خوارج)ەوە، کە نموونەی هەرە زەقی پەرگیرانن، فەرموویەتی: (...**هم شَرُّ الخَلق والخليقة**) رواه مسلم: ٢٤٦٦، واتە: ئەوانە خراپترین کەسن‌و خراپترین دروستکراون.

لە ڕیوایەتێکی دیکەدا: (**هم شرُّ الخَلق – أو من أشَرِّ الخلْق-** ) رواه مسلم: ٢٤٥٣.

واتە:... ئەوانە خراپترین کەسن -یان لەخراپترین کەسانن-.

بەڵام بێگومان: ئەو وەسفی خراپترین کەس بوونی نێو ئومەت، بەسەر هەموو پەرگیراندا ناچەسپێ، بەڵکو تەنیا ئەوانەیان دەگرێتەوە، کە لەپەرگیرییدا گەیشتبنە لووتکە، کە ئەویش لە کوشتنی مسوڵمانان‌و بەکافردانانیاندا، بەرجەستەیە، چونکە بێگومان پەرگیرییش نە تەنیا یەك جۆرەو،نە هەرکام لە جۆرەکانیش هەریەك پلەیە، بەڵکو جۆراوجۆرەو، هەرجۆرێکیشی پلەپلەیەو، هەر پلەیەش حوکمی خۆی هەیە.

## ٢٠/ فەوتانو سەربەفەتارەت چوون:

ئەمیش شوێنەوارو دەرهاویشتەیەکی دیکەی پەڕگیرییەو، بێگومانیش کەسانێك ئەو هەموو سیفەتو ڕەفتارە بەدوخراپانەیان هەبن، هەرفەوتاو و مالۆێرانن.

هەربۆیەش پێغەمبەری خوا(صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) لەبارەی پەڕگیرییەوە، فەرموویەتی:

(...**وإياكم والغلوَّ في الدين فإنّما أهلك من كان قبلكم الغلوُّ في الدين**) رواه أحمد (٢١٥/١)، وابن خزيمة (٢٨٦/٤)، وابن ماجه: ٣٠٢٩، والحاكم (٤٦٦/١).

واتە: ...وەخۆتان لە پەڕگیریی لەئایینـدا بپارێزن، چونکە بێگومان ئەوانەی پێش ئێوە، تێپەڕاندن لەدینداریی‌دا فەوتاندنی.

هەروەها لەبارەی سەرەنجامی شوومی پەڕگیرانەوە، کە بریتییە لەسەربەفەتارەت چوون، فەرموویەتی:

(**هَلَكَ المتنَطِّعون – قالها ثلاثاً**) رواه مسلم: ٢٦٧٠، وأبو داود: ٤٦٠٨.

واتە: پەڕگیران فەوتان، یان: بفەوتێن، -سێ جاران وایفەرموو-.

(النووي) یش ئاوامانای وشەی (المتنطّعون) لێکداوەتەوە:(أي: المتعمِّقون المغالون المجاوزون للحدود، في أقوالهم وأفعالهم) شرح صحيح مسلم،ج١٦ص٢٢٠.

واتە: یانی: ڕۆچوو تێپەڕێنەرانو سنوور بەزێنان، لەقسەو کردارياندا.

لێرەشدا کۆتایی بەتوێژینەوەکان لەبارەی شوێنەوارو دەرهاویشتە خراپەکانی پەڕگیریی دێنینو، دەچینە سەر ئالقەی پێنجەمو کۆتایی، ئەم زنجیرەیە کە باسی چۆنیەتی چارەسەری پەڕگیرییە!

# دەستپێك

خوێنەری بەڕێز!

بێگومان دیاردەی پەڕگیریی (ظاهرة التطرف) دیاردەیەكی ئاڵۆزەو هۆكاری جۆراوجۆری هەن، هەربۆیەش چارەسەریشی ئاسان نیەو، پێویستە ڕێبازو شێوازی جۆراوجۆری بۆ بگرینەبەر.

منیش پاش تێوەڕامانێكی زۆری ئەوبابەتە، پێموایە بۆچارەسەری پەڕگیریی‌و توندوتیژیی (التطرف والعنف) پێویستە ئەو دە (١٠) ڕێبازو شێوازانەی خوارەوە، ڕەچاو بكرێن:

**یەكەم:** تێگەیاندن‌و پێگەیاندنی ڕاست‌و هاوسەنگی مسوڵمانان.

**دووەم:** جەختكردنەوە لەسەر میانجێتیی ئیسلام.

**سێیەم:** بەرپەرچدانەوەی پەڕگیریی‌و، هەڵوەشاندنەوەی بنەما فیكرییەكانی.

**چوارەم:** نەهێشتنی ستەمی جۆراوجۆری نێو كۆمەڵگا.

**پێنجەم:** چاوبەخۆدا گێڕانەوەی حیزب‌و ڕژێمە سیكۆلاریستەكان، لەدژایەتیی ئیسلامدا، چ وەك فیكرو عەقیدە، چ وەك ڕەوشت‌و بەهابەرزەكانی.

**شەشەم:** ڕێگادان بەتەوژمی ئیسلامیی هاوسەنگ‌و پەرچ نەخستنە ڕێی.

**حەوتەم:** گێڕانەوەی متمانەو باوەڕی خەڵك، بەدامەزراوە ئایینیە فەرمییەكان.

**هەشتەم:** هەڵەی خۆ ڕاستكردنەوەی زلهێزان، لەبەرانبەر تەوژمی ئیسلامییدا.

**نۆیەم:** چارەسەرکردنی کێشەکانی جیهانی ئیسلامیی، کە مسوڵمانان دەورووژێنن، وەك: کوردستان، فەلەستین، کشمیر، بۆرما (ئەراکان)...

**دەیەم:** بەرەنگاربوونەوەی پەرگیرانو سزادانیان،لەکاتی دەستدرێژیی کردنیاندا.

ئاشکراشە هەرکام لەو ڕێبازو شێوازانە، ئەگەر بویستریٚ مافی خۆیانیان پیٚ بدریٚ، کتێب یان لانی کەم نامیلکەیەکی سەربەخۆی دەویٚ، بەڵام ئێمە وەك عادەتی خۆمان، هەوڵدەدەین بەکورتی و پوختیی لەوبارەیانەوە بدوێین.

## یەکەم: تێگەیاندن و پێگەیاندنی ڕاستو هاوسەنگی مسوڵمانان:

وەك چۆن خراپو هەڵە لێتێگەیشتنی ئیسلامو، لاتەڵو لاسەنگ لەسەری پەروەردەبوونی، هۆکارێکی سەرەکیی سەرهەڵدانی پەرگیریی و تەشەنەکردنیەتی، بەپێچەوانەوەش: ڕاستو دروست تێگەیشتنی ئیسلامو، هاوسەنگ لەسەری پەروەردەبوونی، یەکێکە لەڕێبازو شێوازە گرنگو کاریگەرەکانی، سەرەتا: ڕێ لێگرتنی پەرگیریی و نەهێشتنی سەرهەڵدانیو، دواتریش چارەسەکردنیو بنبڕکردنی.

ئنجا ئاشکراشە کە ڕاست تێگەیشتن(الفهم الصحيح) بناغەی چاك پەروەردە بوون(التربية الجيدة)ەو، وێناکردن (تصوّر) چاوگی هەڵسوکەوت (تَصَرُّف)ە.

مەبەستیشمان لەڕاستو دروست تێگەیشتنی ئیسلام، ئەوەیە کە بەوجۆرە ئیسلام بناسینو پێی ئاشنابین، کە لەقورئانو سوننەتدا بەرجەستەیە، چونکە بێگومان ئیسلام بێجگە لەوەحیی خوای بەرجەستە لەقورئانو سوننەتدا، شتێکی دیکە نیەو، قسەو بیروڕاو ئیجتیهادە جۆراوجۆرەکانی زاناو پێشەوایانمان، هەرکەسێك بن، تەنیابە تێگەیشتنی ئەوان لەبارەی ئیسلامەوەو، بەئەزموونی ئەوان لەبواری دینداریيدا، دادەنرێ، نەك بەخودی ئیسلامو ئایین.

باشترین پێوەریش لەبواری ڕاستو دروست تێگەیشتنی ئیسلامدا، ئەوەیە کە سەرنجی قورئان بدەین، ئەو قورئانەی کە خوای کاربەجێ لەبارەیەوە فەرموویەتی: ﴿ ....وَبِٱلۡحَقِّ أَنزَلۡنَٰهُ وَبِٱلۡحَقِّ نَزَلَ..﴿١٠٥﴾ ﴾الإسراء.

واتە: بەشێوەیەکی هەق قورئانمان ناردۆتە خوارو، هەقیشی لەنێوخۆیەوە گرتوە، کە دابەزیوە.

هەروەها فەرموویەتی:﴿ وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًا ﴿١١٥﴾ ﴾ الأنعام.

واتە: وشەی پەروەردگارت لەڕاستیی‌و دادگەریی دا تەواوی كردوە.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿ اللَّهُ الَّذِي أَنزَلَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ وَالْمِيزَانَ ﴿١٧﴾ ﴾ الشورى.

واتە: خوا كەسێكە كتێبی (قورئان)ی بەهەق دابەزاندوەو تەرازووشی دابەزاندوەو تەرازووشی دابەزاندوە.

بەڵێ پێویستە بۆڕاست‌ودروست تێگەیشتنی ئیسلام، سەرنجی قورئان بدەین‌و، بەپێی گرنگیی‌و بایەخدانی قورئان‌و ئەوپانتایی یەی كە تەرخانی كردوە، بۆ هەر بابەت‌و مەسەلەیەك، ئێمەش لەڕیزبەندیی (ترتیب)ی دانانماندا، بۆ لایەن‌و ئەركەكانی ئیسلام، ڕەچاوی بكەین.

با بۆ ڕوونكردنەوەی مەبەست چەند نموونەیەك بێنینەوە:

١- بابەتی (ئیمان) بەگشتی‌و بەتایبەت ئیمان بەخواو بەڕۆژی دوایی (الإيمان بالله واليوم الأخر) پانتاییەكی زۆر فراوانی بۆ دانراوەو، لەزۆر شوێنی قورئاندا، بەشێوازی جۆراوجۆرو بە بۆنەی جیاوازەوە، دووبارە بۆتەوەو، سەدان ئایەتی بۆ تەرخان كراون، بەڵام بابەتی میرات (موضوع الميراث) تەنیا سێ ئایەتی بۆ تەرخانكراون، لە سوورەتی (النِّساء)دا، كە ئایەتەكانی: (١١و ١٢و ١٧٦)ن.

٢- لەنێو بابەتی ئیمان دا – بەهەر پێنج پایەكەیەوە- زۆرترین گرنگیی بەمەسەلەی خوابە یەككرتن (التوحيد)دراوە، بەهەرسێك بەشەكەیەوە:

١- بەدیهێنەرایەتیی‌و پەروەردگارێتیی.

٢- ناوو سیفەتەكان.

٣- پەرستراوێتیی (الخالقية والربوبية، الأسماء والصفات، والأُلوهية).

٣- لەنێو مەسەلەی ناوسیفەتەکان دا، پانتاییەکی زۆر بۆ خستنەرووی سیفەتەکانی وەك: الرحمة، العلم، القدرة، الخلق، الإبداع... الخ، تەرخان کراوە، بەلاّم لەچەند ئایەتێکی کەمو دەگمەن دا، چەند وشەیەك بەکارهێنراون، کەدوایی بەشێك

لەزانایان کردوویانن بەناوونیشانێکی گەورە، بەحیسابی خۆیان بۆچەندسیفەتێکی خوا،بەناوی(الصفات الخَبَرية)ئەو وشانەش، وەك: {يد، قبضة، يمين، ساق، عَيْن، جَنْب....}

٤- پانتاییەکی زۆر لەئایەتەکانی قورئاندا، بۆ باسی بەهاورەوشتە بەرزو پەسەندەکانی وەك: ڕاستگۆیی، خۆڕاگریی، لێبوردەیی، دادگەریی، بەزەیی، فیداکاریی بەسەرومالْ لپێناوی خوادا... هتد، تەرخانکراوە، بەلاّم چەند مەسەلەیەکی وەك: ڕیش هێشتنەوەو، دامێن هەڵپێچان (التشمير)ی پیاوانو، پێچەگرتنەوە (إنتقاب)ی ئافرەتان، هیچ باسو خواسێکیان لەقورئان دا نیە –بەلاّم لەسوننەت دا باسکراون- کەچی هەندێك کەس لەم ڕۆژگارەدا، هێندەیان زەق کردوونەوە، کەسێك شارەزای ئیسلام نەبێ، ڕەنگە وابزانێ لەڕیزی پایەکانی ئیمانو، ئەرکە گەورەکانی شەریعەتن!!

ئنجا بۆیە پێم وایە:

هەنگاوی یەکەم بۆ ڕێگرتن لەپەرگیریی‌و پاشان بنبڕکردنی، بریتیە لەکارکردن لەسەر تێگەیاندنو پێگەیاندنو پەروەردەکردنی مسوڵمانانی، بەپێی ئەو نەخشە ڕێ‌و شوێنەی کە قورئان دایناوەو، ڕیزبەندکردن (ترتيب)ی گرنگیی دانمان، بەبابەتو بوارەکانی دینداریی، بەگوێرەیی گرنگیی‌و بایەخ پێدانی قورئان پێیانو، تەرخانکردنی پانتایی (مساحة) بۆیان.

چونکە بێگومان پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ)، هاوەڵە بەڕێزەکانی خۆی– کە بەدڵنیاییەوە بەگشتی لەهەموو پشتەکانی (أجيال)ی ئۆممەت، باشترو

ڕاستتر لەئیسلام تێگەیشتوونو لەسەریشی پێگەیشتوون، هەربۆیەش لەهەموویان پتر حاڵەتی هاوسەنگیی (إتِّزان)یان تێدا بەرجەستە بووە- بەڵێ پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) هاوەڵەكانی خۆی تەنیا لەسەر بناغەی قورئانو بەقورئان تێگەیاندوەو پێگەیاندوەو، جگە لە قورئان سەرچاوەیەكی دیكەی لەبەردەست دا نەبووە، ئنجا وەك دایكی بڕواداران (عائشة)ش گوتوویەتی:(**كان خُلُقُ نبيِّ الله القرآن.**)رواه مسلم: ٧٤٦.

واتە: ڕەوشتوئاكاری پێغەمبەری خوا قورئان بوو.

كەواتە: بەرنامەو ڕێبازی هەڵسوكەوتو ئاكاری تاكییو خێزانییو كۆمەلایەتییو سیاسیی پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) قورئان بووە.

ئنجا سوننەتی پێغەمبەریش بە دەقی قورئان، تەنیا بریتییە لەڕوونكردنەوەی چۆنیەتی جێبەجێكردنو پراكتیزە (تطبيق)كردنی قورئان، وەك خوا عزوجل فەرموویەتی: ﴿ ....وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾ النحل.

واتە: هەروەها زیكرمان بۆلای تۆ ناردۆتەخوار، تاكو ئەوەی بۆیان دابەزێندراوە، بۆیان ڕوون بكەیەوە، بەڵكو خۆشیان بیربكەنەوە..

ئنجا پێویستە ئەوەش بزانرێ، كە كتێبو بەرهەمەكانی زانایان، لەهەر بوارو لایەنێكی دینو ژیندا نووسیبیانن، مۆركی سەردەمو ڕۆژگاری خۆیانیان پێوەیەو، ئەو هاوسەنگییەی لەخودی شەریعەت (قورئانو سوننەت)دا هەیە، لەوان دا نیەو، هیچ زانایەكیش لەو بنچینە بەدەرو هەلاوێرراو نیە: (غزّالي) و (إبن تيمية) و (محمد بن عبدالوهاب) و (سعيد نورسيى) و (أبو الأعلى المودودي) و (سيد قطب) و (إبن باز) و (ناصرالدين الألباني) و... هتد، خوا لەهەموویان خۆشبێ.

كەواتە: كتێبو بەرهەمی هیچ زانایەك بەدیل نیە بۆ قورئانو سوننەت!

هیچ گومانیشم لەوەدانیە کە: هۆکارێکی گەورەی هەڵەولاسەنگ لەئیسلام حاڵیبوون‌و پێ پەروەردەبوونی زۆرێك لەموسڵمانان، بەهەموو توێژو مەشرەبەکانیانەوە: مەلا، شێخ، صۆفیی، سەلەفیی، لایەنە ئیسلامییەکان... هتد بریتیە لەوە کە کتێب‌و بەرهەم‌و ئیجتیهادو تێگەیشتنی زانایانیان، کردۆتە بەدیلی قورئان‌و سوننەت!

**دووەم: جەختکردنەوە لەسەر میانجێتیی ئیسلام:**

ڕێبازو شێوازێکی دیکەی گرنگی ڕێگریی لەپەیدابوونی پەڕگیریی (غُلوّ)و، پاش پەیدابوونیشی، نەهێشتنو بنبڕکردنی، بریتییە لە خستنەرووی میانجێتیی (وسطية)ی ئیسلامو دژبوونی لەگەڵ هەردووك حاڵەتی بەزایەدانو تێپەڕاندن(التفريط والإفراط)، وەك خوای بەرزومەزن بەپێغەمبەری خاتەمی (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فەرمووە: ﴿ فَٱسْتَقِمْ كَمَآ أُمِرْتَ وَمَن تَابَ مَعَكَ وَلَا تَطْغَوْاْۚ إِنَّهُۥ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿١١٢﴾ ﴾ هود.

واتە: خۆتو ئەوانەی لەگەڵت گەڕاونەوە -بۆلای خوا- وەك فەرمانت پێکراوە، ڕاست وەستاوو دامەزراوبنو، سەرکێشیی مەکەن، بێگومان ئەو (خوا) بینەری کردەوەکانتانە.

دیارە ئەم ئایەتە، فەرمان بەڕاست وەستاویی (إستقامة) لەسەر شەریعەت دەکاتو، ڕێگریی لە سەرەڕۆییو سەرکێشیی (طغيان) دەکات، واتە: ( فَٱسْتَقِمْ كَمَآ أُمِرْتَ ) دژی کورتهێنانو بەزایەدان (التقصير والتفريط)ە، و(ولاتطغوا)یش دژی تێپەڕاندنو پەڕگیریی (الإفراط التطرُّف)ە.

ئنجا زۆر گرنگە کە ئەوانەی دەماری پەڕگیرییو زێدەڕۆیی کردنیان هەیە، باش حاڵی بکرێنو تێبگەیەنرێن کە حیکمەتو ئامانجی طاعەتو خواپەرستیی، بەندایەتیی کردنو ملکەچییە بۆ خوا (العبودية والخضوع لله) نەك خۆئازاردانو خۆ ئەزیەتدانو سەغڵەتکردن، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ مَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيَجْعَلَ عَلَيْكُم مِّنْ حَرَجٍ ...﴿٦﴾ ﴾المائدة.

واتە: خوا نایەوێ هیچ جۆرە سەغڵەتییەکتان -بەهۆی تاعەتەوە- بخاتەسەر.. لەبەسەرهاتی ئەو سێ کەسەشدا کە هاتنە ماڵەکانی پێغەمبەر (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) و پرسیاری تاعەتو عیبادەتی پێغەمبەریان لەهاوسەرەکانی کردو، پاش هەواڵپێدرانیان پێیان کەم بوو! ئنجا بڕیاریان دا کە: یەکێکیان: هەمیشەشەوگار بەشەو نوێژ بەرێتەسەرو نەخەوێ!

یەکیان: ڕۆژگار هەمووی بەڕۆژوو بێو، هەر نەیپسێنێتەوە!

یەکیان: هاوسەرگیریی نەکاتو هەر بەرەبەنیی بمێنێتەوە!

پێغەمبەریش پاش گوێ بیستبوونی هەواڵەکەیان فەرمووی:

**(أنتم الذين قلتم كذا وكذا؟ أما والله إني لأخشاكم لله وأتقاكم له، لكنيّ أصومُ وأُفطِر وأصلّي وأرقدُ، وأتزوَّج النساء، فمن رَغِبَ عن سنَّتي فليس مني)**رواه البخاري: ٥٠٦ ومسلم:١٤٠١.

واتە: ئێوەن کە ئاواوئاواتان گوتوە؟! ئاگاداربن! بەخوا من لەخواترسترینتانمو پارێزکارترینتانم بۆی، بەلاّم ڕۆژوو دەگرم _هی سوننەت-و ناشگرمو، شەونوێژیش دەکەمو دەشخەومو، هاوسەرگیرییش لەگەڵ ئافرەتان دەکەم، دەجا هەرکەس لەڕێبازی من لابدات، ئەوە لەمن نیە!

بەڵێ لەو بەسەرهاتەدا -کەپێشتریش هێناومانەو ماناشمان کردوە-

دەرسو پەندێکی مەزن بۆ پەرگیرانو سەختگیران هەیە، کە پێیان وایە هەتا زیاتر خۆیانو خەڵك سەغڵەت بکەن، باشتر لەخوا نیزیك دەکەونەوە!

بێ خەبەر لەوە کە:

لادان لەڕێبازی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) چ بە کورتهێنانو بەزایەدانو، چ بەپەڕگیریو لێتێپەڕاندن، مایەی لەخوا دووركەوتنەوەو، مایە پووچ (مُفْلِس) بوونی مرۆڤە.

هـەروەها (خـوارج)یـش جێـی پەنـدوعیبرەتێکی گـەورەن، چـونکە تێپەڕانـدن لەعیبادەت دا(المبالغة في التعبُّد)وەك پێغەمبەر لەبارەیانـەوە فەرموویـەتی: (**يحقر أحدكم صلاتَهُ إلى صلاتهم، وصيامَهُ إلى صيامهم**) رواه البخاري: ٣٥١٠ ومسلم: ٢٤٥٣.

نـەك هـەر هـیچ دادی نـەدانو شـەفاعـەتی بـۆ نـەکردن، بگـرە زۆریشـی لەسـەر قەرزدار بوونەوەو لەسەریشی سزا دەدرێن!





## سێیەم: بەرپەرچدانەوەی پەڕگیریی و هەڵوەشاندنەوەی بنەما فیکرییەکانی:

ئەمیش شێوازو ڕێبازێکی دیکەی کاریگەری بەرهەڵستیی کردنی دیاردەی پەڕگیرییە، چ لەسەرەتاوە بۆ ڕێگرتن لەسەرهەڵدانیو، چ دواتر بۆ بنبڕکردنیو نەهێشتنی.

هەربۆیەش پێغەمبەری خوا "(صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) لەڕۆژگاری خۆیدا، زۆر دەستگەرمانەو بەجیددیی لەگەڵ هەر حاڵەتێکی پەڕگیریی دا ڕووبەڕوو بۆتەوەو، هەوڵیداوە هەر بەچەکەرەیی هەڵیکێشێ، وەك لەڕابردوودا چەند دەقێکی سوننەتمان لەوبارەوە هێنانو، لێرە دووبارەیان ناکەینەوە.

ئنجا بەڕای من پێڕو تاقمە پەڕگیرەکانی ئەم ئەم ڕۆژگارەمان، بەهۆی بەهەڵە لێتێگەیشتنی حەوت مەسەلەوە، کەوتوونەتە گێژاوی توندوتیژییو پەڕگیرییەوە، کەئەمانەن:

١. جەنگو جیهاد.
٢. فەرمان بەچاکەو ڕێگریی لەخراپە.
٣. بناغە لەپەیوەندیی لەگەڵ نامسوڵمانان دا جەنگە، یان ئاشتیی؟
٤. بەکافردانانی مسوڵمانان.
٥. مامەڵەکردن لەگەڵ حوکمڕانان دا.
٦. پێکهێنانی قەوارەی سیاسییو دەوڵەت.
٧. جێ بەجێکردنی شەریعەت.

ئنجا لەسۆنگەی ئەوەوە کە ئێمە لەڕابردوودا تیشکمان خستۆتەسەر هەرکام لەو حەوت مەسەلەیە، لێرە دووبارەی ناکەینەوەو، زۆر بەکورتی و پوختی سەرو قسەیان لەبارەوە دەکەین:

## ١- جەنگو جیهاد:

**یەك**: جەنگ کردن لەپێناوی خوادا(القتال في سبيل الله) ئامڕاز (وسيلة)ەو، لەکاتی پێویستیی دا پەنای پێ دەبردرێ، نەك ئامانج بێو هەمیشە دەستی پێوەبگیرێ.

**دوو**: ئامانجی جەنگو جیهاد بەگشتی لابردنو بەرپەرچدانەوەی ستەمو دەستدرێژییە: ﴿ وَقَٰتِلُوهُمۡ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتۡنَةٞ ﴿١٩٣﴾ ﴾ البقرة.

**سێ**: بەڵگەو پاساو جەنگو جیهاد لەدژی کافران، ستەمو دەستدرێژیی یانە، نەك کوفریان: ﴿ وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمۡ وَلَا تَعۡتَدُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ﴿١٩٠﴾ ﴾ البقرة.

**چوار**: پێغەمبەری خاتەم بەرەحمەتەوە خەڵاتی مرۆڤایەتی کراوە، نەك بەشمشێرەوە!

وەك خوا فەرموویەتی: (وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٠٧﴾) الأنبياء.

هەروەها خۆیشی لەبارەی خۆیەوە (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فەرموویەتی: (**إِنَّما أنا رحمة مُهْداة**) أخرجه الحاكم وصححه (٣٥/١) ووافقه الذهبي.

واتە:من بەزەیی یەکی بەدیاریی نێرراوم (بۆ مرۆڤایەتیی).

## ٢- فەرمان بەچاكەو ڕێگریی لەخراپە:

**یەك:** پێویستە هەركام لەو چاكەیە كە فەرمانی پێ دەكرێ‌و، ئەو خراپەیە كە ڕێگریی لێدەكرێ، كۆڕای زانایانیان لەسەربێ‌و، ڕاجیایی (إختلاف)یەكی موعتەبەریان لەسەرنەبێ، هەڵبەتە بە ئەلیف‌و لام (أل)ەوە هاتنی هەردووك وشەی (معروف) و (منكر)یش بەڵگەیە لەو بارەوە: ﴿ وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ ۚ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴿١٠٤﴾ ﴾ آل عمران.

**دوو:** دەبێ ئەو خراپە (منكر)یەی هەوڵی لابردنی دەدرێ، ئاشكراو بینراو بێ، چونكە لە فەرموودەكە دا هاتوە: (**من رأى منكم منكراً، فَلْيُغَيِّرْهُ بيده**..) رواه مسلم: ٤٩.

واتە: هەركامێكتان خراپەیەكی بینی، بابەهێزی بیگۆڕێ..

**سێ:** دەبێ كەسێك كە هەوڵی لابردنی خراپەیەك دەدات، توانای كردەیی هەبێ‌و لەتوانایدا هەبێ، ئەگەرنا مولزەم نیەو لەسەری پێویست نیە، چونكە هیچ كەس بەبێ توانا هەبوون، هیچ ئەركێكی ناكەوێتە سەرشان:( لَا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ...﴿٢٨٦﴾) البقرة.

**چوار:** مەرجێكی دیكەی جێ بەجێ كردنی ئەو ئەركە شەرعییە، ئەوەیە كە بەهۆی ئەنجامدانییەوە، چاكەیەكی گەورەتر (معروف أكبر) لەوەی فەرمانی پێدەكرێ، نەفەوتێ، یان خراپەیەكی گەورەتر (منكر أكبر) لەوەی لادەبرێ، نەیەتە جێگای، ئەگەرنا زیانی لەقازانجی پتر دەبێ‌و دروست نیە.

**پێنج:** دەبێ فەرمان بەچاکەو ڕێگریی لەخراپە، بەشێوازێکی نەرمو نیانو ئەدەبێکی بەرزەوە ئەنجام بدرێ، وەك گوتراوە:(أْمُر بالمعروف بالمعروف، وانهَ عن المنكر لا بالمنكر).

## ٣- بناغە لە پەیوەندیی لەگەڵ نامسوڵماناندا، جەنگە یان ئاشتی؟!

بێگومان بناغەی پەیوەندیی مسوڵمانان لەگەڵ نامسوڵماناندا ئاشتییە، چونکە پێغەمبەرێك بەزەیی خوا بێ بۆ مرۆڤایەتیی: (وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٠٧﴾) الأنبياء.

ئنجا بەرنامەیەکی پێ دانێررابێ، یادخەرەوەی تێکڕای خەڵکی بێ: (إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرٞ لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴿٢٧﴾) التكوير، ناگونجێ بەبێ سەلامو کەلام، ئیعلانی جەنگ لەدژی مرۆڤایەتیەك بکات، کە دەیەوێ لەڕەحمەتو هیدایەتی خوا بەهرەمەندیان بکات!

خوای کاربەجێش بەڕوونو ڕاشکاویی فەرموویەتی: (فَإِنِ ٱعۡتَزَلُوكُمۡ فَلَمۡ يُقَٰتِلُوكُمۡ وَأَلۡقَوۡاْ إِلَيۡكُمُ ٱلسَّلَمَ فَمَا جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمۡ عَلَيۡهِمۡ سَبِيلٗا ﴿٩٠﴾) النساء.

واتە: .. ئنجا ئەگەر وازیان لێتان هێناو، لەدژتان نەجەنگینو، ئاشتییان بۆتان ڕاگەیاند، ئەوە خوا هیچ ڕێیەکی بۆ ئێوە لەدژیان نەهێشتۆتەوە[1].

---

[1]) لە بەشی سێیەمیشدا لە میانی باسی جەنگو جیهاددا، زیاتر تیشك دەخەینە سەر ئەم مەسەلەیە.

## ٤- بەکافردانان:

**یەك:** بەکافردانانی کەسێك کە شایستەی نەبێ، لەلایەن هەرکەسێکەوە بێ، وەك کافربوونی خۆی وایە، بەدەقی فەرموودەی پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّم): (**إِذا كفرَّ الرَّجلُ أخاه فقد باءَبها أَحَدُهما**) رواه البخاري: ٣٥٠٨ ومسلم: ٢١٢.

واتە: هەرکات پیاوێك برایەکەی بەکافردانا، ئەوە گوناهەکە بەمل یەکیاندا هاتوە، یانی: ئەگەر بابای بەکافر دانراو شایستەبێ، دەیگرێتەوە، ئەگەرنا گوناهەکە دەچێتە ملی بابای بەکافر دانەرانەوە.

**دوو:** ئنجا ئاشکراشە کە جاری وا دەبێ، قسەیەکی کەسێك یان ڕەفتارێکی، بەکوفر یان شیرك دادەنرێ، بەلاّم هەتا بنچینەی: هاتنەدی مەرجەکانو لاچوونی پەرچەکان: (ثبوت الشروط وانتفاءُ الموانع) نەچەسپێنرێو کاری پێنەکرێ، دروست نیە، ئەوکەسە بەکافر یان موشریك دابنرێ، ئەمە زانایانی لەسەری یەکدەنگن.

**سێ:** ساغکردنەوەی ئەوە کە فلاّنکەس، بەفلاّن قسەی، یان فلاّن کردەوەی، لەبازنەی ئیمانو ئیسلام چۆتە دەرێ، یان نا؟ مافی هەموو کەس نیەو، جگە لەزانایانی پسپۆڕو شارەزا، کەس بۆی نیە قسە لەوبارەوە بکات:

﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا قَبۡلَكَ إِلَّا رِجَالٗا نُّوحِيٓ إِلَيۡهِمۡۖ فَسۡـَٔلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلذِّكۡرِ إِن كُنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ٧ ﴾ الأنبياء.

## ٥- مامەڵەکردن لەگەڵ حوکمڕانادا:

**یەك:** هەر حوکمڕانێك خۆی بەمسوڵمان بخاتەڕوو، وەك هەر کەسێکی دیکە، پێویستە بەپێی ڕواڵەتی حاڵی حوکمی بدرێو، مامەڵەی لەگەڵدا بکرێ، بەپێی بنچینەی:(نحن نحكم بالظاهر، والله يتولّى السَّرائر)، واتە: ئێمە حوکم بەڕواڵەت دەکەینو نهێنییەکان حەواڵەی خوان، دیارە بەمەرجێك شتێکی وای لێ نەبینرێ، یان نەبیسترێ، کە هەڵوەشێنەرەوەی ئیسلام بێو، هیچ کام لە هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلام ( نواقض الإِسلام)ی تێدا نەبن.

**دوو:** بابای حوکمڕانی کافر، یان هەڵگەڕاوە، بەهیچ جۆرێك ڕەوایەتیی حوکمڕانیی(شرعية الحكم)ی بەسەر مسوڵمانان دانیەو، مسوڵمانان لەسەریان پێویستە، مادام بتوانن، لایبەرنو، بیگۆڕن.

**سێ:** بەلاّم ئەگەر توانایان نەبوو، پێویستە هەوڵی دابینکردنی هۆکارەکانی هێز بدەن، تاکو خۆیان لەو واقیعەناشەرعییە قوتار بکەن، ئنجا هەرکەسێك لەوبارەوە هەوڵبداتو توانای خۆی بخاتەگەڕ، ئەوە گوناهباریی لەسەرلادەچێ، هەرچەندە واقیعەکەشی بۆنەگۆڕابێ.

## ٦- پێکهێنانی قەوارەی سیاسیی و دەوڵەت:

**یەك:** لەسەر مسوڵمانان فەرزە قەوارەیەکی سیاسیی سەربەخۆیان هەبێ، کە شەریعەتی تێدا جێ بەجێ بکەن: (أَنْ أَقِيمُوا۟ ٱلدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا۟ فِيهِ ﴿١٣﴾) الشوری. واتە: کە ئایین بەرپا بکەنو تێیدا پەرتەوازە نەبن.

**دوو:** تاکە شێوازی بنیاتنانی قەوارەی سیاسیی لەئیسلامدا، ئەوەیە کە کۆمەڵگایەکی مسوڵمان بەویستی ئازادانەی خۆی ئەو بڕیارەبدات، چونکە بەهیچ جۆرێك سەپاندنی ئایین بەسەر خەڵکدا ڕەوانیە: ﴿.. لَآ إِكْرَاهَ فِى ٱلدِّينِ...﴿٢٥٦﴾﴾ البقرة. واتە: تۆبزیی کردنو ناچارکردن لە ئاییندا نیە.

**سێ:** کارو پرۆژەیەکی ئیسلامیی، پێویستە بەرلەوەی بیر لە قەوارەی سیاسیی بکاتەوە، بۆ جێ بەجێکردنی شەریعەت،

لەبوارەکانی ئابووریی و سیاسیی و کۆ مەڵایەتیی دا، بیر لە تێگەیاندنو پێگەیاندنی کۆمەڵگا بکاتەوە، لە ڕووی: بوونناسییو، تێڕوانینو بەهایەکانو پێوەرەکانو، ئیمانو عەقیدەو، خوا پەرستییو، ڕەوشتو ئاکاردا، چونکە ئیسلام بەرلەوەی بەرنامەی هەق (دین الحق)بێ، ڕێبازی ڕاست (هدی)یەو، بەبێ وەرگیرانی هیدایەتیش لە لایەن تاکەکانەوە، ئایینیی هەق پیادە ناکرێ، ئەگەر گریمان دەستەلاتیش هەبێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ ٱلْحَقِّ ....﴿٣٣﴾﴾ التوبة: ٣٣ ــ الفتح -٢٨-الصف-٩- . واتە: (خوا) ئەو کەسەیە کە پێغەمبەری خۆی بەرێنماییو بەرنامەی هەقەوە ڕەوانە کردوە..

## ٧- جێ بەجێ کردنی شەریعەت:

**یەك:** وشەی شەریعەت (شريعة) کاتێك بەرەهایی بەکاردێ، یەکسانە بەئیسلام بەگشتی، بەڵام ئەگەر لەگەڵ ئیمانو عەقیدە دا بەکاربێ، ئەوە لایەنی کردەیی و پراکتیکیی ئیسلام دەگرێتەوە: ﴿ ثُمَّ جَعَلْنَاكَ عَلَىٰ شَرِيعَةٍ مِّنَ الْأَمْرِ فَاتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَ الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨﴾ ﴾ الجاثية.

**دوو:** جێ بەجێ کردنی شەریعەت (تطبيق الشريعة) -بەمانای فراوانی شەریعەت- بەرلەوەی جێبەجێ کردنی بڕیارویاسایەکانیو سزایەکانی بێ، بریتیە لەچەسپاندنی چەمكو بەهابەرزەکانی

لەعەقڵو دڵی خەڵك داو، پەروەردەکردنیان بەپێی ڕێنمایی یەکانی، وەك پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) بە (معاذ بن الجبل)ی فەرموو کاتێك ناردی بۆ یەمەن:

(**إنك تَقْدَمُ على قومٍ أهل كتاب، فَلْيكن أوَّل ما تدعوهم إليه: عبادةُ الله عزوجل، فإذا عرفوا الله، فأخبِرْهم أن الله فَرَضَ عليهم خَمْسَ صلواتٍ في يومهم وليلتهم، فإذا فعلوا ذلك، فأخبِرْهم أنَّ الله قد فرض عليهم زكاة تؤخذ من أغنيائهم، فتُرَدُّ على فقرائهم...**) رواه البخاري: ١٣٩٥، ومسلم: ١٢٣.

وەك دەبینین پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فەرمان بە (معاذ) دەکات کە پلە پلەیی (تَدرُّج) ڕەچاوبکاتو، سەرەتا بۆ خوا پەرستییو ئیمانو، پاشان پێنج فەرزەکانی نوێژو، دوایی زەکاتو ماڵ بەخشین، بانگیان بکات.

**سێ:** جێ بەجێ کردنی شەریعەت لەسزادانی خەڵکەوە دەست پێ ناکات، بەڵکو لەفێرکردنو پەروەردەکردنیانو، پاشان دابینکردنی پێداویستییەکانیانەوە، دەست پێدەکاتو، دوایین شت کە لەشەریعەت جێ بەجێ دەکرێ، سزاو سنوورەکاننی، نەك بەوان دەستپێبکرێ!

## چوارەم: نەهێشتنی ستەمی جۆرا وجۆری نێو کۆمەڵگا:

هەمیشە تێکچوونی کۆمەڵگایەکان، زادەو بەرهەمی ستەمو بێدادییە، وەك خـوای دادگـەر فەرموویـەتی: ﴿وَمَا كُنَّا مُهْلِكِي ٱلْقُرَىٰٓ إِلَّا وَأَهْلُهَا ظَٰلِمُونَ ۝٥٩﴾ القصص.

واتە: ئێمە ئاوەدانییەکان نافەوتێنین، مەگەر خەڵکەکەیان ستەمکار بن..

هەر بۆیەش یەکێك لەو ڕێبازانەی کەدەبێ بگیرێنەبەر، بۆ سەرەتا: ڕێگرتن لەپەرگیریی و توندوتیژیی و، پاش سەرهەڵدانیشی: بنبڕکردنی و نەهێشتنی، بریتیە لە پاکسازیی و چاکسازیی تێداکردنی کۆمەڵگاو بژارکردنی لەهەموو جۆرەکانی ستەموجەور:

کۆمەلایەتیی، ئابووریی، سیاسیی، نەتەوەیی، طائیفیی، حیزبیی، ..هتد.

بەڵێ، پێویستە بزانرێ کە ستەمو بێ دادیی و، فەرق و جیایی پێکردنی توێژەکانی خەڵك و کۆمەڵگا، لەسەر بناغەی ئینتیمای حیزبیی و نەتەوەیی و تائیفەو تیرەوهۆز، هەروەها گەندەڵیی و قۆرخکاریی، پشك و بەشێکی گەورەی هەیە لەسەرهەڵدانی پەرگیریی و پەنابردنە بەر توندوتیژییدا، بۆ تۆڵەستاندنەوە لەو کۆمەڵگاو دەستەڵات و واقیعەی، کە بابای هەستکەر بەستەمو جەور، بەسەرچاوەی ستەمو بیدادیی دەزانێ و، بەحیسابی خۆی دەیەوێ بیگۆڕێ و لەگۆڕی بنێ!

## پێنجەم: چاوبەخۆداگێڕانەوەی حیزب و ڕژێمە سیکۆلاریستەکان، لەدژایەتیی کردنی ئیسلامدا، چ وەك فیکرو عەقیدە، چ وەك ڕەوشتوبەهابەرزەکان:

عەقڵ و لۆژیك ئەوە دەخوازێ، کە هەرکەسێك دڵسۆزی خەڵكو ولاتی بێ، دەبێ ڕێز لەئایینو ناسنامەکەیان بگرێ، نەك دژایەتیی بکاتو چاوی پێی هەڵنەیەت!

کەبەداخەوە بەشێك لە سیکۆلاریستە پەرگیرو توندوڕەوەکانی ولاتانی ئیسلامیی، لەو جۆرەن، چ کاتێك کە ڕێکخراوو حیزبی سیاسیینو، چ کاتێکیش کە دەستەلات بەدەستەوە دەگرنو دەبنە حکوومەت!

ئنجا من لێرەوە دەڵێم: ئەگەر حیزبو ڕژێمە سیکۆلاریستەکان ڕاست دەکەن، دڵسۆزی خەڵكو ولاتیانن، دەبێ ڕێزی ئایینو عەقیدەی کۆمەلگاکەیانو، ئەدەبو ڕەوشتو بەهابەرزەکانی بگرنو، بیانوو نەخەنە دەستی کەسانێکی تەنگەپرێسکەو بیرکرچوکاڵو سەرکێڵ، کە لەکاردانەوەی ئەوان دا، پەنابەرنە بەر توندوتیژییو پەرگیریی‌و سەرەنجام پەندی: (نە ولاخە نەبارە، بەهەردووك لایان دا خوارە) بەسەر هەردووك لایان (واتە: حیزبو ڕژێمە پەرگیرە سیکۆلاریستەکانو، گرووپە پەرگیرەکان)دا بچەسپێ!

شتێکی ئاشکراشە کە کاتی خۆی – لەسالانی حەفتایەکان دا- گرووپی (التکفیر والهجرة) لەهەناوی زیندانە تاریكو پڕ ئازارو ئەشکەنجەکانی ڕژێمی دیکتاتۆریی‌و عەسکەرتاریی سیکۆلاریستی (جمال عبدالناصر) و (أنور السادات)ەوە هاتەدەر! هەربۆیە ئەگەر بمانەوێ، تووشی بێ ئینسافییو نادادگەریی نەبین، پێویستە وێڕای توندڕەوییو پەرگیریی هەندێك لەگرووپە ئیسلامییەکان، پەرگیریی‌و توندوتیژییو دڕندەیی، حیزبو ڕژێمە سیکۆلاریستەکانیش ببینین، ئاخر

چۆن دەبێو چ ڕەوای هەقە، کاردانەوە (رَدّ الفعل) ببینین، بەلاّم ئەو کردەوە (فعل)یە نەبینین، کە مایەی پەیدابوونی کاردانەوەکەیە؟!! ئەوە هەمووی لەلایەکەوەو، لەلایەکی دیکەشەوە:

ئایا سیکۆلاریستەکان بەدیلیان بۆ ئیمانو عەقیدەی ئیسلامییو، ئەدەبو ڕەوشتو بەهابەرزەکانی چییە؟!

ئایا نازانن کە بەشەر بەگشتی، لە جگە لە ئیسلامدا، بووناسییو ئیمانو عەقیدەیەکی ڕاستو، لەگەڵ عەقڵو زانستو فیترەتدا گونجاو، ئەدەبو ڕەوشتو بەهابەرزەکانی، چنگ ناکەوێ؟!

## شەشەم: ڕێگادان بەتەوژمی ئیسلامیی هاوسەنگو، پەرچ نەخستنەڕێی:

وەك چۆن لەکاتێکدا ڕێ لەکانیو سەرچاوەیەکی ئاو دەگیرێ، کە بەشێوەیەك خوارسكو ئاسایی ئاوەکەی دەرقولێنێ، دواتر بەشێوەیەکی نائاساییو ناسروشتی ئاوەکەی دێتەدەرو هەڵدەقولێ، بەهەمان شێوەش لەکاتێکدا، ڕێ لە تەوژمی ئیسلامیی هاوسەنگ (التيّار الإسلامي المعتدل) دەگیرێ، بگرە شەڕی پێ دەفرۆشرێو گێچەڵی پێدەکرێ، وەك لەزۆرێك لەوڵاتانی مسوڵماننشیندا هەیە، کەسانێکی کەم شارەزاو بێ حەوسەڵەو دڵگەرم، کە خۆیان لەژێر گوشاری ئەو بارودۆخە ناهەموارەدا، ڕاناگرن، پەنا دەبەنە بەر شێوازی توندوتیژو پەرگیرانە، کە سەرەنجام هەمولایەك زەرەر مەند دەبن!

بەڵێ لەکاتێك دا کە تەوژمی ئیسلامیی هاوسەنگی قەناعەتدار، بەپێکەوە ژیانو تەبایی لەگەڵ کۆمەڵگادا بەگشتیو، لایەنە سیاسییەکاندا بەتایبەت، کە دەچێتە مەیدانی بانگەوازو خەباتی فیکرییەوە، سجن دەکرێو، کاتێکیش دەچێتە مەیدانی خەباتی سیاسییو، بەشداریی هەڵبژاردنەکان دەکاتو دەیباتەوە، کودەتای بەسەردا دەکرێ، وەك:

لەسەدەی ڕابردوودا لە: جەزائیرو تورکیاو، لەم سەدەیەش دا لە: فەلەستینو میصردا ڕوویدا.

ئەو هەڵوێستو ڕەفتارە پەرگیرانەیەی حیزبو ڕژێمە عەلمانییە خۆسەپێنەکان، کەسانێك وادارو ناچار دەکات، کە لەسۆنگەی هەست کردنیانەوە بەبەنبەست گەیشتنو نائومێدییەوە، بیر لەهەموو شێوازێکی ڕوو بەڕووبوونەوەی ئەو ستەمو فشارەبکەنەوە، کە لەگەڵیدا دەستەویەخەن.

هەڵبەتە من لێرەدا نامەوێ پاساو بۆ توندوتیژیی‌و پەڕگیریی بهێنمەوە، بەڵکو بەس دەمەوێ تەفسیری بکەم‌و، پێشم وایە پەندی: (نۆ گای خۆی بەگایەکی خەڵکەوە لە گاگێرەدا دەخنکێنێ) کت‌ومت بەسەر هەڵوێستی حیزب‌و ڕژێمە سیکۆلاریستە پەڕگیرەکان دا دەچەسپێ، کە لەڕق‌و لەکاردانەوەی کارو کاروان‌و تەوژمی ئیسلامیی هاوسەنگدا، کارێك دەکەن بازاڕی گرووپە پەڕگیرو توندوتیژەکان قەڵەبالَغ بێت‌و، سەرەنجام خۆیشیان‌و تەوژمی ئیسلامییش‌و کۆمەڵگاش بەگشتی زیانبار بێ!

## حەوتەم: گێڕانەوەی متمانەو باوەڕی خەڵك، بەدامەزراوە ئاینییە فەڕمییەکان:

ئـەمیش هۆکـارو هـەنگاوێکی دیکـەی کاریگـەرە، بـۆ ڕێگـرتن لەپـەڕگیریی‌و، بنبڕکردن‌و نەهێشتنی.

چـونکە بێگومـان دەسـتتێوەردان (تـدخّل)ی حیـزب‌و ڕژێمـە عـەلمانییـەکان، بـۆ دام‌ودەزگا فەڕمییەکانی ئایین، چ لەسەر ئاستی جیهـانی ئیسـلام، وەك (الأزهـر)و، چ لەسـەر ئاسـتی هـەر وڵاتێـك وەك: دەسـتەی فـەتوادان‌و وەزارەتـی ئـەوقاف‌و، یەکیەتی زانایان‌و، لیژنەی فەتواو... هتد، وایکردوە کە خەڵك‌و جەماوەر متمانەی پێیان نەمێنیٚ‌و، لێیان دووربکەوێتەوە.

بۆیە پێویستە بە هەوڵ‌و هیممـەتی هەموولایـەك کارێـك بکـرێ، کـە نیشـانەی پرسیار لەسەر ئەو دامـەزراوەو دەزگا فەڕمییانە لابچێ‌و، وابن کە خەڵك‌و جەماوەر باوەڕی پێیان هەبێ‌و، قسەو بڕیارو فەتوانیان، بەدڵنیاییەوە لێوەر بگرێ.

هەڵبەتە ئەگەر حیزب‌و ڕژێمە عـەلمانییەکانیش بەئینسافەوەو دووربینانە سـەرنج بدەن دڵنیا دەبن کە سوودو قازانجە حیزبیی‌و سیاسـییە تەسـك‌و گچـکەکانیان، کـە بـەهۆی کـۆنترۆڵکردن یـان دەسـت تێـوەردانی دامـەزراوەو دەزگـا فەڕمییەکانـەوە، دەستگیریان دەبن، گەلێك بچووکترو کەمترن، لەو زیانەزۆرو زەوەندو زەبەلاحانـەی، بەهۆی بێ ئیعتیبارکردن‌و لەنێوەڕۆك خاڵی کردنەوەی ئەو دامـەزراوەو دەزگایانەوە، خۆیـان‌و کۆمـەڵگاکـەیان، دەیانکـەن، بـەلاّم بەداخـەوە دەردی کـورتبینیی‌و تەسـك بینیی‌و خۆویستیی (أنانية) دەردێکە، مرۆڤـ، کوێروکـەڕ دەکـات، وەك گـوتراوە: ( حُبُّكَ الشيَ يُعْمي ويُصمّ)!

## هەشتەم: هەڵەی خۆڕاستکردنەوەی زلهێزان، لەبەرانبەر تەوژمی ئیسلامییدا:

وەك لەکاتی خستنەڕووی هۆکارەکانی سەرهەڵدانو تەشەنەکردنی دیاردەی پەرگیریی و توندوتیژیی لەنێو مسوڵمانانندا، باسمان کرد:

یەکێك لەهۆکارەکانی، بریتیە لە: ستەمو دەستدرێژیی جۆراوجۆری زلهێزە ڕۆژئاوایی و ڕۆژهەڵاتییەکانە، بەرانبەر بەجیهانی ئیسلام بەگشتیی و، تەوژمی ئیسلامیی بەتایبەت.

بۆیە دەتوانین بەدڵنیاییەوە بڵێین:

ڕێبازو شێوازێکی دیکەی گرنگو کاریگەر سەرەتا: بۆ ڕێگرتن لەسەرهەڵدانو، پاشان بۆ نەهێشتنی پەرگیریی و تێپەڕاندنو توندوتیژیی لەنێو مسوڵمانانندا، بریتیە: لە چاو بەخۆداگێڕانەوەی زلهێزانو ڕاستکردنەوەی هەڵوێستی لاروستەمکارانەیان، لەمامەڵەکردنیان لەگەڵ تەوژمی ئیسلامیی دا، کە مەبەستم پێی ئەو تەوژمە ئیسلامییە هاوسەنگەیە، کە بڕوای بە خۆڕاگریی لەسەر ئازارو مەینەتیی خەڵكو کۆمەڵگاو، تەبایی و پێکەوە ژیان هەیەو، دەیەوێ لەڕێی متمانە پێکردنی خەڵكو دەنگ پێدانییەوە، ڕەوایەتیی حوکمڕانیی (شرعية الحكم) وەربگرێ، نەك لەڕێی بەکارهێنانی هێزەوە، کە هیچ کام لەپێغەمبەران عليهم السلامو بەتایبەت خاتەمو سەروەریان موحەممەد (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) شێوازی توندوتیژو، بەکارهێنانی هێزی نەگرتۆتەبەر، بۆ گۆڕینو پاکسازیی و چاکسازیی تێداکردنی کۆمەڵگا.

هەڵبەتە دژایەتیی زلهێزانی ڕۆژئاوایی و ڕۆژهەڵاتییش، بۆ تەوژمی ئیسلامیی و، پشتگیریی و لایەنگیریی بۆ ناحەزو نەیارەکانیان، بەتایبەت قەوارەی زایۆنیی و، هێزو ڕژێمە سیکۆلاریستو میراتییە خۆسەپێنو دیکتاتۆرییەکان – وەك پێشتریش

ئاماژەمان پێداوە- هێندە زەق‌و ئاشکرایە، حەوجێی بەبەڵگەو نموونە لەسەرهێنانەوە نیەو، تەنیا سەرنجدانێکی خێرای کودەتا سەربازییەکەی (عبدالفتاح السيسي) بەسەر (دکتور محمد مُرْسي) سەرۆك كۆماری متمانە پێكراوو هەڵبژێراوی زۆربەی خەڵك‌و جەماوەری (مصر)داو، سەرەتا خۆ بێدەنگ کردنی زلهێزان بەگشتی‌و بەتایبەت ئەمریکاو، دواتریش پشتگیریی‌و هاوکاریی کردنی ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆیان بۆ کودەتاچییە هەڵگەڕاوەکان، لەڕەوایەتیی (شرعية)و دیموکڕاسیی‌و مافەکانی مرۆڤ، بەسە بۆ سەلماندنی ئەو ڕاستییە!

**نۆیەم: چارەسەرکردنی کێشەکانی جیهانی ئیسلامیی، کە مسوڵمانان دەورووژێنن بۆ وێنە: کێشەکانی: کوردستان، فەڵەستین، کشمیر، بۆرما (ئەراکان)[1]:**

بەڵێ، ئەگەر بەجیددیی بویسترێ رێ لە دیاردەیی پەرگیریی بگیرێ، کە زۆرجاران دەچێتە خانەی تیرۆریزم (Terrorism)ەوە، نەك تەنیا وەك بیانووو کراسی عوسمان (قميص عثمان) بۆ هێنانەدی هەندێك مەرامو ئامانجی ستەمکارانە بەکاربهێنرێ، پێویستە: یەکەم: زلهێزانی بڕیاربەدەستو، پاشان دامەزراوە نێودەوڵەتییەکان، بەتایبەت نەتەوە یەککگرتووەکان (الأُمم المتحدة)و ئەنجوومەنی ئاسایش (مجلس الأمن) چیدیکە لەکێشە لەمێژینەو هەستیارەکانی جیهانی ئیسلامیی رانەمێنن، کە مایەی وورووژاندنو رقو توورەیی مسوڵمانانن بەگشتی، بەرانبەر بەزلهێزانی بڕیار بەدەستی دنیای ئەمڕۆ بەتایبەتیو، نامسوڵمانان بەگشتی، چونکە هەست دەکەن، کە لەبەر ئیسلامو مسوڵمانەتیی ستەمیان لێدەکرێو، باجی دینداریی راستو دروستی خۆیان دەدەن!

بەڵێ بەراستی جێی سەرسوڕمانە کە زلهێزانی بڕیار بەدەستی دنیا، جیهانی ئیسلامو مسوڵمانانو گەلانی ستەمدیدەی وەك: کورد، فەلەستینیەکان، کشمیرییەکان، رۆهینگیا، چیچانییەکان... هتد، پڕیکەن لەستەمو دەستدرێژییو چەوساندنەوەی جۆراوجۆر، کەچی بەتەمان، مسوڵمانانی ستەمدیدەو چەوسێنراوەش، بێدەنگبنو، نەك بەرهەڵستیی نەکەن، بگرە تەنانەت هاواریش نەکەن! کە من بەهیچ جۆرێك لێرەدا نامەوێ دیاردەی پەرگیریی بەگشتیو بەتایبەت تیرۆریزم پاساو بدەمەوە، بەڵکو تاکە مەبەستم ئەوەیە بڵێم: ئەوەی

---

١) کە گەلی (رۆهینگا)ی مسوڵمانی تێدا دەژی.

بەرپرسیارە لەبەرانبەر پەڕگیریی نێو مسوڵمانان دا، تـەنیا مسـوڵمانان خۆیـان نـین، بەڵکو زلهێزانی بڕیـار بەدەسـتی دنیـاش، بەشـێك لەبەرپرسـیارێتی (مسـئولیة)یـان لەسەرشـانە، چ لەحاڵـەتی سـەرهەڵدانو تەشـەنەکردنیو، چ لەحاڵـەتی چارەسـەرو بنبڕکردنیشی دا، بۆیە ئەگەر ئیرادەی جیـددییو دڵسـۆزانە لەلایـەن زلهێزانـی بڕیـار بەدەستو، دامەزراوە نێودەوڵەتییەکانەوە هـەبێ، پێویسـتە هاوکـارو دەسـتبارگری مسوڵمانان بەگشتیو، بەتایبەت تەوژمی ئیسلامیی هاوسەنگ (التيّـار الإِسـلامي المعتدل)بن بۆ چارەسەری ئەو دیاردە ترسـناکەی کـە زیـانی هەمەولایـەکی تێدایـە، لەپێش هەمووانیشەوە، ئیسلامو مسوڵمانان.

**دەیەم: بەرەنگاربوونەوەی پەڕگیران و سزادانیان، لەکاتی دەستدرێژییاندا:**

ڕێبازو شێوازێکی دیکەی چارەسەری دیاردەی پەڕگیریی و بنبڕکردنی، بریتیە لە بەرەنگاربوونەوەی پەڕگیران و سزادانیان، هەرکاتێك: وەك پێشینەکانیان (خوارج) پەنایان بردەبەر توندوتیژیی و بەکارهێنانی هێزو چەك و، خۆفەڕزکردن و خوێنڕێژیی، چونکە وەك گوتراوە: (آخِرُ الدَّواءِ الكيُّ) دوایین چارەسەر داغکردنە، هەروەها گوتراوە:(لا يَفُلُّ الحديدَالاّ الحديدُ)، ئاسن هەر بەئاسن دەپاچێتەوە، ئنجا دیارە بەرپەرچدانەوەی ستەم و دەستدرێژیی (الظلم والإعتداء) پێویستە، وەك خوای دادگەر فەرموویەتی: (﴿فَمَنِ ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ فَٱعْتَدُواْ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ ۚ ١٩٤﴾ البقرة.

واتە: ئنجا هەر کەس دەستدرێژیی کردنە سەر، وەك دەستدرێژییەکەی خۆی دەستدرێژیی بکەنەوە سەر {واتە: بەرپەرچی بدەنەوە}.

ئنجا ئەوە ڕای زۆربەی هەرەزۆری زانایانی ئیسلامە کە (خوارج) حوکمی یاخییان (بُغاة)یان هەیەو، مەگەر خەڵك بکوژن و، دەستیان بەخوێن سووربێ، ئەگەرنا دروست نیە بکوژرێن و، بگرە جەنگیشیان لەدژ بکرێ[1]. (إبن عبدالبَرّ) لەوبارەوە گوتوویەتی: (...لا أعلمُ أحداً وافق أهلَ الحديث على تكفيرهم وجعلهم كالمرتَدِّين) رواه عبدالرزاق في (العقول) برقم: ١٨٥٧٨، وابن أبي شيبة في (الجَمَل): ٣٩٠٤٨[2].

---

١) بڕوانە فقە الجهاد، د. يوسف القرضاوي، ج٢ص١١٠٢.

٢) هەمان سەرچاوە، ج٢ ص ١١٠٤.

واتــە: نــەمزانیوە هیچــکەس ڕای وەك فەرموودەناســان بووبــێ، لەبارەیانــەوە، بەکافری دانابن‌و، وەك هەڵگەڕاوانی دانابن.

شایانی باسیشــە (علـي بـن أبـي طالـب) خەلیفـەی چوارەم خـوالێی ڕازی بـێ، سەرمەشقە بۆ چۆنیەتی‌و شێوازی مامەڵەکردن لەگەڵ یاخییـان‌و دەرچـووان (البغـاة والخوارج)دا بەکۆڕای سەرجەم زانایان‌و، با لەوبارەوە چەند شوێنەوارێك بگێڕینەوە:

١- (**عن عليٍّ رضي الله عنه أنه سُئِل عن أهل النَّهر: أكُفّارٌ هم؟ قال: من الكفر فرُّوا، قيل: فَمُنافقون؟ قال: إِن المنافقين لايذكرون الله الا قليلاً، قيل: فماهم؟ قال: هم قومٌ أصابتهم فِتْنةٌ فَعَمَوا فيها وصَمّوا، وبَغوا علينا، وقاتلونا، فقاتلناهم**) رواه عبدالرزاق في (العقول) (١٧٤/١٠) وابن أبي شيبة في (الجَمَل): ٣٩٠٩٧، والبيهقي في (الكبرى) (٨/ ١٧٤)عن علي[1].

واتە: پرسیار لە عەلی کرا، لەبارەی خەڵکی نەهرەوانەوە (خوارج):

ئایا ئەوانە کافرن؟

گوتی: لە کوفر ڕایان کردوە!

گوترا: ئەدی ئایا مونافیقن؟

گوتی: مونافیقەکان بەکەمیی نەبێ، یادی خوا ناکەن.

گوترا: ئەدی ئەوانە کێن؟

گوتی: کەسانێکن کەوتنە بەڵایەکەوەو تێیدا کوێرو کەڕ بوون‌و، لێمان یاخی بوون‌و شەڕیان پێ فرۆشتین‌و، ئێمەش لەدژیان جەنگایین.

---

١) سەرچاوەی پێشوو، هەمان بەرگ‌و لاپەڕ.

**٢- (روي أن علياً كان يخطب يوماً، فقال رجلٌ بباب المسجد: لا حكم الاّ لِلّهِ، فقال علي: كلمة حق أُريدبها باطِلٌ.**

**فقال: لكم علينا ثلاث:**

**ألاّ نمنعكم مساجِد الله، أن تذكروا فيها اسم الله تعالى**

**ولا نمنعكم الفَيْءَ مادامت أيديكم مَعَنا.**

**ولا نبدأكم بقتالٍ) رواه ابن أبي شيبة في (الجمل): ٣٩٠٨٥، والطبراني في الأوسط: ٧٧٧١، والبيهقي في (الكبرى) (٨/ ١٨٤)، وضعَّفه الألباني في (مختصر إرواء الغليل): ٢٤٦٧[١].**

واتە: گێڕراوەتەوە کە ڕۆژێك عەلی خوا لێی ڕازی بێ وتاری دەدا، پیاوێك لە دەرگای مزگەوت گوتی: حوکم تەنیا هی خوایە!

(عەلی)یش گوتی: ئەمە قسەیەکی ڕاستە، بەڵام بۆ مەبەستێکی ناهەق بەکاردێ.

دوایی گوتی: ئێوە سێ مافتان لەسەرمان هەن:

یەك: لە مزگەوتەکانمان قەدەغەتان ناکەین، کە ناوی خوای بەرزیان تێدا باس بکەن.

دوو: هەتا بۆ جەنگ هاوکارییمان بکەن، لەدەستکەوت بەشتان هەیە.

سێ: دەستپێشخەریی بۆ جەنگ کردن لەدژتان، ناکەین.

١) هەمان سەرچاوە، ج٢ص١١١٣.

٣- **(روي أنَّ علياً لما قاتل أهلَ النَّهر قال لأصحابه: لا تَبدؤهم بقتال، وبعث إليهم: أقيدونا بعبدالله بن خباب، قالوا: كُلُّنا قَتَلَهُ)** رواه عبدالرزاق في (العقول): ١٨٥٧٨، وابن أبي شيبة في (الجمل) : ٣٩٠٤٨، والدار قطني في (السنن) (١٣١/٣)، والبيهقي في (الكبرى) (٨/ ١٨٤) عن علي[1].

واتە: کاتێك عەلی جەنگی لەدژی خەڵکی نەهرەوان دا کرد، بەهاوەڵەکانی خۆی گوت: ئێوە دەستپێشخەری جەنگ مەبن لەدژیان، ئنجا ناردیەلایان کە: تۆڵەمان لە بکوژی (عبدالله بن خباب) بۆ بکەنەوە! گوتیان: هەموومان کوشتوومانە! ئنجا مادام پەرگیرانی ستەمکارو دەستدرێژکار، حوکمی یاخییانو خەواریجیان هەبێ - کە بێگومان هەرواشە- ئەوە ئەم دەقانەش بەڵگەی روونو ڕاشکاون لەسەر ڕەوابوونو بگرە پێویستبوونی

جەنگ لەدژکردنیانو، بەرپەرچدانەوەی ستەمو دەستدرێژییان:

١- ﴿ لَا تَظْلِمُونَ وَلَا تُظْلَمُونَ ﴿٢٧٩﴾ ﴾ البقرة.

واتە: نەستەم بکەنو، نەڕێ بدەن ستەمیشتان لێبکرێ.

٢- ﴿ وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمۡ ﴿١٩٠﴾ ﴾ البقرة.

واتە: لەڕێی خوادا دژی ئەوانە بجەنگن، کە لەدژتان دەجەنگن.

٣- ﴿ وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَابَهُمُ ٱلۡبَغۡيُ هُمۡ يَنتَصِرُونَ ﴿٣٩﴾ ﴾ الشورى.

واتە: (بڕواادارانی ڕاستەقینە) ئەوانەن کە هەرکات دەستدرێژییان کرایەسەر، تۆڵە دەکەنەوە..

٤- ﴿ فَقَٰتِلُواْ ٱلَّتِي تَبۡغِي حَتَّىٰ تَفِيٓءَ إِلَىٰٓ أَمۡرِ ٱللَّهِۚ ﴿٩﴾ ﴾ الحجرات.

واتە: ئنجا ئێوە دژی ئەو کۆمەڵە بجەنگن، کە ستەمو دەستدرێژیی دەکات..

---

١) سەرچاوەی پێشوو، ج٢ ص١١٠٤.

٥- ﴿ فَمَنِ ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ فَٱعْتَدُوا۟ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ ﴿١٩٤﴾ ﴾ البقرة.

واتە: ئنجا هەركەس دەستدرێژیی كردنەسەر، وەك ئەوە كە دەستدرێژیی كردوونەسەر، دەستدرێژیی بكەنەوەسەر..

٦- پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) لەبارەی خەواریجەوە فەرموویەتی: (**هم شرُّ الخلق والخليقة، لئن أدركتهم لأَقْتُلَنَّهم قَتْلَ عادٍ**) رواه مسلم: ١٠٦٤.

واتە: ئەوانە خراپترین خەڵكو دروستكراون، ئەگەر فریایان بكەوم، وەك كوژرانی (گەلی) عاد دەیانكوژم.

٧- هەروەها هەر لەوبارەوە فەرموویەتی: (**سَيَخْرُجُ قومٌ في آخر الزمان: أحداث الأسنان سُفهاءُ الأحلامِ، يقولون من قول خير البرية، يقرؤون القرآن لايجاوز حناجرهم، يمرقون من الدين كما يمرق السَّهْمُ من الرَّمِيَّة، فإذا لقيتموهم فاقتلوهم، فإنَّ في قتلهم أجراً لمن قتلهم عندالله يوم القيامة**) رواه البخاري: ٣٦١١، ومسلم: ١٠٦٦، وأحمد في المسند: ٦١٦، ولأبو داود: ٤٧٦٧ والنسائي: ٤١٠٢ عن علي، واللفظ لمسلم.

واتە: لەكۆتایی ڕۆژگار (ی خەلیفەڕاشیدەكان)دا كۆمەڵێك یاخی دەبن: كەم تەمەنو عەقڵ سووكن، لەباشترین جۆرە قسە دەكەن (واتە: دروشمو ناوونیشانی زل زل بەرزدەكەنەوە) قورئان دەخوێنن، بەڵام لە گەروویان بەولاوە ناچێ، وەك چۆن تیر لەنێچیر دەردەچێ، ئاوا لەئایین دەردەچن، ئنجا لەهەر جێیەك تووشیان بوون، بیانكوژن، چونكە هەركەس بیانكوژێ، لەسەر كوشتنیان لەڕۆژی قیامەت دا پاداشتی هەیە، لەلای خوا.

**بەکورتیی و پوختیی:**

لە ئیسلام دا دروست نیە، هیچ کەس لەسەر بیروڕاو هەڵوێستی سیاسیی – هەرچییەك بێو، هەرچۆن بێو، هەرچەند زۆریش پەرگیرانە بێ- سزا بدرێو بکوژرێ، بەڵکوپێویستە فیکر بەفیکرو، سیاسەت بەسیاسەت، بەپەرچو وەلاَم بدرێتەوە، بەلاَم هەرکات بابای هەڵگری فیکرو سیاسەتی پەرگیرانە، ویستی بەزەبری هێزو چەكو بەکوشتنو برینو تۆقاندن، فیکرو سیاسەتەکەی خۆی بەسەر خەڵكو کۆمەڵگا دا بسەپێنێ، ئەوە پێویستە بەهەمان زمانی خۆی- کە بەکارهێنانی هێزو چەکە- بدوێنرێو، دەستی بگیرێو، سزا بدرێو، بەرپەرچ بدرێتەوەو، شەڕوگێچەڵی لەکۆڵ خەڵكو کۆمەڵگا بکرێتەوە.

عەلی کوڕی ئەبوطالیب خوا لێی ڕازی بێ کە چوارەمین خەلیفەی سەر ڕاستو ڕێنمایی کراوە، باشترین سەرمەشقە لەوبارەوە، کە ئەویش لەڕۆژگاری خۆی دا - بەهەمان شێواز کە خستمانەڕوو- لەگەڵ یاخیبووانو دەرچووان (خوارج)دا مامەڵەی کرد.

لێرەشدا کۆتایی بەم بەشی یەکەمە، دێنین.

سبحانك اللهم وبحمدك، أشهد أن لا اله الاّ أنت،

أستغفرك وأتوب اليك.



# بەشی دووەم

## با لادان‌و تاوانی پەڕگیران،
## بەرانبەر بەئیسلام
## نەمانخاتە دوو دڵیی‌و گومان!



# بەرایی

خوێنەری بەڕێز!

ئیسلام وەك دوایین نوسخەی هیدایەتی خواو، دوا پەیامو بەرنامەی بۆ مرۆڤایەتیی، هات تاکو مرۆڤایەتیی لە تاریکاییەکانی نەفامێتیی (ظلمات الجاهلية) دەربێنێو بیخاتە نێو ڕووناکیی: ئیمانو خوا یەکگرتنو، ئازادییو، دادگەرییو، تەباییو، ڕەوشت بەرزیی، وەك خوای تاكو تەنیا فەرموویەتی:

بسم الله الرحمن الرحيم ﴿ الٓر كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ إِلَيۡكَ لِتُخۡرِجَ ٱلنَّاسَ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذۡنِ رَبِّهِمۡ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَمِيدِ ﴿١﴾ ٱللَّهِ ٱلَّذِي لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ وَوَيۡلٞ لِّلۡكَٰفِرِينَ مِنۡ عَذَابٖ شَدِيدٍ ﴿٢﴾ ﴾ إبراهيم.

واتە: بە ناوی خوای بەبەزەییو بەخشندە . ئەلیف، لام، ڕا (ئەمە) کتێبێکە بۆلای تۆمان دابەزاندوە، تاکو بەمۆڵەتی پەروەردگاریان خەڵکی لەتاریکاییەکان بەرەو ڕووناکیی دەربێنیو، بەرەو ڕاستە شەقامی (خوای) زاڵی ستایشکراویان بێنی. ئەو خوایەی کە خاوەنی هەرچییەکە کە لە ئاسمانەکانو زەوی دایەو، وای بۆ کافران لە سزای بەئێش!

هەڵبەتە ئەو ئامانجە بەرزو مەزنەش کە ئیسلام بۆی هاتبوو، لەڕۆژگاری پێغەمبەری خاتەم (محمد(صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ)) و چوار جێنشینە سەر ڕاستەکانی (خُلَفائه الراشدين الأربعة) "أبوبكر و عمر و عثمان و علي"دا، خوا لێیان ڕازی بێ"، بەباشترین شێوە، جێبەجێ بوو، بەڵام دواتر لەسەردەمی (معاوية بن أبي

سفیان) بەملاوە، کەمو زۆر لادانو هەڵەوپەڵەی جۆراوجۆرو، دوورکەوتنەوە لە ڕێبازی ڕاستو ڕەسەنی پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ)و چوار خەلیفەکانی، ڕوویداو، لەئاکامی ئەوەشدا، وەك کاردانەوە (ردُّ الفعل): وێڕای چەند ڕاپەڕینێکی شەرعییانەی ڕەسەن، لەدژی ئەو لادانو ستەمو خراپەکارییەو، بۆ ڕاستکردنەوەی باری لاری کاری حوکمڕانییەك کە بەناوی ئیسلامی ڕاستو بێ گرێو گۆڵەوە، دەکرا، ژمارەیەك تاقمو دەستەی پەرگیرو تێپەڕێنەر (متطرف وغالي) سەریان هەڵدا، کە زانایانی ڕەسەنی ئیسلام، بۆ ناساندنیانو جیاکردنەوەیان لە جەماوەری مسوڵمانان، چەند زاراوەیەکیان بۆ بەکارهێناون، وەك: (الفرق، أهل الأهواء، أهل البدع، الغُلاة) واتە: تاقمەکان، خاوەن ئارەزووەکان، بیدعەتچییەکان، تێپەڕێنەران.

شایانی باسیشە ئەو گرووپو تاقمە لادەرانە، لادان (إنحراف)ەکانیان جۆراوجۆربوون:

١- هەبووە لەڕووی حوکمو سیاسەتەوە لایداوە، کە حوکمڕانەکان بوونو حوکمی ئیسلامییان لە ڕاوێژ (شوری)ەوە، گۆڕیوە بۆ میراتییو بنەماڵەیی.

٢- هەبووە لەڕووی عەقیدەییو فیکرییەوە،لایداوە، وەك: خەواریجو مورجیئەو موعتەزیلەو جەهمییەو موجەسسیمەو... هتد.

٣- هەبووە لە ڕووی خواپەرستییو دینداریی تایبەتیی (التديُّن الشَّخصُّي)یەوە، لایداوە، وەك زۆرێك لەوانەی بەناوی (زهد و تصوُّف)ەوە ناسراون.

٤- هەبووە لەزۆر ڕووەوە لایداوە، وەك شیعە، بە هەموو گرووپو تاقمە زۆرو جۆراوجۆرەکانیانەوە..

ئنجا زاناو پێشەوایانمان هەر لەوکاتەوە، کە لادان (إنحراف) ڕوویداوە، قۆڵیان لێ هەڵماڵیوەو هەوڵی پاکسازییو چاکسازییو ڕاستکردنەوەیان لە

کۆمەڵگاکانیاندا داوەو، لەلایەکەوە ڕەخنەی توندیان لە حوکمڕانە لادەرو ستەمکارەکان گرتووەو (کا)و (دان)ی قسەو هەڵسو کەوتەکانیان بەبێژینگی شەریعەت لەیەك جیاکردۆتەوە.

لەلایەکی دیکەشەوە: سەرجەم بیروڕاو هەڵسو کەوتەکانی گرووپو تاقمە لادەرەکانیان، لەبەر ڕۆشنایی عەقڵو وەحییدا هەڵسەنگاندووەو، هەقو ناهەقیانیان خستۆتەڕوو.

ئنجا بەندەش وەك شوێنکەوتوویێکی ئەو زاناو پێشەوایانەمان -خواپاداشتیان بداتەوە- لەسالآنی ڕابردوودا لە کۆمەڵێك بەرهەممدا ڕەخنەم لەو بیرۆکە نامۆیانە گرتوە، کە هاتوونەتە نێو مسولڵمانان، وەك: ئیلحادو ماددیگەرایی‌و، مارکسیزمو کۆمۆنیزمو، ناسیۆنالیزمو، سیکۆلاریزم...

ئێستاش لەم ڕۆژگارەدا- کە پەرگیریی‌و تێپەڕاندن (التطرّف والغُلوّ) لەنێو مسولڵماناندا بۆتە دیاردەیەكو، دنیای بەخۆیەوە سەرقاڵ کردوە، بەپێویستم دەزانی کە ماوەیەك لەکاتی خۆم بۆ لێکۆڵینەوەو تێوەڕامان لەو بابەتەو، پاشان نووسین لەبارەیەوە، تەرخان بکەم، وەك بەرگریی لە ئیسلامێك کە ئامانجی هەرە گەورەو بەرزی لەژیانی بەشەردا بەگشتی پاش چەسپاندنی خوا بەیەکگرتن (توحید الله) چەسپاندنی دادگەریی (تحقیق العَدْل)و، لابردنی هەموو شێوەیەکی ستەمو خراپەو ئاشووبە، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ ﴿٢٥﴾﴾ الحديد.

واتە: بەدڵنیاییەوە پێغەمبەرانی خۆمانمان بە (موعجیزەو) بەڵگە ڕوونەکانەوە ناردوونو، کتێبو تەرازووشمان لەگەڵ ناردوونە خوارێ، تاکو خەڵك بە دادگەریی بەڕێوەبچن..

هەروەها ئامانجی بەرزی ئیسلام لەژیانی تاکەکان (أفراد)دا، ئەوەیە کە بیانخاتە

سەر ڕاستە شەقامو، حاڵەتی هاوسەنگیی و ڕێکیی (الإتزان والإعتدال)یان بۆ بێنێتەدی، وەك خوای دادگەر فەرموویەتی: ﴿ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَالَمِينَ ﴿٢٧﴾ لِمَن شَاءَ مِنكُمْ أَن يَسْتَقِيمَ ﴿٢٨﴾ ﴾التكوير.

واتە: ئەم (قورئان)ە تەنیا بیرخەرەوەیە بۆ جیهانییان، بۆ هەرکامێك لەئێوە کە بیەوێ ڕاستو ڕێك بێ.

هەڵبەتە ئیسلامیش تۆمەتبار نیە، تاکو پێویستیی بەبەرگریی لێکردن (دفاع) بێ، بەلاّم بڵێین چی! کارەکەی منیش هەرچەندە بەڕواڵەت بەرگریی لێکردنی ئیسلامە، بەلاّم لەڕاستییدا بریتیە لە: ڕەواندنەوەو لادانی تەمو مژی، ئەو بیروڕاو ڕەفتارە کرچو کاڵو پڕ هەڵەو پەڵەی پەرگیرو تێپەڕێنەرانەیەی، کە وەك تۆزو خۆڵ لەسیمای گەشو جوانی ئیسلام ئالاّوە، کە دیارە ئەویش ئەرکی گەورەو گرنگی زانایانی میراتگری پێغەمبەری خاتەمە (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّم) وەك فەرموویەتی: **{يَحْمِلُ هذا الدِّين مِنْ كُلِّ خَلَفٍ عُدولُهُ: يَنْفُون عنه تحريف الغالين، وانتحالَ المُبْطِلين، وتأويلَ الجاهلين}**[1] واتە: ئەم ئایینە باشترینی هەر پاشین (جیل)ێکی چاك هەڵیدەگرن: ئنجا لادانی تێپەڕێنەرانو، لافلێدانی ساختانو، تەئویلکردنی نەزانانی، لێ دووردەخەنەوە.

هیواداریشم ئەم بەشی دووەمەش لەم کتێبە کە وەك هەموو یان زۆربەی هەرەزۆری بەرهەمەکانم بەخوێنراوو بیستراوەوە- پاش ڕاوێژکردنو، داوای چاکە لە خواکردن (الإستشارة والإستخارة) هاتۆتەدی، ئەو ئامانجەی بۆی نووسراوە، بەباشترین شێوە بپێکێ.

---

[1] أَخْرَجَهُ ابْنُ حِبَّان في "الثقات": ١٦٠٧ وَالبَيْهَقِي في "الكبرى": ٢٠٧٠٠ وَابْنُ عَبْد البَرِّ في "التمهيد" ٥٩/٧ ـ وابن عدي في "الكامل": ٣٠٢.

# ڕێ خۆشکردن

ئیسلام وەك دوا بەرنامەو پەیامی خوا بۆ مرۆڤایەتیی، لەم ڕۆژگارەدا بەر لە دوژمنو ناحەزانی لە ئەهلی کوفرو نیفاق، بەدەست شوێنکەوتووانو پەیڕەوانی کرچوکاڵو نەزانی بە گشتییو، پەڕگیرو تێپەڕێنەرەوە، بەتایبەت، گرفتار بووە!

ئنجا من وەك بەرگریی کردن لە ئیسلام -ئیسلامی بەرجەستە لە قورئانو سوننەتدا-، لەم بەشەدا هەوڵ دەدەم، ئاماژە بە کۆمەڵێك بیروڕاو هەڵسو کەوتی، پڕ هەڵەو پەڵەو لادەرانەی، ڕێکخراو و گرووپە پەڕگیر (متطرف)ەکانی ئەم ڕۆژگارە بەگشتییو، بە تایبەتی (ڕێکخراوی دەوڵەتی ئیسلامیی) ناسراو بە (داعش) بکەمو، لە مەحەکی عەقڵو شەرعیان بدەم.

یەکێك لە ئامانجەکانیشم ئەوەیە کە هەر کەسێك عەودالی ناسینی ڕاستییەکانی ئیسلامە، بەرچاوی ڕوون بکەینەوەو، ئەوانەش کە بەپێی پەندی: {شەڕ بە کۆنە قین دەکرێ} هەر لە ئیسلامو ئیسلامییەکان لەبیانوونو، دەیانەوێ لە پەنای بیرو بۆچوونو هەڵسو کەوتە پڕ هەڵەو پەڵە لادەرانەو تاوانبارانەی گرووپە پەڕگیرەکاندا بەگشتیو، بەتایبەتی (داعش)، داخی دڵی خۆیان بە ئیسلام بڕێژنو، بێڕێزیی بەرانبەر بەو وشەو زاراوەو دروشمو هێمایانەی ئیسلام بنوێنن، کە پەڕگیرەکان لە غەیری شوێنی خۆیانداو، بە شێوازێکی دوور لە حوکمی عەقڵو مەنتیقو ڕووحی شەریعەت، بەکاریان دێننو دەیانبێزرێنن، بیانووی ئەو جۆرە ڕەفتارەیان بەدەستەوە نەمێنێ.

ئنجا بێگومان ئەو وشەو زاراوەو دروشمە بەرزو بەپێزە ئیسلامییانەی، کە بەدەستی گرووپە پەڕگیرو لادەرەکان، دووچاری شێوێنرانو ستەملێکران بوونە،

زۆرن، بەڵام ئێمە هەوڵ دەدەین گرنگترینییانو زەقترینیان، بخەینە بەر تیشكی لێكۆڵینەوەوە، ئەویش لە دە (١٠) ئاڵقەدا، بەم ناو ونیشانانەی خوارەوە:

١- ئیسلام ڕەحمەتەو ئازادانە وەردەگیرێ، نەك زەحمەت بێو بەزەبرو زۆر بسەپێنرێ.

٢- جەنگو جیهاد بۆ پاراستنی قەوارەی سیاسییە، نەك بۆ دروستكردنی.

٣- دەوڵەت لە هەناوی كۆمەڵگایەكی مسوڵمانەوە پەیدا دەبێ، نەك بەكوشتنو بڕین بسەپێنرێ.

٤- جێبەجێكردنی شەریعەت، لە تێگەیاندنو پێگەیاندنی خەڵكو، پاشان دابینكردنی پێداویستیەكانیانەوە، دەست پێدەكات، نەك لە سزادانیانەوە.

٥- ئیسلام دژی سەغڵەتكردنی خەڵكو كۆمەڵگاو،پێشێلكردنی مافو ئازادییەكانیانە.

٦- فەرمان بە چاكە، دەبێ بە شێوازێكی باشو، ڕێگریی لە خراپە، نابێ بە شێوازێكی خراپ بێ.

٧- حوكمڕانی مسوڵمانان، نابێ بەبێ ئاگادارییو ڕەزامەندیی مسوڵمانان، دابنرێ.

٨- كوشتنی بەناهەقی مسوڵمانانو نامسوڵمانان، دوای شیرك، گەورەترین گوناهە.

٩- بەزۆر پەیمان وەرگرتن، عادەتو كلتووری حوكمی بنەماڵەیی ئومەوییو عەبباسییو عوسمانییەكانەو، هیچ بنەمایەكی شەرعیی نیە.

١٠-بەهەڵگەڕاوە (مرتد) دانانی لایەنە ئیسلامییە بەشداربووەكانی هەڵبژاردنو پرۆسەی سیاسیی، ستەمو نەفامییەكی گەورەیە.

خوێنەری سەنگین!

خوای کاربەجێ پێناسەی هەرکام لە قورئانی بەپیزو پێغەمبەری کۆتایی بەڕێزی خۆی (محمد) (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّم) بەوە کردوە کە (رحمة)نو، مایەی بەزەیی‌و بەخششی خوان، وەك فەرموویەتی:

١-﴿ وَمَآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ إِلَّا لِتُبَيِّنَ لَهُمُ ٱلَّذِى ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ ۙ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٦٤﴾ ﴾النحل.

واتە: کتێبمان تەنیا بۆ ئەوە دابەزاندۆتە سەرت، کە ئەوەی تێیدا کەوتوونە ڕاجیاییەوە، بۆیان ڕوون بکەیەوەو، کە ڕێنمایی‌و بەزەیی بێ، بۆ کۆمەڵێك کە بڕوا دێنن.

٢-﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَـٰكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَـٰلَمِينَ ﴿١٠٧﴾ ﴾الأنبياء.

واتە: تۆمان "ئەی موحەممەد" تەنیا بەڕەحمەت بۆ جیهانییان ڕەوانە کردوە.

هەروەها خوای زاناو شارەزا لەو بارەوە کە ئیسلام، دەبێ خەڵك ئازادانەو ئارەزوو مەندانە وەری بگرنو، هیچ جۆرە فشارێك بۆ ناچارکردنی خەڵك بۆ وەرگرتنی، ڕەوا نیە، فەرموویەتی:﴿ لَآ إِكْرَاهَ فِى ٱلدِّينِ ﴿٢٥٦﴾ ﴾البقرة.

واتە: ناچارکردنو زۆر لێکردن لە ئایین -واتە: ئیسلام- دا نیە.

ئنجا لە ڕاستییدا کەسانێك کە بە زۆر ئیسلامیان بەسەردا فەرز دەکرێ، نابنە مسوڵمان، بەڵکو ناچار دەکرێن، ببنە مونافیق‌و کوفرەکەیان بشارنەوە، چونکە ئیسلام بەر لە هەرشتێك عەقیدەو ئیمانە، کە ئەویش سەروکاری لەگەڵ عەقڵ‌و دڵ‌و دیوی پەنهانی مرۆڤدا هەیە، بۆیە ئەگەر بگونجێ هەر ئایینو فیکرەیەك بەزۆر فەرز بکرێ، ناگونجێ ئیسلام بە زۆر بسەپێنرێ.

هەربۆیەش ئەوەی کە گرووپە پەرگیرەکان - لە پێش هەموویانەوە (داعش)-

دەیکەن، لە بەزۆر سەپاندنی ئیسلامو کردەوەکانی ئیسلام وەك: خەتەنەکردنو، شایەتمان پێهێنانی بە کۆڕسی دیلە یەزیدییەکانو، نوێژپێکردنیانو... هتد، پێچەوانەو دژی شەریعەتە، وێڕای تێکگیرانی لەگەڵ عەقڵو مەنتیقدا، ئنجا بێگومان بەوشێوە دزێوە ڕانواندنی ئیسلامو شەریعەتەکەی، کە لەدەیان ئایەتو فەرموودەدا جەختی کردۆتەوە لەسەر: دادگەریی‌و یەکسانیی‌و ئازادیی‌و لێبوردەیی‌و بەزەیی‌و ڕەوشت بەرزیی‌و...هتد، خیانەتێکی گەورەیە بە ئیسلامو مسوڵمانان.

هەر لێرەوەش ڕایدەگەیەنمو بە ڕوونو ڕاشکاویی دەڵێم: مادام خوای کاربەجێ‌و زانا، دوایەمین کتێبی خۆی (قرآن)و کۆتا پێغەمبەری خۆی (محمد(صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّم)) بە (رحمة) ناوبردوون، کەواتە: هەرکەس‌و گرووپ‌و قەوارەیەك، ئەگەر هەزار ناوونیشانو دروشمی ئیسلامیشی هەڵگرتبێ، مادام لە جیاتی خێرو خۆشیی‌و ئاسوودەیی‌و ڕەحمەت، مایەی ئازارو مەینەتیی‌و زەحمەت بوون بۆ خەڵك "بە مسوڵمانو نامسوڵمانەوە" ئەوە بەو حاڵەیانەوە، نیشانەیەکی پرسیاری گەورە دەخەنە سەر خۆیانو، بەڵگە لەسەر خۆیان پەیدا دەکەن، کە پێچەوانەی ئەو ئامانجەیان هێناوەتە دی، کە خوای بەرزو مەزن، هەرکام لەدوایین کتێبو، کۆتا پێغەمبەری خۆی (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) بۆ ناردوون!

بەڵێ: هۆکاری ئاسوودەیی‌و ڕەحمەتبوونی هەرتاك‌و کۆمەڵو قەوارەیەکی مسوڵمانو ئیسلامیی، بۆ خەڵك‌و کۆمەڵگا، بەڵگەی ڕاست ڕاوەستاویی‌و ڕەسەنایەتیی‌و، بە پێچەوانەوەش هۆکاری بێزاریی‌و زەحمەت بوونیشی، بۆ خەڵك‌و کۆمەڵگا، بەڵگەو نیشانەی ناڕەسەنایەتیی‌و لادەرێتییەتی‌و ئەمە پێوەرو تەرازوویەکی گرنگ‌و ڕاستی پێوانو هەڵسەنگاندنی هەر کۆمەڵو ڕێکخراوێکیی ئیسلامیە بۆ دەرخستنی ئەندازەو ڕێژەی: ڕاست‌و ساغ بوون، یان بە پێچەوانەوە: ساختەو پووچەڵ بوونی.

بەڵێ خوێنەری سەنگین! -وەك لە ئاڵقەی سێیەمدا دەیخەینەڕوو- قەوارەی سیاسیی لەئیسلامدا زادەو هەڵقوڵاوی کۆمەڵگایەکی مسوڵمانە، کە ئازادانەو ئارەزوومەندانە دەیەوێ، ژینی بە پێی دینی بەڕێوە بچێ‌و، لەئەسڵدا سوپاو هێز، قەڵغان‌و سوپەرێکە، کە قەوارەی سیاسیی، پاش هەڵقوڵانی لە ئیرادەی ئازادی کۆمەڵگاو، بە تەعبیرێکی دیکە: پاش ڕەوایەتیی (شرعية) وەرگرتنی لە خەڵك‌و جەماوەر، پاسەوانیی خۆی پێ دەکات‌و خۆی پێ دەپارێزێ.

بۆ ئیسپاتی ڕاستیی ئەوەش تەنیا سێ بەڵگان دێنینەوە:

**یەکەم**: پێغەمبەری خاتەم (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) و هاوەڵە بەڕێزو دڵسۆزەکانی "خوا لێیان ڕازی بێ"، هەتا لە مەککە بوون، خوای کاربەجێ نەك هەر لەسەری پێویست نەکردن جەنگ بکەن، بگرە تەنانەت مۆڵەتیشی نەدان، هەتا نەچوونە مەدینەو قەوارەی سیاسییان بنیات نەنا، کە ئەوەش شتێکی ئاشکرایە لە سیرەو ژیانی پێغەمبەری خوادا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) وەك: (ابن هشام) گوتوویەتی:

**{وكَانَ رَسُولُ اللهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) قَبْلَ بَيْعَةِ الْعَقَبَةِ لَمْ يُؤْذَنْ لَهُ فِي الْحَرْبِ وَلَمْ تُحَلّلْ لَهُ الدّمَاءُ، إنّمَا يُؤْمَرُ بِالدّعَاءِ إلَى اللّهِ وَالصّبْرِ عَلَى الْأَذَى ، وَالصّفْحِ عَنْ الْجَاهِلِ}**[1]، واتە: پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) پێش پەیمانی عەقەبە، مۆڵەتی جەنگ کردنی پێ نەدراو، خوێنی (دوژمنانی) بۆ حەڵاڵ نەکرا، بەڵکو تەنیا بەوە فەرمانی پێدەکرا، کە بانگەواز بۆلای خوا بکات‌و، لەسەر ئازاردران، خۆڕاگربێ‌و، چاو پۆشیی لە بابای نەفام بکات.

[1] السيرة النبوية، ج٢، ص٢٤١

پاشان (ابن هشام) باس دەکات کە یەکەمین ئایەت کە لەبارەی مۆڵەتدران بە جەنگەوە، هاتە خوار، هەردووك ئایەتی: (٣٩و٤٠)ی سوورەتی (الحج) بوون، کە ئەمە دەقەکەیانە:

﴿ أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَٰتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا۟ ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ ﴿٣٩﴾ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُوا۟ مِن دِيَٰرِهِم بِغَيْرِ حَقٍّ إِلَّآ أَن يَقُولُوا۟ رَبُّنَا ٱللَّهُ ۗ وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّهُدِّمَتْ صَوَٰمِعُ وَبِيَعٌ وَصَلَوَٰتٌ وَمَسَٰجِدُ يُذْكَرُ فِيهَا ٱسْمُ ٱللَّهِ كَثِيرًا ۗ وَلَيَنصُرَنَّ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِىٌّ عَزِيزٌ ﴿٤٠﴾ ﴾الحج.

واتە: مۆڵەتی ئەوانەدرا کە جەنگیان لەدژی دەکرێ، لەسۆنگەی ئەوەوە کە ستەمیان لێدەکرێ (کە جەنگو جیهاد بکەن)و بێگومان خوا لەسەر سەرخستنیان توانایە، ئەوانەی کە بەناهەقو تەنیا لەبەر ئەوەی دەڵێن: خوا پەروەردگارمانە، لەماڵو حاڵیان وەدەرنران، ئەگەر بەهۆی ئەوەوە نەبێ کە خوا هەندێك لە خەڵکی (ی ستەمکار)بە هەندێکی دیکەیان (لەجەنگاوەرانی بەرگرییکار) بەرپەرچ دەداتەوە، ئەوە صەومیعەکانو کڵێساکانو کەنیشتەکانو مزگەوتەکان، کە زۆر ناوی خوایان تێدا دەهێنرێ، وێران دەکرانو، هەرکەسێکیش (ئایینی) خوا سەربخات، خوا سەری دەخات، بەدڵنیاییەوە خوا بەهێزی زاڵە.

**دووەم:** ئەگەر بێتو قەوارەی سیاسیی بەزەبری هێزو خۆ سەپاندن بنیات بنرێ، مانای وایە پێچەوانەی هەموو ئەو ئایەتانە ڕەفتار کراوە، کە فەرمانیان کردوە بە ئازادکردنی خەڵكو، پەنا نەبردنە بەر زەبرو زۆرو ناچارکردن، بۆ وێنە:

١- ﴿ لَآ إِكْرَاهَ فِى ٱلدِّينِ.... ﴿٢٥٦﴾ ﴾البقرة.

واتە: ناچارکردن لەئاییندا نیە.

٢- ﴿ وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَءَامَنَ مَن فِى ٱلْأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًا ۚ أَفَأَنتَ تُكْرِهُ ٱلنَّاسَ

حَتَّىٰ يَكُونُواْ مُؤْمِنِينَ ﴿٩٩﴾ يونس.

واتە: ئەگەر پەروەردگارت ویستبای زۆر لەخەڵك بكات، هەموو ئەوانەی لەزەوییدان، تێكڕایان بڕوایان دێنا، ئنجا ئایا تۆ زۆر لەخەڵك دەكەی كە ببنە بڕوادار ؟!.

**سێیەم:** لەحاڵەتی بنیاتنانی قەوارەی سیاسییدا بە زەبری هێز، كۆمەڵگا - ئەوەی كە ناچاركراوە- هەست بەستەملێكراویی دەكاتو، هەرلە دەرفەت دەخەفتێ بۆ تۆڵەو، سەربارەش خەڵكەكە ناچاری حاڵەتی نیفاق دەكرێ!

كەواتە:

ئەوانەی كە پێیانوایە: ئامانجی جەنگو جیهاد لە ئیسلامدا، گۆڕینی كۆمەڵگاو پاكسازییو چاكسازیی تێدا كردنیەتیو، سەرەنجام دروستكردنی قەوارەی سیاسییە!

ئەوانە نە لە سیرەو ژیانی پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) تێگەیشتوونو، نە لە سروشتی ئیسلام حاڵی بوونو، نە شارەزای واقیعیشن.




## ئاڵقەی سێیەم:
## دەوڵەت لە هەناوی
## کۆمەڵگایەکی مسوڵمانەوە پەیدا دەبێ،
## نەک بە کوشتن‌و بڕین بسەپێنرێ




خوێنەری بەڕێز!

خوای بەرزو مەزن فەرمانی پێکردووین کە پێغەمبەری خوا (محمد) (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) بکەینە پێشڕەو و چاوساغی خۆمان، لە هەموو بوارەکانی ژیانماندا: ﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُواْ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْآخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴿٢١﴾ ﴾الأحزاب.

ئنجا ئەگەر سەرنجی سیرەو ژیانی پێغەمبەرمان بدەین، لە بواری بنیاتنانی قەوارەی سیاسییدا، دەبینین کە پاش بڕوا هێنانی ژمارەیەك لە خەڵکی مەککە، لە هەردووك ڕەگەزو لە هەموو توێژەکانی کۆمەڵگا، پاشان گەیشتنە بنبەست لەگەڵ زۆرینەی خەڵکەکەدا، بەسەرکردایەتیی زلە زلەکانی شار، کە مەترسیی لەسەر بەرژەوەندییە ناشەرعییەکانیان، وای لێکردبوون: بڕوا بەو ئایینو بەرنامە تازەیە نەهێنن، کە سەیدو کۆیلەو، نێرو مێو، دەوڵەمەندو هەژار، پێکەوە یەکسان دەکات.

بەڵێ، دوای ئەوە، پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) زۆر بەجیددیی کەوتە مشوورخواردن بۆ پەیداکردنو دۆزینەوەی هۆزێکی خاوەن ناوچەیەکی جوگرافییو، خاوەن هێزو پێگەیەکی کۆمەلایەتییو سیاسییوسەربازیی، وەك (ابن هشام) لە ژێر ناوونیشانی: **{عَرْضُ رَسُولِ اللهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) نَفْسَهُ عَلَى الْقَبَائِلِ}** (خۆڕانواندنی پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) لەسەر هۆزەکان)دا، گوتوویەتی:

**{فَكَانَ رَسُولُ اللهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) يَعْرِضُ نَفْسَهُ فِي الْمَوَاسِمِ، إِذَا كَانَتْ عَلَى قَبَائِلِ الْعَرَبِ يَدْعُوهُمْ إِلَى اللهِ وَيُخْبِرُهُمْ أَنَّهُ نَبِيٌّ مُرْسَلٌ وَيَسْأَلُهُمْ أَنْ**

**يُصَدِّقُوهُ وَيَمْنَعُوهُ حَتَّى يُبَيِّنَ لَهُمْ اللهُ مَا بَعَثَهُ بِهِ}**[1].

واتە: ئنجا پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) لە کاتەکانی حەجدا، خۆی لەسەر هۆزەکانی عەرەب ڕادەنواند، بانگی دەکردن بۆلای خواو، هەواڵی پێدەدان کە پێغەمبەرێکی ڕەوانەکراوەو، داوای لێدەکردن کە بڕوای پێ بێننو بەرگریی لێبکەن، تاکو ئەوەی خوا پێیدا ناردوە، بۆیان ڕوون بکاتەوە.

هەتا سەرەنجام پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) پاش چەندان هەوڵی جۆراو جۆری سەرنەکەوتوو، لەساڵی (١١)ی پێغەمبەرایەتییدا، ڕێی لە شەش کەسی هۆزی (خَزْرَجْ)ی شاری (يَثْرِب) هەڵکەوتو دواندنیو، بۆ ساڵی داهاتوو "ساڵی (١٢)ی پێغەمبەرایەتیی" لەهەمان کاتدا، پەیمانی یەکەمی لەلای (عقبة) لەگەڵ دوازدەکەس لە نوێنەرانی هەردووك هۆزی (أوس و خَزْرَج)دا ئیمزا کرد، کە دواتر ناونرا: پەیمانی یەکەمی عەقەبە (بيعة العقبة الأولى)، ئەو دوازدە کەسەش نۆ(٩)یان لە هۆزی (خزرج)و سێ(٣)یان لە هۆزی (أوس) بوون.

ئنجا ئەو پەیمانی یەکەمی عەقەبەیە، بە پەیمانی ئافرەتان (بيعة النساء) ناوی ڕۆیشتوە، چونکە باسی جەنگی تێدا نەکراوە[2].

پاشان لە ساڵی داهاتوودا - ساڵی (١٣)ی پێغەمبەرایەتیی- لە هەمانکاتو شوێن دا، حەفتاو پێنج (٧٥) کەس لە نوێنەرانی هەردووك هۆزی (أوس وخزرج)، کە حەفتاو سێ (٧٣) پیاو و دوو ئافرەت بوون، پەیمانی دووەمی عەقەبە (بيعة العقبة الثانية)یان لەگەڵ پێغەمبەری خاتەمدا ﷺ بەستو، ئەو پەیمانە ناوی نرا: پەیمانی جەنگ (بيعة الحرب)، چونکە پێغەمبەری خوا لەسەر ئەوە پەیمانی لێوەرگرتن، کە بەرگریی لە خۆیو بەرنامەکەی بکەن، وەك چۆن بەرگریی لە

---

[1] السيرة النبوية، ج٢، ص٢١٨.

[2] بڕوانە: السيرة النبوية.ج٢ص٢٢٣،٢٢٢.

هاوسەرانو منداڵەکانیان دەکەن، وەك (ابن هشام) لە یەکێك لە ئامادەبووانی ئەو پەیمانەوە کە (کعب بن مالك)ە "خوا لێی ڕازی بێ"، دەگێڕێتەوە کە گوتوویەتی:

**{ فَتَكَلَّمَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَتَلا الْقُرْآنَ، وَدَعَا إِلَى اللهِ وَرَغَّبَ فِي الإِسْلامِ، ثُمَّ قَالَ: ((أُبَايِعُكُمْ عَلَى أَنْ تَمْنَعُونِي مِمَّا تَمْنَعُونَ مِنْهُ نِسَاءَكُمْ وَأَبْنَاءَكُمْ)) قَالَ: فَأَخَذَ الْبَرَاءُ بْنُ مَعْرُورٍ بِيَدِهِ، ثُمَّ قَالَ: نَعَمْ، وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ نَبِيًّا، لَنَمْنَعَنَّكَ مِمَّا نَمْنَعُ مِنْهُ أُزُرَنَا فَبَايِعْنَا يَا رَسُولَ اللهِ! فَنَحْنُ وَاللهِ أَبْنَاءُ الْحُرُوبِ وَأَهْلُ الْحَلْقَةِ وَرِثْنَاهَا كَابِرًا عَنْ كَابِرٍ، قَالَ فَاعْتَرَضَ الْقَوْلَ وَالْبَرَاءُ يُكَلِّمُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَبُو الْهَيْثَمِ بْنُ التَّيِّهَانِ، فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ! إِنَّ بَيْنَنَا وَبَيْنَ الرِّجَالِ حِبَالاً، وَإِنَّا قَاطِعُوهَا "يَعْنِي الْيَهُودَ" فَهَلْ عَسَيْتَ إِنْ نَحْنُ فَعَلْنَا ذَلِكَ، ثُمَّ أَظْهَرَكَ اللهُ أَنْ تَرْجِعَ إِلَى قَوْمِكَ وَتَدَعَنَا؟ قَالَ: فَتَبَسَّمَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، ثُمَّ قَالَ: بَلْ الدَّمُ الدَّمُ، وَالْهَدْمُ، الْهَدْمُ، أَنَا مِنْكُمْ وَأَنْتُمْ مِنِّي، أُحَارِبُ مَنْ حَارَبْتُمْ وَأُسَالِمُ مَنْ سَالَمْتُمْ }**[1].

واتە: پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّم) قسەی فەرموو: قورئانی خوێندەوەو، بانگەوازی کرد بۆلای خواو، هانی داین بۆ ئیسلام، ئنجا فەرمووی: {پەیمانتان لەگەڵ دەبەستم کە بەرگرییم لێبکەن، وەك چۆن بەرگریی لە هاوسەرانو ڕۆڵەکانتان دەکەن}، دەڵێ: (البراء بن معرور)یش دەستی گرتو گوتی: بەڵێ سوێند بەو کەسەی کە تۆی بە حەق بە پێغەمبەر ڕەوانە کردوە، بەرگرییت لێدەکەین، وەك چۆن بەرگریی لە هاوسەرانمان (واتە: لە ناموسمان) دەکەین، دەجا ئەی پێغەمبەری خوا! پەیمانمان لەگەڵ ببەستە، بە خوا ئێمە کوڕانی جەنگینو خاوەنی زرێین[2]، پشتاو پشت بە میراتمان گرتوە.

---

[1] بڕوانە: السيرة النبوية ـ لابن هشام، ج٢ ص٢٢٦-٢٢٨.

٢) واتە: چەكو پێداویستیەکانی جەنگمان هەیە.

ئنجا لەوکاتەدا کە بەراء پێغەمبەری خوای (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) دەدواند (أبو الهيثم بن التيهان) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! لە نێوان ئێمەو پیاوەکاندا "مەبەستی جوولەکەبوو" پەیمانمان هەن‌و، ئێمەش کۆتایی بەو پەیمانانە دێنین (بە حوکمی مسوڵمان بوونمان دەیانپچڕێنین) ئنجا ئەگەر ئێمە وامان کردو، تۆش خوا سەری خستی، ئایا ئێمە بەجێ دەهێڵیی‌و دەگەڕێیەوە لای خەڵکەکەت (خزمەکانت)! گوتی: پێغەمبەری خواش (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) زەردەخەنەیەکی هاتێ، ئنجا فەرمووی: {بەڵکو خوێنم لەگەڵ خوێنتانەو، مردنم لەگەڵ مردنتانە، من لە ئێوەم‌و ئێوەش لە منن، ئەوەی لەگەڵی بجەنگن، لەگەڵی دەجەنگم‌و، ئەوەی ئاشتیی لەگەڵ بکەن، ئاشتیی لەگەڵ دەکەم}.

بەڵێ، پێغەمبەری سەر مەشق‌و پێشەوامان (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) بەم جۆرە قەوارەی سیاسیی ئیسلامیی یەکەمی بنیات ناو، پاش ئەوەی ڕەوایەتیی (شرعیة)ی خەڵک‌و دانیشتووانی شاری (یثرب) (کە دواتر ناونرا مدینة)ی وە دەست هێنا، لەرێی نوێنەرەکانیانەوەو، بەسێ قۆناغ دوو پەیمانی لەگەڵ بەستن، ئنجا فەرمانی بە هاوەڵانی کرد، کە کۆچ بکەن بۆ مەدینەو، پاشان خۆشیی چوو و، سەرەنجام قەوارەی سیاسیی ڕاگەیاند، نەك بەزۆرە ملێ‌و هەڕەشەو گوڕەشەو کوشتن‌و بڕین! بەڵکو لە باوەشی گەرم‌و پڕسۆزی بنکەیەکی جەماوەرییدا، کە ئازادانەو ئارەزوومەندانە، بڕوایان بە ئایین‌و پەیامەکەی هێنابوو، لە دوو پەیمان (بيعة)دا، دەستیان لە نێو دەستی نابوو و، بەڵێنی پابەندیی بەشەریعەتەوەو، فەرمانبەریی بۆ کردنییان پێدا بوو.

هەڵبەتە تاکە هۆکاری ڕانەگەیەنرانی قەوارەی سیاسیی ئیسلامیی یەکەمیش لە شاری (مكة)دا، هەر ئەوە بوو کە مسوڵمانان کەمینە بوون‌و، زۆرینە ئامادەنەبوون، بڕوا بە ئیسلام بێنن‌و، ڕەوایەتیی حوکمڕانیی (شرعية الحاكمية) بە پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) بدەن.

کەواتە: دەبێ ئەوە لەلامان شتێکی مسۆگەر بێ، کە قەوارەی سیاسیی ئیسلامیی، بەبێ ڕەوایەتیی پێدرانی ئازادانەی ئارەزوومەندانە، لەلایەن زۆرینەی کۆمەڵگاوە، ناگونجێ بەشێوەیەکی ڕاستو شەرعییانە بنیات بنرێ.

وەك لە مەوسووعەی: (ئیسلامو دەوڵەتداریی) لە بەرگی دووەم: (بنەمایەکانی سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامیی)داو، لە مەوسووعەی: (الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله) لە "کتێبی حەوتەم"دا بە درێژیی ئەو بابەتەمان توێژیوەتەوە.

پاش زانینی ئەو ڕاستییەش، زۆر باش دڵنیا دەبین: کە هەموو ئەو قەوارە سیاسییانەی بە هەڵکوتانەسەر خەڵكو خۆسەپاندنو کوشتنو بڕین دروست دەکرێن، بە ناشەرعییو ناڕەوا دادەنرێن، هەر بۆیەش:

١- هەم بێ بەرەکەتو بێ خێرن.

٢- هەم تەمەنیشیان کورتەو گرو فڕنو دەوام ناکەن.

٣- هەم ئیسلامو مسوڵمانانیش لە جیاتی لێ بەهرەمەندبوون، زۆریان لەسەر قەرزدارن.

مادام واشبێ: سەرجەم بەشدارانی ئەو جۆرە کارو پرۆژانە، لە جیاتی پاداشتی خوا، دەبێ وێڕای عەیبداریی دنیا، چاوەڕێی گوناهباریی و سزاباریی قیامەتیش بن!

# ئاڵقەی چوارەم:
# جێبەجێکردنی شەریعەت
# لە تێگەیاندن و پێگەیاندنی خەڵك،
# پاشان دابینکردنی پێداویستییەکانیانەوە
# دەست پێدەکات، نەك لە سزادانیانەوە

خوێنەری سەنگین!

خوای کاربەجێ لە هەردووك بواری دروستکراو و فەرمان (الخَلْق والأمر)دا، یاسای پلەپلەیی (سنة التدرج)ی ڕەچاوکردوە، بۆ نموونە: ئاسمانەکانو زەوی بە شەش ڕۆژان، واتە: بەشەش قۆناغ وەدیهێناون، وەك فەرموویەتی: ﴿إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ يُغْشِى ٱلَّيْلَ ٱلنَّهَارَ يَطْلُبُهُۥ حَثِيثًا....... ﴾الأعراف.

هەروەها خوای زاناو توانا قورئانی بەرزو بەپێزی لە ماوەی بیستو سێ (٢٣) ساڵدا، دابەزاندۆتە سەر دڵی موبارەکی پێغەمبەری کۆتایی (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) وەك ئاشکرایە لە سیرەو ژیانیدا.

هەروەها هەر لە خودی یاسایەکانی شەریعەتیشدا پلەپلەیی ڕەچاوکراوە، بۆ وێنە:

**یەکەم:** بەر لەوەی هەرکام لە: پێنج نوێژە فەرزەکانو، زەکات دانو، ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان، پێویست بکرێن، نوێژکردنو ماڵوسامان بە خشینو ڕۆژووگرتن، بە شێوەیەکی دیکەی سادەترو، بەئەندازەیەکی کەمتریش بوون.

**دووەم:** مەی (خمر) بە چوار قۆناغ قەدەغەکراوە، بەمجۆرە:

١- سەرەتا خوای زانا، تەنیا وەك ئاماژەیەك باسی خراپیی مەی (خمر) کردوە: ﴿وَمِن ثَمَرَٰتِ ٱلنَّخِيلِ وَٱلْأَعْنَٰبِ تَتَّخِذُونَ مِنْهُ سَكَرًا وَرِزْقًا حَسَنًا ۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿٦٧﴾﴾ النحل.

واتــە: هــەروەها لەبــەرو میــوەی درەختــەکانی خورمــاو مێوەکــان، مــاددەی سەرخۆشــکەرو بــژیوێکی بــاش دروســت دەکــەن. کەواتــە: مــاددەی سەرخۆشــکەر، بژیوێکی باش نیە.

٢- پاشــان خــوا "عزوجــل" ئــەوەی خســتۆتە ڕوو کــە مــەیو قومــار (الخمـر والميسـر)گوناهیــان لــە ســوودیان گــەورەترە: ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ قُلْ فِيهِمَآ إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَآ أَكْبَرُ مِن نَّفْعِهِمَا ...﴿٢١٩﴾ ﴾البقرة.

٣- دوایی بۆ ئەوەی پــێش قەدەغــەکردنی یــەکجاریی، کــاتی مــەی خواردنــەوە بەرتەسك بکاتەوە، لــە مســوڵمانانی قەدەغــەکرد کــە بەسەرخۆشــیی تــوخنی نوێــژ بکـــەون:﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقْرَبُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمْ سُكَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَعْلَمُواْ مَا تَقُولُونَ ...﴿٤٣﴾ ﴾النساء.

٤- ئنجا سەرەنجام لە قۆناغی چوارەمدا، بڕیاری کۆتایی لە بارەوە دەرچوو، کــە قەدەغــە بوونی  توخن کەوتنیشیەتی، نەك تەنیا خواردنــەوەی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلْخَمْرُ وَٱلْمَيْسِرُ وَٱلْأَنصَابُ وَٱلْأَزْلَٰمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ فَٱجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٩٠﴾ ﴾المائدة.

هەروەها لە دابەزینو چۆنیەتی بەڕێوەبردنی شەریعەتیشدا -کەمەبەســتمان  لــە شەریعەت لێرەدا، کــۆی یاســاکانیەتی لــە هــەموو بوارەکــانی: ئیمــانو عــەقیــدەو، عیبــادەتو، هەڵس‌وکەوتەکاندا- دیسان ڕیزبەندیی لە گرنگترەوە بۆ گــرنگ چــوون، ڕەچاوکراوە، چونکە سەرەتا خوای پــەروەردگار نیزیکــەی دوو لەســەر ســێ (٣\٢)ی قورئانی لە شاری مــەککە دابەزاند، کە جاری مسوڵمانان کۆمــەڵگایەکی سەربەخۆو قەوارەیەکی سیاسییان نەبوو، بۆیەش قورئانی مــەککــەیی، زیــاتر جــەختی  لەســەر بووناسییو جیهانبینییو، ئیمانو عــەقیدەو، عیبــادەتو، ڕەوشــتو، بەســەرهاتی

پێغەمبەران "علیهم السلام"و گەلەکانیانو، باسی ڕۆژی دواییو، بەهەشتو دۆزەخ، کردۆتەوەو، کەمتر بەلای یاساییەکانی بوارەکانی: (جەنگو ئاشتییو، پەیوەندییەکانو، حوکمو سیاسەتو، ئابوورییو، ئەدەبە کۆمەڵایەتییەکانو، حەڵاڵو حەرامو، سزاییەکان)دا، چووە، چونکە ئەم بوارانە، بەبێ هەبوونی کۆمەڵگایەکی سەربەخۆو قەوارەیەکی سیاسیی، یاساییەکانیان تێدا بەڕێوە ناچن.

ئەم فەرمودەیەش زۆر جوان پێویستبوونی ڕەچاوکردنی پلەپلەییو لە گرنگترەوە بۆ گرنگ چوون، لە بەڕێوەبردنی شەریعەتدا ڕوون دەکاتەوە:

**{عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّ مُعَاذاً، قَالَ بَعَثَنِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «إِنَّكَ تَأْتِي قَوْمًا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ، فَادْعُهُمْ إِلَى شَهَادَةِ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَنِّي رَسُولُ اللَّهِ، فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوا لِذَلِكَ، فَأَعْلِمْهُمْ أَنَّ اللَّهَ افْتَرَضَ عَلَيْهِمْ خَمْسَ صَلَوَاتٍ فِي كُلِّ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ، فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوا لِذَلِكَ، فَأَعْلِمْهُمْ أَنَّ اللَّهَ افْتَرَضَ عَلَيْهِمْ صَدَقَةً تُؤْخَذُ مِنْ أَغْنِيَائِهِمْ فَتُرَدُّ فِي فُقَرَائِهِمْ، فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوا لِذَلِكَ، فَإِيَّاكَ وَكَرَائِمَ أَمْوَالِهِمْ، وَاتَّقِ دَعْوَةَ الْمَظْلُومِ فَإِنَّهُ لَيْسَ بَيْنَهَا وَبَيْنَ اللَّهِ حِجَابٌ» }**[(١)]

واتە: موعاز گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ناردمی بۆ (یەمەن)و فەرمووی: تۆ دەچیە لای کۆمەڵێك لەخاوەن کتێبەکان، ئنجا (سەرەتا) بانگیان بکە بۆ شایەتمان هێنان بەوە: کە جگە لە خوا هیچ پەرستراو (ی هەق) نیەو، کە من پێغەمبەری خوام، ئنجا هەر کات ئەوەیان جێبەجێ کرد، ئاگاداریان بکەوە کە خوا پێنج نوێژی لە هەر شەوو ڕۆژێکدا لەسەر پێویست کردوون، ئنجا ئەگەر ئەوەشیان جێبەجێکرد، ئاگاداریان بکەوە کە خوا زەکاتی لەسەر پێویست کردوون، لە دەوڵەمەندەکانیان وەردەگیرێو دەگێڕرێتەوە بۆ هەژارەکانیان، ئنجا

---

[١] أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٧٣٧٢)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٢١)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٧٣٧٢)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٠١٤)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٢٥٢١).

ئەگەر ئەوەشیان جێبەجێکرد، ئەوە خۆت لەماڵو سامانە نایابەکانیان بپارێزە (واتە: مەچۆ بۆ زەکات، کام ماڵوسامانی باشترە، ئەوەیان لێوەربگری، بەڵکو لە چاکی چاکو، لە خراپی خراپ وەربگرە)، هەروەها خۆت لە نزای ستەملێکراو بپارێزە، چونکە بۆلای خوا پەردەی لەبەر نیە.

هەڵبەتە لێرەدا مەبەستم ئەوەنیە بڵێم: پێویستە شەریعەتو یاسایەکانی، بەو پلەپلەییەی کاتی خۆی جێبەجێ بکرێتەوە! نەخێر، چونکە حەلاڵو حەرامو فەرزو سوننەتو، سەرجەم یاسا شەرعییەکان، هەر لە جێی خۆیانن، بەڵام مەبەستم ئەوەیە کە:

**یەکەم:** پێویستە لە جێبەجێکردنی شەریعەتدا، ڕیزبەندییەك کە لە خودی شەریعەتدا پێویست کراوە: ئیمانو عەقیدەو، عیبادەتو، ئابووریی...ڕەچاو بکرێ.

**دووەم:** هەر کام لە یاساکانی شەریعەت،دەبێ زەمینەو هەلومەرجی جێبەجێکردن (مناخ وشروط التطبيق)ی بۆ بڕەخسێ، ئەوجار جێبەجێ بکرێو، بێگومان لە هەڵوێستی خەلیفەی دووەم: عومەری کوڕی خەتتابدا "خوای لێ ڕازی بێ" دەرسو پەندێکی گەورە هەیە، کاتێك لە ساڵی گرانییو برسیەتی (عام القحط والمجاعة)دا، سزای بڕینی دەستی دزی ڕاگرتو، کاتێك پاش بە هێز بوونی دەوڵەتی ئیسلامیی، پشکی دڵ ڕاگیراوان (سهم المؤلفة القلوب)ی"کە هەشت یەك (١\٨)ی زەکاتە"ڕاگرت!

چونکە هەردووکیان زەمینەوهەلو مەرجی جێبەجێکردنیان ڕەخساو نەبوو، نەك وەك بەشێك لە شیعە دەڵێن: (عومەر) خوا لێی ڕازی بێ، ئایەتەکانی خوای پەك خستبێ!

کەواتە: ئەوەی گرووپە پەڕگیرەکان بە "تایبەت (داعش)" کردوویانەو دەیکەن، کە هەڵدەستن بە چەسپاندنی سزاو سنوورە شەرعییەکان بەسەر خەڵکدا، بێ ئەوەی

سەرنج بدەن: داخۆ هەلومەرجی جێبەجێکردنیان ڕەخساوە یان نا؟! ڕەفتارێکی بەڕواڵەت شەرعییانەی، لە حەقیقەتدا پێچەوانەی شەریعەتە، چونکە بێگومان پیادەکردنی شەریعەت، دەبێ سەرەتا: هۆشیارکردنەوەو تێگەیاندنو پێگەیاندنی خەڵك بێو، پاشان دابین کردنی پێداویستییەکانیانو، چارەسەری گرفتو کێشەکانیانو، ئاسوودەو بەختەوەر کردنیانو، دەستەبەرکردنی مافو ئازادییەکانیان، ئنجا دوای ئەوە هەرکەس ویستی هەرکام لە:

١- هێمنییو ئاسایشی خەڵك.

٢- ژیانیان.

٣- ماڵو سامانیان.

٤- وەچەیان.

٥- ئابڕوویان.

٦- عەقڵو هۆشیان.

٧- ئایینیان

بخاتە مەترسییەوەو، دەست درێژییان بکاتە سەر، پێویستە سزای پڕ بە پێست بدرێ، بەڵام گرووپێك ناوی خۆی بنێ: (دەوڵەتی ئیسلامیی) لافی جێبەجێکردنی شەریعەت لێ بدات، بەڵام لەو شەریعەتە پانو پۆڕو هەمەلایەنەیەی ئیسلام، تەنیا قامچی لێدانو، دەست بڕینو، سزاو جەزرەبەی پێبێو، لە چەسپاندنی ئەو سزاو سنوورە شەرعییانەوە، دەست پێ بکات، کە دوایین حوکمەکانی شەریعەت بوون، کە بۆ پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) دابەزیون، بە بەڵگەی ئەوە کە هەر کام لە:

١- سزای ڕێگرییو تێکدانی ئاسایشی کۆمەڵگا.

٢- سزای دزیی کردن.

٣ و ٤- قەدەغەکرانی یەکجاریی شەڕابو قومار.

لە سوورەتی (المائدة)داو لە ئایەتەکانی: (٣٣-٣٨-٩٠)، دانو، سوورەتی ناوبراویش، کۆتا سوورەتی قورئانە دابەزی بێ، وەك دایکی بڕواداران خاتوو عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، گوتوویەتی: {**أَمَا إِنَّهَا آخِرُ سُورَةٍ نَزَلَتْ، فَمَا وَجَدْتُمْ فِيهَا مِنْ حَلَالٍ فَاسْتَحِلُّوهُ، وَمَا وَجَدْتُمْ فِيهَا مِنْ حَرَامٍ فَحَرِّمُوهُ**}[1].

واتە: ئاگادار بن! (سوورەتی مائیدە) کۆتا سوورەتە هاتبێتە خوار، دەجا هەرچی حەڵاڵێکی تێدا دەبینن، بە حەڵاڵی بزانن‌و، هەرچی حەرامێکی تێدایە، بە حەرامی بزانن.

بەڵێ گرووپ‌و ڕێکخراوێکی ئاوا: بێگومان بیرو بۆچوونەکانی، پێش ڕەفتارەکانی -لەو بوارەدا- پێچەوانەی شەریعەتن‌و، پەڵەی ڕەش‌و ناشیرینن "لە بیرو زەینی خەڵکێکی نا ئاشنا بە ئیسلامدا" بە نێوچەوانی ئیسلام‌و مسوڵمانانەوە!



[1] أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٥٥٨٨)، وَالنَّسَائِيُّ في "الكُبرى" برقم: (١١١٣٨)، وَابْنُ المُنذر، والحَاكِمُ برقم: (٣٢١٠) وَصَحَّحَهُ، وَابْنُ مَردَوية والبَيْهَقِيُّ، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسنادُهُ صَحيحٌ رجالُهُ ثِقَات، رجَال الصحيح.




# ئاڵقەی پێنجەم:
# ئیسلام دژی سەغڵەت كردنی خەڵكو كۆمەڵگاو،
# پێشێڵ كردنی مافو ئازادییەكانیانە




خوێنەری خۆشەویست!

خوای بەرزو بێ نیاز سەرجەم پێغەمبەرانی خۆی بە کتێبو پەیامەکانییەوە، بۆ ئەوە ناردوون، کە مرۆڤەکان "هەروەها جندیش" بە شێوەیەك ژیانی سەر زەمینیان بگوزەرێنن، کە خوای خاوەنو پەروەردگاری خۆیان لە خۆیان، ڕازی بکەنو، سەرەنجام بەختەوەریی دنیاوسەرفرازیی دوا ڕۆژ، دەستە بەر بکەن.

هەر بۆیەش شتێکی نامەنتیقییو نەگونجاوە: ئایینو بەرنامەی خوا -کە بۆ بەختەوەر کردنی مرۆڤەکان هاتوە- ببێتە مایەی سەغڵەتیی (حَرَج)و نارەحەتییو گرفتاریی خەڵك، بە مسوڵمانو نامسوڵمانەوە!

هەربۆیەش خوای بەرزو بێوێنە "سبحانه وتعالى" شوێنکەوتووانی ئایینو بەرنامەکەی، بە بەختەوەران (سعداء)و، سەرفرازان (مفلحون)و، بە مراد گەیشتووان (فائزون)، وەسف کردوون، وەك فەرموویەتی:

١- ﴿ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ سُعِدُواْ فَفِي ٱلۡجَنَّةِ خَٰلِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ إِلَّا مَا شَآءَ رَبُّكَۖ عَطَآءً غَيۡرَ مَجۡذُوذٖ ﴿١٠٨﴾ ﴾هود.

٢- ﴿ قَدۡ أَفۡلَحَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ﴿١﴾ ﴾ المؤمنون.

٣- ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡ أَعۡظَمُ دَرَجَةً عِندَ ٱللَّهِۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَآئِزُونَ ﴿٢٠﴾ ﴾التوبة.

هەروەها خوای زاناو شارەزا، زۆر بە ڕوونیی ڕایگەیاندوە: کە ئایینو بەرنامەکەی، هیچ جۆرە سەغڵەتییەکی تێدانیە، واتە: ئیسلام نابێتە مایەی سەغڵەتییو گرفتاریی بۆ هیچکەس، چ شوێنکەوتووانیو، چ ئەوانەش کە بڕوای پێ ناهێننو شوێنی ناکەون، وەك فەرموویەتی:

١- ﴿... وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ ... (٧٨)﴾ الحج.

واتە: (خوا) هیچ جۆری سەغڵەتییو نارەحەتییەکی لە ئاییندا نەخستۆتە سەرتان.

٢- ﴿...مَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيَجْعَلَ عَلَيْكُم مِّنْ حَرَجٍ ... (٦)﴾ المائدة

واتە: خوا نایەوێ هیچ جۆرە سەغڵەتییەکتان بخاتە سەر.

٣- ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ قَدْ جَاءَتْكُم مَّوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَشِفَاءٌ لِّمَا فِي الصُّدُورِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ (٥٧) قُلْ بِفَضْلِ اللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِ فَبِذَٰلِكَ فَلْيَفْرَحُوا هُوَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ (٥٨)﴾ يونس.

واتە: ئەی خەڵکینە! لە پەروەردگارتانەوە ئامۆژگاریيو چارەسەری ئەو (نەخۆشییان)ەی کە لەنێوان سینەکانتاندایە، بۆتان هاتوەو، ڕێنماییو بەزەییە بە بڕواداران، بڵێ با تەنیا بە بەخششی خواو بە بەزەییەکەی، بەس بەوە زۆر شادمان بن، ئەوە باشترە لەو (سامان)ەی کە پەزمەندەی دەکەن.

وەك دەبینین: خوای کاربەجێ زۆر بەڕاشکاویی ڕایگەیاندوە، کە لە ئایینو بەرنامەکەیدا، هیچ شتێکی وای دانەناوە، ببێتە مایەی سەغڵەتکردنو بێزارییو نیگەرانیی خەڵكو کۆمەڵگا.

هەروەها خوای بەبەزەیی بە مرۆڤایەتیی -بە مسوڵمانو نامسوڵمانەوە- ڕاگەیاندوە کە کتێبەکەی (قورئان) ئامۆژگارییو شیفاو چارەسەری دەردو نەخۆشی نێو دڵو سینەکانیانە بەگشتییو، ڕێنماییو ڕەحمەتیشە بەتایبەت بۆ بڕواداران.

پاشان بە مرۆڤایەتیی دەفەرموێ: کە با تەنیا بەبەخششو بەزەیی خوا، شادمان بنو ئەو پەڕی خۆشحاڵ بن.

ئنجا لێرەدا دەپرسین:

ئایا دەگونجێ ئایینو بەرنامەیەك خوا بە ئامۆژگارییو چارەسەر(موعظة و شفاء)،و، بە بەخششو بەزەیی(فَضْل و رحمة)ی خۆی بۆ مرۆڤایەتیی پێناسەی بکات، ببێتە مایەی زەحمەتو سەغڵەتییو نیگەرانییو بێزارییان؟!

بێگومان نەخێر.

هەر بۆیەش لێرەوە بە دەنگێکی زوڵاڵ ڕایدەگەیەنین:

سەرجەم ڕەفتارو هەڵوێستی ڕەقو تەقو بێ ڕووحو ڕەونەقو سەغڵەتکەرو بێزارکەرەکانی،گرووپو ڕێکخراوە پەرگیرەکانو، لە پێش هەموویانەوە (داعش)، پێچەوانەی قورئانو سوننەتن.

ئاخر قورئانێك خوا بەئامۆژگارییو شیفاو بەخششو بەزەیی بۆ خەڵکی، وەسفی بکات، چۆن دەگونجێ ببێتە مایەی سەغڵەتییو بێزارییو، پشوو پێ تەنگ کردنی خەڵكو کۆمەڵگا؟!

هەروەها پێغەمبەرێك نازناوی (رحمة للعالمين)ی هەبێو، بە ئۆممەتەکەی فەرموو بێ: **{يَسِّرُوا وَلاَ تعَسِّرُوا، وَبَشِّرُوا وَلاَ تُنَفِّرُوا}**[1]

واتە: (ئایین بۆ خەڵك) ئاسان بکەنو، لێیان وەزەحمەت مەخەنو، دڵی خەڵك خۆش بکەنو، مەیانسڵەمێننەوە.

---

١ أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٢٣٥٥)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٥٧٧٤)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٧٣٤)، وَالنَّسَائِي في "الكبرى" برقم: (٥٨٩٠).

هەڵبەتە مەبەستیش لە ئاسانکردنی ئایینو دڵخۆشکردنی خەڵکیش، ئەوە نیە کە حەرامیان بۆ حەڵاڵ بکرێ، بەڵام بێگومان لە نێوان شلگیریی: حەرام بۆحەڵاڵکردنو، سەختگیریی: حەڵاڵ لێ قەدەغەکردنو، خەڵك گرفتارو عاسێ کردنیشدا، زۆر شت هەیەو، هەمیشە خەتی نێوە ڕاست گرتنو، خۆ دوورگرتن لە تێپەڕاندن (إفراط)و بەزایەدان (تفريط) مرۆڤ بەرەو هاوسەنگیی و لەنیشانەدان دەبات.

بەڵێ قورئانێکی ئاوا -کە باسمان کرد- و پێغەمبەرێکی ئاوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) چۆن دەگونجێ، پەیڕەویی لێکردنو شوێنکەوتنیان، ببێتە مایەی بێزاریی و گرفتاریی خەڵكو کۆمەڵگا بەگشتیی، بە مسوڵمانو نامسوڵمانەوە؟!

ئنجا دیارە ئەو ڕەفتارو بڕیارو هەڵوێستە پەرگیرانەو بێزاکەرانەی، ئەو گرووپانە بە تایبەت (داعش) زۆرن، بۆ نموونە:

١/ سەپاندنی بەرگو پۆشاکێکی تایبەت لەسەر ئافرەتان، بەتایبەت پابەندکردنیان بە پێچەگرتنەوە (إنتقاب)ەوە، کە بێگومان بەڕای زۆربەی هەرە زۆری توێژەرەوانی قورئان (مفسرين)و فەرموودەناسان (محدثين)و شەرعزانان (فقهاء)،ئافرەتان بۆیان هەیە هەردووك دەستو ڕوو(اليدان والوجه)یان دیاربێ، بۆیەش خوا فەرمانی بە پیاوان کردوە،کە لەنیگای خۆیان بگرنەوە:﴿ قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّواْ مِنْ أَبْصَـٰرِهِمْ وَيَحْفَظُواْ فُرُوجَهُمْ ..... ﴿٣٠﴾ ﴾النور.

ئنجا ئەگەر ئافرەتان پێچە (نقاب)یان لەسەر فەرز بووایە، پێویستیی بەو فەرمانە نەدەکرد، چونکە ئەو کاتە ڕوانین (نظر) لە چی دەکرا؟! دیارە من ئەو بابەتەم بە درێژیی لە هەرکام لە کتێبی (ئافرەتو خێزان لەسایەی شەریعەتدا)و، لە کتێبی: (سروودو مۆسیقاو چەند بابەتێکی هونەریی)دا باسکردوە.

٢/ سزادانی خەڵك لەسەر گوێگرتن لە مۆسیقاو گۆرانیی، كە بەلای كەمەوە: مەسەلەی مۆسیقاوگۆرانیی، مەسەلەیەكی ڕاجیایی هەڵگرەو، زانایانیش لەسەر ئەوە یەكدەنگن كە مەسەلە ڕاجیاییی لەسەرەكان(المسائل الخلافیة) ناگونجێ فەرمان بە چاكەو ڕێگریی لە خراپەیان تێدا ئەنجام بدرێ، هەرچەندە من لە كتێبی: (سروودو مۆسیقاو چەند بابەتێكی هونەریی..)دا بەبەڵگەی پتەو سەلماندوومە، كە گۆرانییو مۆسیقا لە بنەڕەتدا ڕەوا (مباح)ن، مەگەر بۆ مەبەستی قەدەغە بەكاربێن، یان شوێنەواری خراپ پەیدا بكەن.

٣/ سزادانی خەڵك لەسەر جگەرەكێشان.

٤/ سزادانی خەڵك لەسەر نوێژنەكردن، یان نەكردنی بە كۆمەڵ.

٥/ سزادانی خەڵك لەسەر ڕیش نەهێشتنەوە.

كە بێگومان جگەرەكێشان بەڕای زۆربەی هەرە زۆری زانایانی هاوچەرخ، قەدەغەیەو، نوێژكردن فەرزەو، بە كۆمەڵ (جماعة) كردنیشی، بەلای كەمەوە سوننەتەو، ڕیش هێشتنەوەش بەلای هەندێك لە زانایانەوە فەرزەو، بەلای زۆربەیانەوە سوننەتەو، هەندێكیشیان بەسوننەتیشی نازانن.

بەڵام ئایا ڕێگریی لە جگەرەكێشان، بەو شێوازە دەكرێو بنبڕدەكرێ، یان لە كاردانەوەداو بەپێی بنچینەی: (كل ممنوع مرغوب) جگەرە كێشەكان هەر زیاد دەبن؟!

هەروەها ئایا بەو شێوازە خەڵك نوێژو تاعەتی لەلا شیرین دەبێو، ڕیش هێشتنەوەی لەلا خۆشەویست دەبێ، یان بە پێچەوانەوەوە؟!

ئنجا گریمان ئەگەر خەڵكیش لە ژێر فشارو ترسدا، بە ڕواڵەت ئەوتاعەتانەی كردنو لە خراپەكاریی پرینگایەوە، ئایا خوا ئەوەی ویستوە؟ پاشان ئایا ئەو خەڵكە ناچاركراوە، بە پەنهانیی چی دەكەن؟!

ئنجا سەرباری هەموو ئەوانەش دەڵێین:

وەك پێشتریش گوتمان: كۆی قەوارەیەكی سیاسیی مادام لەڕووی شەرعییەوە، ڕەوایەتیی (شرعیة)ی نەبێ، كەواتە: سەرجەم بڕیارو ڕەفتارەكانیشی ناڕەوانو، بێگومان قەوارەیەكی خاوەن ڕەوایەتیی تەواویش، وەك پێشتر -لە ئاڵقەی چوارەمدا- باسمان كرد، پێویستە بەو شێوازەی كە شەریعەت دیارییكردوە، كە پلەپلەییو ڕێزبەندیی لە گرنگترەوە بۆ گرنگ چوون (التدرج وترتيب الأهم فالمهم) ڕەچاوكردن: بناغەكەیەتی، هەوڵی چەسپاندنی شتە پەسندەكانو، نەهێشتنی شتە ناپەسندەكان بدات، ئەویش بە مەرجێك پەسندییو ناپەسندیی شتەكان، ڕاجیایی(إختلاف)تێدا نەبێو، هەموو زانایان، یان زۆربەیان، لەسەری یەكدەنگ بن، وەك لە ئاڵقەی شەشەمدا تیشكی دەخەینە سەرو، پێشتریش لە بەشی یەكەمدا قسەمان لە بارەوە كرد.

# دەستپێک

خوێنەری سەنگین!

ئاشکرایە کە (فەرمان بەچاکەو ڕێگریی لە خراپە) یەکێکە لە گرنگترین ئەرکەکانی کۆمەڵگای مسوڵمانو، نیشانەو تایبەتمەندییەکی بەرچاویەتیو، لە چەندان ئایەتی قورئانو دەقی سوننەتدا باسکراوەو، گرنگییەکی تایبەتیی پێدراوەو، بە هۆکاری سەرفرازییو، مایەی چاکتربوونی ئۆمەتی ئیسلام دانراوەو، نیشانەو بەڵگەی زیندوێتییو هێزو پێزیەتی، با بۆ نموونە سەرنجی ئەو ئایەتو فەرموودانە بدەین:

١- ﴿ وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى ٱلْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿١٠٤﴾ ﴾آل عمران.

واتە: باکۆمەڵێکتان لە نێودا هەبێ، بانگەواز بۆ چاکە بکەنو، فەرمان بە پەسندەکان بکەنو، ڕێگریی لە ناپەسندەکان بکەنو، هەر ئەوانەش سەرفرازن.

٢- ﴿ كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ ۗ ﴿١١٠﴾ ﴾آل عمران.

واتە: ئێوە چاکترین کۆمەڵن کە بۆ مرۆڤایەتیی ڕەخسێنراون، فەرمان بە هەرچی پەسندە دەکەنو، ڕێگریی لە هەرچی ناپەسندە دەکەنو، بڕوا بە خوا دێنن.

٣- ﴿ وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ۚ يَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ

وَيُطِيعُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓۚ أُوْلَٰٓئِكَ سَيَرۡحَمُهُمُ ٱللَّهُۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٧١﴾ التوبة.

واتە: پیاوانی بڕوادارو ئافرەتانی بڕوادار: هەندێکیان دۆستو پشتیوانی هەندێکیانن، فەرمان بە هەرچی پەسندە دەکەنو، ڕێگریی لە هەرچی نا پەسندە دەکەنو، نوێژ بەرپادەکەنو، زەکات دەدەنو، فەرمانبەریی خواو پێغەمبەرەکەی دەکەن، ئا ئەوانە خوا بەزەیی پێیاندا دێ، بێگومان خوا زاڵی کار بەجێیە.

**٤- {وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَتَأْمُرُنَّ بِالْمَعْرُوفِ وَلَتَنْهَوُنَّ عَنْ الْمُنْكَرِ أَوْ لَيُوشِكَنَّ اللَّهُ أَنْ يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عِقَابًا مِنْهُ ثُمَّ تَدْعُونَهُ فَلا يُسْتَجَابُ لَكُمْ}** [1]

واتە: سوێند بەو کەسەی گیانمی بەدەستە، دەبێ فەرمان بەچاکەو ڕێگریی لە خراپە بکەن، ئەگەرنا نیزیکە خوا "عزوجل" سزایەکتان بۆ بنێرێ، پاشان هەرچەندە لێی بپاڕێنەوە، وەڵامتان نەداتەوە.

بەڵێ، پێویست بوونی ئەرکی (فەرمان بە چاکەو ڕێگریی لە خراپە) لەسەر کۆی مسوڵمانان، شتێکی ڕوونەو مشتو مڕ هەڵناگرێ، بەڵام بێگومان ئەنجامدانی ئەو ئەرکە گەورەو گرنگە، لە چەند ڕوویەکەوە پێویستیی بەوردبینیی هەیەو، ئەگەر بە وردبینییو دووربینییەوە، ئەنجام نەدرێ، دەرهاویشتەی زۆر خراپی لێدەکەونەوەو، زیانی لە سوودی زیاتر دەبێ، وەك ئەوەی گرووپە پەڕگیرەکان دەیکەن.

ئنجا بێگومان، بابەتی فەرمان بە چاکەو ڕێگریی لە خراپە (الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر) بابەتێکی فراوانەو، ئێمە لێرەدا ناگونجێ مافی خۆی بدەینێ [2]،

[1] أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٣٣٤٩)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢١٦٩) وَقَالَ: حَسَنٌ، وَالبَيْهَقِيُّ في "شعب الإيمان" برقم: (٧٥٥٨)، وَالدَّيْلَمِي برقم: (٧٠٥٩) .

[2] - لە کتێبی شەشەمی مەوسووعەی: (الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله)داو بەرگی دووەمی مەوسووعەی : (ئیسلامو دەوڵەتداریی)و کتێبی: (ڕوونکردنەوەی بنەما شەرعییەکانو هێڵە گشتییەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی)دا، باسی ئەو بابەتە گرنگو هەستیارەمان کردوە.

بەڵام ئێمە لێرەدا سێ ڕووی گرنگی ئەنجامدانی ئەو ئەرکە مەزنە، دەخەینە ڕوو لە سێ بڕگەدا:

١- هەلو مەرجی تێدا ئەنجامدرانی ئەو ئەرکە.

٢- ئەو مەسەلانەی کە ئەو ئەرکەیان لە بارەوە ئەنجام دەدرێ.

٣- شێوازی ئەنجامدرانی ئەو ئەرکە.

چونکە ڕوونو عەیانە، کە گرووپە پەڕگیرەکان (المجموعات المتطرفة) بە تایبەت (داعش) لە هەرکام لەو سێ ڕووەوە، گیرۆدەی لادانو هەڵەو پەڵەی زەق بوون:

## بڕگەی یەکەم: هەل و مەرجی تێدا ئەنجامدرانی ئەرکی فەرمان بە چاکە و ڕێگریی لە خراپە:

دەبێ هەلو مەرجی جێبەجێکردنی هەر ئەرکێکی شەرعیی، ڕەخساو و لە بار بێ، ئەگەرنا دەرهاویشتەی خراپی دەبێ، واتە: مەرج نیە هەرچی شەریعەت بە پەسندی دانابوو -جا چ پێویست بێ، چ سوننەت- لە هەموو حاڵاندا جێبەجێ بکرێ، هەروەها مەرج نیە، هەرچی شەریعەت بە ناپەسندی دانابوو-جا چ قەدەغە بێ، چ ناپەسند- لە هەموو حاڵاندا لابرێ.

با لەو بارەوە دوو نموونە بێنینەوە، لە سیرەی پێغەمبەردا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بۆ هەردووك جۆرەكە: پەسندو ناپەسند:

## یەك: ڕاست نەکردنەوەی دیواری کەعبەو هێشتنەوەی بەلاریی، بۆ ئەوەی خەڵك گرفتی بۆ دروست نەبێ:

وەك لەم فەرمایشتەدا دیارە:

{«يَا عَائِشَةُ! لَوْلاَ حَدَاثَانُ قَوْمِكِ بِالْكُفْرِ لَنَقَضْتُ الْبَيْتَ حَتَّى أَزِيدَ فِيهِ مِنَ الْحِجْرِ، فَإِنَّ قَوْمَكِ قَصَّرُوا فِي الْبِنَاءِ»}[1]

واتە: ئەی عائیشە! ئەگەر لەبەر ئەوە نەبێ کە گەلەکەت (قورەیش) لە ڕۆژگاری کوفرە وە نیزیکن، کەعبەم هەڵدەوەشاندەوە، تاکو لە حیجر بیخەمە سەرێو لێی زیاد بکەم، چونکە گەلەکەت کاتی خۆی (لەبەر کەم سامانیی) کەموکورتییان لە دروستکردنەوەی کەعبەدا هەبووە (پاش ڕووخانی بەلافاو).

[1]) أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (١٥٠٧)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٧٧٢).

وەك دەبینن پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) لەبەر نەگونجاویی هەل‌و مەرج، چاوپۆشیی کردوە لە ئەنجامدانی چاکە (معروف)ێکی گەورەی وەك: ڕاستکردنەوەی کەعبەو، گێڕانەوەی بۆ سەر بناغە ئەسڵییەکەی!.

## دوو: سزانەدانی خەواریج، لەبەر مەترسیی پەیدابوونی ڕای گشتی خراپ، بەرانبەر بە ئیسلام‌و مسوڵمانان:

(بخاري) لە ژێر ناونیشانی: (باب مَن ترك قتال الخوارج للتألُّف، وأن لا يُنَفِّرَ الناس) (دەرگای: کەسێك کە جەنگی دژی خەواریج نەکردوە، لەبەر دڵڕاگرتن‌و، بۆ ئەوەی خەڵك لێی نەسڵەمنەوە)دا، ئەم فەرموودەیەی هێناوە:

**{ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ قَالَ بَيْنَا النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقْسِمُ جَاءَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ ذِي الْخُوَيْصِرَةِ التَّمِيمِيُّ فَقَالَ اعْدِلْ يَا رَسُولَ اللَّهِ! فَقَالَ: وَيْلَكَ وَمَنْ يَعْدِلُ إِذَا لَمْ أَعْدِلْ! قَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ: دَعْنِي أَضْرِبْ عُنُقَهُ، قَالَ: دَعْهُ فَإِنَّ لَهُ أَصْحَابًا يَحْقِرُ أَحَدُكُمْ صَلاتَهُ مَعَ صَلاتِهِم وَصِيَامَهُ مَعَ صِيَامِهِم، يَمْرُقُونَ مِنْ الدِّينِ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنْ الرَّمِيَّةِ ...آيَتُهُمْ رَجُلٌ إِحْدَى يَدَيْهِ أَوْ قَالَ: ثَدْيَيْهِ مِثْلُ ثَدْيِ الْمَرْأَةِ، أَوْ قَالَ: مِثْلُ الْبَضْعَةِ تَدَرْدَرُ، يَخْرُجُونَ عَلَى حِينِ فُرْقَةٍ مِنْ النَّاسِ، قَالَ أَبُو سَعِيدٍ أَشْهَدُ سَمِعْتُ مِنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَشْهَدُ أَنَّ عَلِيًّا قَتَلَهُمْ وَأَنَا مَعَهُ جِيءَ بِالرَّجُلِ عَلَى النَّعْتِ الَّذِي نَعَتَهُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: فَنَزَلَتْ فِيهِ: (وَمِنْهُمْ مَنْ يَلْمِزُكَ فِي الصَّدَقَاتِ)}** (١)

ئەبو سەعید دەڵێ: لەکاتێکدا پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) خێرێکی دابەش دەکرد (عبدالله بن ذي الخويصرة)ی تەمیمیی هات گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا

---

(١) أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٦٩٣٣).

دادگەر بە! فەرمووی: ئەگەر من دادگەریی نەکەم کێ دادگەریی دەکات؟ عومەری کوڕی خەتتاب گوتی: لێم گەڕێ با لەملی بدەم! فەرمووی:

(لێیگەڕێ، ئەوە هەندێك هاوەڵی هەن (دوایی پەیدادەبن) یەکێکتان نوێژی خۆی لەچاو نوێژی وانو، ڕۆژوو گرتنی خۆی لە چاو ڕۆژووگرتنی وان، پێ کەمە، وەك چۆن تیر لە نێچیر دەردەچێ، ئاوا لە ئایین دەردەچن... نیشانەیان پیاوێکە، یەکێك لە دوو دەستەکانی، یان فەرمووی: یەکێك لە دوومەمکەکانی، وەك مەمکی ئافرەت وایە، یان وەك پارچە گۆشتێکە دەلەرێتەوە، لە کاتی ڕاجیایی و ئاژاوەی خەڵکدا یاخی دەبن).

ئەبو سەعید دەڵێ: شایەدیی دەدەم کە ئەوەم لە پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) بیستو، شایەدیی دەدەم کە عەلی ئەوانەی کوشتو، من لەگەڵی بووم کە کاتێك ئەو پیاوەیان هێنا، بەو وەسفەوە کە پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) باسی کردبووو، ئەو ئایەتەش لەو بارەوە دابەزی: (هەیانە لە خێرکردندا ڕەخنەت لێ دەگرێ).

لێرەشدا دەبینین کە پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) لەبەر نەگونجانی هەل و مەرج، لە هەڵوێستێکی خەواریجییانە، بێدەنگ دەبێ!

ئنجا دیارە وێڕای گونجاویی هەل و مەرج بۆ ئەنجامدانی ئەرکی فەرمان بە چاکەکردن و ڕێ لە خراپە گرتن، پێویستە خودی ئەو مەسەلەیەش کە ئەرکی ناوبراوی تێدا جێبەجێ دەکرێ، لەو مەسەلانە بێ، کە بگونجێ بکرێتە بابەتی ئەو ئەرکە، وەك لە بڕگەی دووەمدا دەیخەینە ڕوو:

## بڕگەی دووەم: ئەو مەسەلانەی فەرمان بە چاکەو ڕێگیریی لە خراپەیان، لەبارەوە ئەنجام دەدرێ:

زانایانی قووڵبووەوە لە شەریعەتدا، لەسەر ئەوە ڕێککەوتوون، کە بۆ ئەنجامدانی ئەرکی فەرمان بە چاکەو ڕێگریی لە خراپە، پێویستە سەرنجی خودی ئەو مەسەلانەش بدرێ کە پەسندنو، دەویسترێ فەرمانیان پێ بکرێ، یان ناپەسندنو، دەویسترێ ڕێگرییان لێ بکرێ، کە ئایا پەسند (معروف)، یان ناپەسند (منكر)ێکن، کە یەکدەنگیی، یان ڕای زۆرینەی هەرە زۆری زانایانیان لەسەربێ، یان ڕاجیاییان تێدایە؟!

چونکە زۆربەی هەرە زۆری زانایان ڕایان وایە، کە ئەو مەسەلانەی جێی ڕاجیاییو مشتو مڕی زانایانن، دروست نیە ئەرکی (حِسْبَة)[1] یان لە بارەوە ئەنجام بدرێ.

وەك (محمد بن مفلح المقدسي) لەو بارەوە گوتوویەتی: {ولا إنكار فيما يَسُوغُ فيه خلافٌ من الفروع، على مَنْ اجتهد فيه، أوقَلَّد مُجْتَهِداً فيه}.[2]

واتە: نابێ فەرمان بە چاکەو ڕێگیریی لە خراپە، لەو مەسەلە شەرعییانەدا بکرێ، بۆ کەسێك کە ئیجتیهادی تێداکردوون، یان تێیاندا شوێن موجتەهیدێك کەوتوە.

---

١) (حِسْبَة) زاراوەیەکی شەرعزانان بۆ وشەی: (الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر) بەکاریان هێناوە.

٢) الآداب الشرعية، ج١ ص٢٢٧.

هەروەها (ابن المفلح) گوتوویەتی: (وذكر الشيخ محي الدين النووي أن المختلف فيه لا إنكارَ فيه، قال: لكن اذا نَدَبَهُ على جهة النُّصح إلى ال خروج من الخلاف، فهو حسن محبوب مندوب إلى فعله برفقٍ}[1]

واته: شێخ (محي الدين النووي) باسیکردوه که شتی ڕاجیایی لەسەر، فەرمان بە چاکەو ڕێگیریی لە خراپەی تێدا ناکرێ، گوتوویەتی: بەڵام ئەگەر لەڕووی دڵسۆزییەوه ئامۆژگاریی بکات، تاکو لە بازنەی ڕاجیایی بچێتە دەرێ، ئەوه شتێکی پەسندو باشە بکرێ، بەڵام بە نەرمو نیانیی.

دەڵێم: هەڵبەتە ئەوەش شتێکی ئاشکراو مەنتیقییە، چونکە ئەگەر بێتو هەرکەس ڕایەکی تایبەتیی تەبەنیی کرد، بیکاتە بابەتی (فەرمان بە چاکەو ڕێگریی لە خراپە) ئەوه مانای وایە، دەبێ کۆمەڵگا هەمیشە لە مشتو مڕو کێشەدابێ، چونکە لە مەسەلە ڕاجیاییەکاندا، هەموو لایەك وەك یەك مافیان هەیەو، هیچکەس مافی ڤیتۆی نیە!



[1] الآداب الشرعية، ج١ ص٢٣٢.

## بڕگەی سێیەم: شێوازی ئەنجامدانی ئەرکی: فەرمان بە چاکەو ڕێگریی لە خراپە:

هەروەها مەرجێکی دیکەی شەرعیی بوونی ئەرکی فەرمان بە چاکەو ڕێگریی لە خراپەو، سەرگرتنیو بەرگرتنی، بریتیە لە ڕەچاوکردنی شێوازێکی ڕاستو دروست بۆ چۆنیەتی ئەنجامدانی.

هەر بۆیەش زانایان لەمێژە لەو بارەوە گوتوویانە:

(أُأْمر بالمعروف بالمعروف، وانْهَ عن المنكر لا بالمنكر)واتە: بە شێوەیەکی پەسند، فەرمان بە چاکە بکەو، ڕێگریی لە خراپە بکە، بەڵام بە شێوەیەکی خراپ نا.

ئنجا با لەوبارەوە گوێ لە (محمد بن مفلح المقدسي) بگرین، داخۆ چۆن بۆمان باسی شێوازی فەرمان بە چاکەکردنو ڕێگیریی لە خراپەکردن دەکاتو، چۆن باسی ئەو سیفەتانە دەکات، کە دەبێ بابای ئەنجامدەری ئەو ئەرکە گەورەوگرنگە، خۆییان پێ بڕازێنێتەوە؟!.

دەڵێ: {وَيَنْبَغِي أَنْ يَكُونَ الآمِرُ بِالْمَعْرُوفِ وَالنَّاهِي عَنْ الْمُنْكَرِ مُتَوَاضِعًا رَفِيقًا فِيمَا يَدْعُو إلَيْهِ، رَحِيمًا شَفِيقًا غَيْرَ فَظٍّ وَلا غَلِيظَ الْقَلْبِ وَلا مُتَعَنِّتٍ، دَيِّنًا نَزِيهاً عَفِيفًا ذَا رَأْيٍ وَحَزَامَةٍ وَشِدَّةٍ فِي الدِّينِ، قَاصِدًا بِذَلِكَ وَجْهَ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ وَإِقَامَةَ دِينِهِ وَنُصْرَةَ شَرْعِهِ وَامْتِثَالَ أَمْرِهِ، وَإِحْيَاءَ سُنَّةِ نَبِيِّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّم)، بِلا رِيَاءٍ وَلا مُنَافَقَةٍ وَلا مُدَاهَنَةٍ، غَيْرَ مُنَافِسٍ وَلا مُفَاخِرٍ، وَلا مِمَّنْ يُخَالِفُ قَوْلُهُ فِعْلَهُ وَيُسَنُّ لَهُ الْعَمَلُ بِالنَّوَافِلِ وَالْمَنْدُوبَاتِ وَالرِّفْقُ وَطَلاقَةُ الْوَجْهِ وَحُسْنُ الْخُلُقِ عِنْدَ إنْكَارِهِ، وَالتَّثَبُّتُ وَالْمُسَامَحَةُ بِالْهَفْوَةِ عِنْدَ أَوَّلِ مَرَّةٍ}[1].

[1] الآداب الشرعية، ج١ ص٢٥٦.

واتە: پێویستە بابای فەرمان بە چاکە کارو ڕێگر لە خراپە:

١-خاکیی بێ.

٢- نەرمو نیان بێ لەوەدا کە خەڵکی بۆ بانگ دەکات.

٣- بە پەرۆش بێ.

٤- بەبەزەیی بێ.

٥- قسە زبر نەبێ.

٦- دڵ ڕەق نەبێ.

٧- نارەحەتکەر نەبێ.

٨- زەحمەتخەر نەبێ.

٩- دادگەربێ.

١٠- شارەزابێ.

١١- زانا بێ بە مەسەلە شەرعییە فەرمانپێکراوەکانو، قەدەغەکراوەکان.

١٢- بێ تەماع بێ.

١٣- پاك بێ.

١٤- هۆشیار بێ.

١٥- لە ئاییندا بوێرو توندو پتەوبێ.

١٦- دیندار بێ.

١٧- مەبەستی ڕەزامەندیی خوای زاڵو پایەبەرز بێ.

١٨- ئامانجی بەرپاکردنی ئایینی خوا بێ.

١٩- هەروەها عەوداڵی سەرخستنی شەریعەتی خوا بێ.

٢٠- ئاواتی جێ بەجێ کردنی فەرمانی خوا بێ.

٢١- زیندووکردنەوەی ڕێبازی پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) بێ.

٢٢- کارەکەی دوور لە نیفاقو ڕیا بازییو نەرمکێشیی بێ.

٢٣- مەبەستی خەڵك بۆردان نەبێ.

٢٤- هەروەها مەبەستی خۆبەسەردا هەڵکێشانی خەڵك نەبێ.

٢٥- لەو کەسانە نەبێ کە قسەی پێچەوانەی کردەوەیەتی.

٢٦- واش پەسندە کە کار بەسوننەتەکانو پەسندەکان بکات.

٢٧- دەبێ هێدییو مەندیی ڕەچاو بکات.

٢٨- دەبێ لەکاتی ئەنجامدانی ڕێگریی لە خراپەدا، ڕووخۆشو ئاکار جوان بێ.

٢٩- دەبێ "بەر لەڕێگریی کردنی لە خراپە" مەسەلەکە ساغ بکاتەوە.

٣٠- پێویستە لەکاتی یەکەم هەڵەدا "لەبابای هەڵەکار" چاوپۆشیی بکات.

کە ئەمانە سی (٣٠) سیفەتنو، بێگومان زیاتر لەمانەش هەن، ئنجا ئەگەر بێتو لەبەر ڕۆشنایی ئەوەدا کە ڕابرد، ڕەفتارو هەڵسو کەوتی گرووپو ڕێکخراوە پەڕگیرەکانو، گەلێك کەسی دیکەش کە موزایەدەی شوێنکەوتنی پێشینی باش (السلف الصالح) بەسەر مسوڵمانانندا دەکەن، لە مەحەك بدەین، بەتایبەت ڕێکخراوی (داعش)، بۆمان دەردەکەوێ کە زۆربەی سیفەتو ڕەفتارەکانیان، دژو پێچەوانەن لەگەڵ ئەو سیفەتو ئاکارانەدا، کە زاناو پێشەوایان -لەبەر ڕۆشنایی شەریعەتدا- بەمەرجیان گرتوون، بۆ کەسانێك کە ئەرکی فەرمان بە چاکەو، نەهی لە خراپە ئەنجام دەدەن، هەر بۆیەش لە جیاتی ئەوەی کارەکەیان ببێتە مایەی زیاتر لە خواو لە ئیسلام نیزیك خستنەوەی خەڵكو کۆمەڵگاو چاکبوونیان، بۆتە مایەی بێزارییو نیگەرانییانو، بگرە دوور خستنەوەیان لە ئیسلامو بەدبین کردنیان بەرانبەری.

ئەوەش شتێکی ئاشکراو بەرچاوە، لە هەموو ئەو ناوچانەدا کە ئێستا لە ژێر ڕکێفیاندانو، بە حیساب: حوکمی شەریعەتیان تێدا بەڕێوە دەبەن!.



# ئاڵقەی حەوتەم:

# حوكمڕانی مسوڵمانان،

# نابێ بەبێ ئاگاداریی و ڕەزامەندیی مسوڵمانان، دابنرێ

# دەستپێک

خوێنەری بەڕێز!

یەکی دیکە لەڕەفتارە بەڕواڵەت شەرعییو، لەڕاستییدا دژو پێچەوانەی شەرعییەکانی (داعش)،کە بە هۆیانەوە پێش هەموو گرووپو ڕێکخراوە پەرگیر (متطرف)و تێپەڕێنەرەکانی دیکە کەوتۆتەوە، مەسەلەی دانانی (خلیفة) بوو، بۆ سەرجەم مسوڵمانانی دنیا، کە ئێستا ژمارەیان لە ملیارو نیوێک (١,٥٠٠,٠٠٠,٠٠٠) زیاترە، بەبێ ڕاوێژو ڕەزامەندیی مسوڵمانانو، بگرە تەنانەت ئاگادارکردنەوەشیان!

کە بێگومان ئەو هەڵوێستو ڕەفتارەی ئەو ڕێکخراوە، وەك زۆربەی هەڵوێستو ڕەفتارەکانی دیکەیان، شتێکی پووچو ناشەرعییەو، ماڵی قەڵبەو سەر بەخاوەنیەتیو، زانایانی هاوچەرخیش بەبێ هەڵاواردن (بدون استثناء) ڕەخنەیان لەو هەڵوێستو ڕەفتارەی ئەو گرووپە گرتووەو، بە ناشەرعییان داناوە، بۆ نموونە:

(الإتحاد العالمي لعلماء المسلمين) لە: ٥/ رمضان/ ١٤٣٥هـ، بەرانبەر: ٢٠١٤/٧/٣ز،دا، بەیاننامەیەکیان وەك ڕەتکردنەوەی ئەو هەڵوێستەی (داعش) دەرکردوە، هەروەها زۆری دیکە لە زانایانی موعتەبەری هاوچەرخ، ئەو ڕەفتارەی ئەو ڕێکخراوەیان بە ناشەرعییو هەڵەیەکی گەورە داناوە.

ئنجا منیش لەو بارەوە بە پێویستی دەزانم چەند خاڵێك بخەمەڕوو:

## یەکەم: تاکە سەرچاوەی ڕەوایەتیی (شرعية) هەرقەوارەیەکی سیاسیی، خەڵکە:

بەڵێ لە ئیسلامدا تاکە لایەنێك بتوانێ ڕەوایەتیی بدات بە قەوارەیەکی سیاسیی: حزبو ڕێکخراو، دەوڵەت: خەڵكو جەماوەرە، چونکە:

**یەك:** هەموو دواندنەکان (خطابات)ی قورئان، جگە لەوانەی ڕاستەوخۆ ئاراستەی پێغەمبەری خوا ﷺ کراون، ڕوویان لە خەڵكو جەماوەرەو، تەنانەت جارێکیش خوای کاربەجێ، ڕووی نەکردۆتە توێژێکی تایبەتی وەك: زانایان(علماء)،بەرپرسان(مسئولين)، ڕیش سپییان(شيوخ)، بۆ وێنە:

١- ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمُ ... ﴿٢١﴾ ﴾البقرة.

١- ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ... ﴿١﴾ ﴾النساء.

٢- ﴿ ... هَلۡ أَدُلُّكُمۡ عَلَىٰ تِجَٰرَةٖ تُنجِيكُم مِّنۡ عَذَابٍ أَلِيمٖ ﴿١٠﴾ ﴾الصف.

**دوو:** خوای زاناو توانا ڕایگەیاندوە،کە سەرجەم کاروباری مسوڵمانان، چ کۆمەڵ (جماعة)بن،چ کۆمەڵگا (مجتمع)، چ دەوڵەت، پێویستە بە پرسو ڕا بەیەکدی کردنو، ڕاوێژی نێوان خۆیان بێ، چونکە خوای کاربەجێ لەباسی خەسڵەتە سەرەکییەکانی مسوڵماناندا، کاروبار بەڕاوێژ بەڕێوەبردنی بڕوادارانی، کردۆتە خەسڵەتێکی سەرەکییانو، خستووشیەتە نێوان نوێژو سامان بەخشینەوە (الصلاة والإنفاق) کە دیارە نوێژ پایەی مەعنەویی مسوڵمانەتییو،ماڵو سامان بەخشین، پایەی ماددییو ئابوورییەتیو، کاروبار بە ڕاوێژ بەڕێوەبردنیش،پایەی کۆمەڵایەتییو سیاسییەتی:

﴿ وَٱلَّذِينَ ٱسۡتَجَابُواْ لِرَبِّهِمۡ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ

(٣٨) الشورى.

**سێ:** وەك لە ئاڵقەی سێیەمی ئەم بەشەدا گوتمان: پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) هەتا نوێنەرانی شاری (یثرب) لە هەردووك پەیمانی یەكەم‌و دووەمی(العقبة)دا، ڕەوایەتیی (شرعیة)یان بە خۆی‌و بەرنامەكەی نەدا، نەیتوانی قەوارە سیاسییەكەی ڕابگەیەنێ، چونكە ڕاگەیاندنی قەوارەی سیاسیی لە ئیسلامدا، وێڕای ڕەوایەتیی ئاسمانیی‌و خوایی، پەكی لەسەر ڕەوایەتیی زەمینیی‌و خەڵكییش كەوتوە، چونكە مادام لە ئەسڵدا، قەوارە سیاسییەكە بۆ خزمەتكردنی خەڵكە، دەبێ خۆیان بڕیاری لەسەر بدەن‌و پێی ڕازی بن.

**چوار:** لە (صحیح البخاری)دا هاتوە كە (عمر بن الخطاب) **"خوا لێی ڕازی بێ"** لەبارەی بەیعەتی خەلیفایەتیی پێدرانەوە بەكەسێك، بەبێ ڕاوێژكردن بە مسوڵمانان، گوتوویەتی: **{فَمَنْ بَايَعَ رَجُلاً عَلَى غَيْرِ مَشُورَةٍ مِنَ الْمُسْلِمِينَ، فَلا يُتَابَعُ هُوَ وَلا الَّذِي بَايَعَهُ تَغِرَّةً أَنْ يُقْتَلا}**[1] .

واتە: ئنجا هەر كەس بەیعەتی (خەلیفایەتیی) بەپیاوێكدا بەبێ ڕاوێژكردن بە مسوڵمانان، با كەس شوێنی نەكەوێ‌و، دڵنیا نەبێ كە خۆشیی‌و ئەوەش كە بەیعەتی پێداوە، نەكوژرێن!

كەواتە:هەر قەوارەیەكی سیاسیی بە ناوی ئیسلامەوە دابمەزرێ،بەبێ ڕاوێژكردن بە مسوڵمانان‌و ڕەزامەندییان،بە قەوارەیەكی ناشەرعیی‌و نەزۆك‌و بێ خێر دادەنرێ، هەرناوونیشانێكی هەبێ!

---
[1] أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٦٨٣٠).

**دووەم: دەوڵەتی خیلافەت، لەسەردەمی چوار خەلیفە ڕاشیدەکاندا، "خوالێیان ڕازی بێ" ئەم حەوت تایبە تمەندییانەی هەبوون:**

١ – (خليفة) کەسێکی خاوەن کەسایەتییو ناودارو ناسراوی نێو مسوڵمانان بووەو، مسوڵمانان لە نێو خۆیاندا پێیان باشترین بووە، لەڕووی دینداریی‌و دنیادارییەوە، بێگومان هەرکام لە: (أبو بكر وعمر وعثمان و علي) "خوا لێیان ڕازی بێ" بەو شێوەیە بوون.

٢ – سەرجەم مسوڵمانان بە گشتییو بەتایبەت قسە ڕۆیشتووانو گوێ لێگیراوانیان، پاش ڕاوێژکردنو گفتۆگۆو تاووتوێی زۆر، خەلیفەیان هەڵدەبژارد، ئەوەش لە هەڵبژرادنی هەرکام لە:(أبو بكر و عمر و عثمان و علي)دا زۆر ڕوونەو، (عمر)یش (أبو بكر) تەنیا پێشنیار (إقتراح)ی کردبوو، ئنجا مسوڵمانانیش پێیان پەسند بوو، ئەگەرنا وەك (ابن تيمية) گوتوویەتی، ئەگەر مسوڵمانان پێی ڕازی نەبووبانو بەیعەتیان پێ نەکردبایە، تەنیا بە پێشنیارەکەی (أبو بكر) نەدەبوو بە حوکمڕانی مسوڵمانان[1].

ئەمەش دەقی قسەکەیەتی: {وكذلك عمر صار إماماً، لما بايَعوه وأَطاعوه، ولو قُدِّرَ أنهَّم لم يُنَفِّذوا عَهْدَ أبي بكرٍ في عمر، لم يَصِرْ إماماً..} شایانی باسیشە کتێبی: (المُنْتَقى..) کورتکراوە (مختصر)ی (مناهج السنة النبوية)ی (ابن تيمية) یە، کە (الحافظ الذهبي) ئامادەی کردوە.

[1] المنتقى من مناهج الإعتدال، في نقض كلام أهل الرفض والإعتزال: ص٦٢.

٣ – ڕاوێژکردنو لێکۆڵینەوە لە بارەی هەڵبژاردنی خەلیفەوە، لە کەش و هەوایەکی ئازادو سەربەستدا بووەو، هیچ کەس پەنای نەبردۆتە بەر هەڕەشەو گوڕەشەو چاو سوورکردنەوە، چ جای کوشتنو بڕین!

٤ – حوکمی خیلافەت مایەی یەکڕیزیی و تەبایی مسوڵمانانو، خێرو خۆشیی و عیززەتو هەیبەتیان بوو، نەك کێشەو ئاژاوەو کوشتارو خوێنڕێژیی، جگە لە کێشەی نێوان خەلیفەی چوارەم(علي)و نەیارەکانی، کە بێگومان دەستی پیسی ناحەزانی ئاژاوەگێڕ، وێڕای سنوورشکێنیی و یاخیبوونی(معاویة)و لایەنگرانی، کە پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) بە (الفئة الباغية) کۆمەڵی یاخیبوان، ناوی بردوون وەك فەرموویەتی: (**تقتل عماراً الفئة الباغية**) رواه مسلم: ٧٢٥٣.

واتە: پێڕی یاخییان عەممار دەکوژن.

کە دیارە (عمار)یش لە جەنگی (صفّین)دا لەلایەن سوپای (معاویة)ەوە کوژرا، وە سەر کێڵ تێگەیشتنی (خوارج)، ڕۆڵی کاریگەری هەبوو لەو ئاژاوەیەدا، کە خەلیفە تێیدا بێ خەتابوو.

٥ - ئەو کاتە سەرجەم مسوڵمانان بەخۆشحاڵییەوە، لە بن چەتری خیلافەتدا حەوابوونەوەو، سێبەری قەوارە سیاسییەکە، تێکڕای مسوڵمانانی گرتبووەوە.

٦ – خیلافەتی ڕاشیدە بەڕاستیی و بەکردەوە، لەسەر ڕێبازی پێغەمبەرایەتیی(علی منهاج النبوة)بوو، لە هەموو ڕوویێکەوە، بەتایبەت لەڕووی مامەڵەکردن لەگەڵ نامسوڵمانانی هاووڵاتییداو، وەك چۆن پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ): بەزەیی خوا بوو بۆ جیهانییان (رحمة للعالمين)، خەلیفە ڕاشیدەکانیشی وا بوونو، لە مافەکانی هاووڵاتێتییدا، جیاوازییان بە مسوڵمانو نامسوڵمان نە دەکردو، بە پێی فەرموودەی

پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ): (**لهم ما للمسلمين، وعليهم ما على المسلمين**)، واتە: مسوڵمانان چ مافێكیان هەیە، ئەوانیش هەیانەو، چ ئەركێك لەسەر مسوڵمانانە، لەسەر ئەوانیشە[1].

٧- لەو دەوڵەتەدا كە بە (الخلافة الراشدة)ناسراوە، ئامانجو بەها بەرزە شەرعییەكانی وەك: دادگەریی، یەكسانیی، ئازادیی، ئارامییو ئاسایش، بەختەوەریی، گەشەكردنو بەرەو پێشچوونی ژیانو گوزەران، هەرچی زیاتر بڵاوبوونەوەی زانیارییو زانست، زیاتر چەسپانی ئاكارو ڕەوشتی پەسند، وێڕای زیاتر لە خواو ئیسلام نیزیك بوونەوەی خەڵكو جەماوەر، هاتبوونە دیو، وەك مانگی چواردە دەدرەوشانەوە.

ئنجا دیارە قەوارەیەكی سیاسیی ناو لە خۆی بنێ(دولة الخلافة)دەبێ هەوڵبدات، ئەو حەوت تایبەتمەندییەی كەمو زۆر تێدابن، بۆ ئەوەی تەنیا ناوی بێ نێوەڕۆك شیعاری بێ كردارنەبێ!.



[1] الوثائق السياسية محمد حميد الله، ص١٨٨، (نسختان مكتوب النبي (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) إلى النجران).

## سێیەم: هیچ دەقێکی قورئان و سوننەت نیە کەلە سەر مسوڵمانانی پێویست بکات، هەرکات قەوارەی سیاسییان دامەزراند، لەڕووی فۆڕم و ناو ونیشانەوە، کۆپـی خیلافەتی ڕاشیدە بکەنەوە:

دیارە هۆکاری مولزەم نەکرانی مسوڵمانانیش، بە دووبارەو کۆپی (إستنساخ) کردنەوەی ئەو شێوازە حوکمڕانییەی ئەو ڕۆژگارە، لەڕووی فۆڕمو شێوەوناو و نیشانەوە -نەك لەڕووی نێوەڕۆکەوە- ئەوەیە کە بواری حوکمڕانیی، لەبازنەی هەڵسو کەوتەکان (المعاملات) دایە، کە بناغە تێیدا دەستکراوەییو ڕەواییە، بەپێچەوانەی بواری خواپەرستییەکان (العبادات)ەوە، کەبناغە تێیدا پابەند بوونە بە دەقەکانەوە، وەك زانایان لەو بارەوە گوتوویانە: (الأَصْلُ فِي العِبَادَاتِ الحَظْرُ، إِلاَّ مَا وَرَدَ عَنِ الشّارِعِ تَشريعهُ، وَالأَصْلَ فِي العِبَادَاتِ الإِبَاحَة، إِلاَّ مَا وَرَدَ عَنِ الشّارع تَحْرِيمُهُ)[1].

هەربۆیەش دەبینین لە هەندێك وردەکارییدا،شێوازی هەرکام لە چوار خەلیفە ڕاشیدەکانیش،لە هی ئەوانی دیکە جیاواز بووە، بە هۆی گۆڕانی هەلو مەرجو عورفو عادەتی سیاسییو کۆمەلایەتیی کۆمەڵگایەکانەوە.

بەڵێ، بێگومان مسوڵمانان لەسەریان فەڕزە،کە هەوڵی دامەزراندنی قەوارەی سیاسیی بدەن، تاکو بتوانن یاساکانی شەریعەت هەموویان پیادە بکەن.

ئەوە لەسەر مسوڵمانان فەڕزە -وەك لە بەرگی یەکەمی مەوسوعەی (ئیسلامو دەوڵەتداریی)دا، بە درێژیی باسمان کردوە- کە مسوڵمانان هەرکات سێبەری دەوڵەتی خۆیانیان، بەسەرەوە نەما، پێویستە هەوڵبدەن بنیاتی بنێینەوەو، هیچ

[1] أصول الفقه المهمة، عبدالرحمان بن ناصرالسعدي. ص١٠٥-١٠٦.

کات بێ قەوارەو دەسەڵات نەبن، بەڵام بێگومـان پابەنـد(مُلْـزَم)کردنـی مسـوڵمانان بەیەك شـێوازو ئـەزموونی حوکمڕانییـەوە، کـە ئـەویش هـەرزادەی فیکـرو هۆشـی بەشەر بووە، جیاوازە لە پێویست بوونی هەوڵدان بۆ هەبوونی قەوارەو دەسـەڵاتێکی ئیسلامیی سنووردار، یان فراوان، ئەگەر بگونجێ!

**تاکە فەرموودەیەك لە بارەی خیلافەتەوە:**

ئەوانەی زۆر باسی گێڕانەوەی حوکمی خیلافەت (إعـادة حكـم الخلافـة) دەکـەن، پشت بەم فەرموودەیە دەبەستن، کە تاکە فەرموودەیـە لـەو بـارەوە: **{عَنْ حُذَيْفَةَ قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تَكُونُ النُّبُوَّةُ فِيكُمْ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ تَكُونَ، ثُمَّ يَرْفَعُهَا إِذَا شَاءَ أَنْ يَرْفَعَهَا، ثُمَّ تَكُونُ خِلَافَةٌ عَلَى مِنْهَاجِ النُّبُوَّةِ، فَتَكُونُ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ تَكُونَ ثُمَّ يَرْفَعُهَا إِذَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَرْفَعَهَا، ثُمَّ تَكُونُ مُلْكًا عَاضًّا، فَيَكُونُ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَكُونَ، ثُمَّ يَرْفَعُهَا إِذَا شَاءَ أَنْ يَرْفَعَهَا، ثُمَّ تَكُونُ مُلْكًا جَبْرِيَّةً فَتَكُونُ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ تَكُونَ، ثُمَّ يَرْفَعُهَا إِذَا شَاءَ أَنْ يَرْفَعَهَا ثُمَّ تَكُونُ خِلَافَةً عَلَى مِنْهَاجِ النُّبُوَّةِ}**[1]

واتە: ئەوەندەی خوا بیـەوێ پێغەمبەرایـەتیی لـە نێوتانـدا دەمێنێتـەوە، دوایـی هەرکات ویستی لا یبەرێ، لای دەبات، ئنجا جێنشینایەتیی دەبێ بە پێـی ڕێبـازی پێغەمبەرایـەتیی، هـەتا خـوا بیـەوێ دەمێنێتـەوە، ئنجـا هـەرکات خـوا ویسـتی لایبەرێ، لایدەبات، ئنجا حوکمڕانێتیی ستەمکارانە دەبێ‌و بـەردەوام دەبـێ، تـاکو خـوا بیـەوێ دەوام بکـات، پاشـان هـەرکات ویسـتی لای ببـات، لایـدەبات، ئنجـا حوکمڕانێتیی خۆسپێنەرانە دەبـێ‌و، هـەتا خـوا بیـەوێ دەوام دەکـات، پاشـان هـەر کـات ویسـتی لای ببـات، لایـدەبات، دوایـی خیلافـەت دەبـێ لەسـەر ڕێبـازی پێغەمبەرایەتیی.

[1] أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٨٤٣٠) تعليق شعيب الأرنؤوط: إِسْنَادُهُ حَسَنٌ.

شایانی باسیشە ئەم فەرموودەیە زانایانی فەرموودەناس مشتو مڕیان لە بارەی سەنەدەکەیەوە هەیەو، ئەو پەڕەکەی بە جۆری باش (حسن)ی دادەنێنو، بەوجۆرە فەرموودانەش حوکمێکی گەورەو گرانی وەك سیستمی خیلافەت -کە پابەندکەر (مُلْزِم) بێ بۆ مسوڵمانان، لە هەموو ڕۆژگارەکاندا- ناچەسپێ، ئەوە لەلایەکەوەو لەلایەکی دیکەشەوە: ئەو دەقە هیچ فەرمانێکی تێدا نیە بۆ مسوڵمانانو، تەنیا هەواڵدان (إخبار)ە بە داهاتوو.

ئنجا لەڕاستییدا ئەگەر وەك واقیعیش تەماشای جیهانی ئیسلامیی بکەین، بە هەموو دەوڵەتو قەوارە سیاسییەکانیەوە، دڵنیا دەبین کە ئەگەر بویسترێ سەرجەم مسوڵمانان لەیەك قەوارەی سیاسییدا کۆببنەوە، دەبێ بیر لە سیستمی کۆنفیدراڵیی یان فیدراڵیی بکرێتەوە، کە زۆر شێوەی سیستمی ویلایەتەکان (نظام الولایات) دەکات، کە کاتی خۆی دەوڵەتی ئیسلامیی لە هەر پێنج چاخەکانی: (پێغەمبەری خوا (صَلّی اللّهُ عَلَیْهِ وَسَلّمَ)و، خەلیفە ڕاشیدەکانو، ئومەوییەکانو، عەبباسییەکانو عوسمانییەکان) دا پێی بەڕێوە چووەو، شتێکی نامۆ (غریب)نیە بەکلتوورو ئەزموونی ئیسلامیی، لە بواری حوکمڕانییدا.

## چوارەم: قەوارەکەی (داعش) نە دەوڵەتی ئیسلامییە نە خیلافەت:

لەبەر رۆشنایی ئەوەدا کەلە سێ خاڵی پێشوودا، رابرد، دەڵێین: ئەو قەوارە سیاسییەی کە رێکخراوی(الدولة الإسلامیةُ)ناسراو بە (داعش) رایگەیاندوە، بەناوی دەوڵەتی خیلافەتەوە، هیچ رەوایەتییەکی نیەو، لەگەڵ بنەمایەکانی شەریعەتدا تێکگیراو و نەگونجاوە، چونکە:

یەك: نەك هەر پرسو راوێژیان بە تێکرای مسوڵمانانو مشوور خۆرانیان نەکردوە، بەڵکو تەنانەت راوێژیان بەو خەڵکە کەمەش نەکردوە، کە قەوارە سیاسییەکەیانیان لەسەر سەر زەمینەکەیان، لە سوریاو عێراقدا، بنیات ناوە!

دوو: قەوارەکەیان هیچ کام لەو حەوت تایبەتمەندییەی کە لە دەوڵەتی خیلافەتی راشیدەدا هەبوون، بوونیان نیە:

١- (أبو بکرالبغدادي) بابایەکی نەناسراوەو، هەتا ئێستا هیچ کەسایەتییەکی ئیسلامییو زانایەکی متمانە پێکراوو موعتەبەر، نەك هەر پشتگیریی، بگرە تەنانەت ستایشیشی نەکردوە! یانی: پێشینەیەکی وای نیە وای لێبکات شایستەی ئیددیعایەکی وا گەورە بێ، بۆ ناسینی زیاتریشی واباشە سەرنجی کتێبی(الدولة الإسلامية بین الحقیقة والوهم)ی (أبي عبدالله محمد المنصور)بدرێ، کە نووسەرەکەی مامۆستای (أبو بکر البغدادي)بووەو لە نیزیکەوە دەیناسێ.

٢- ئەو رێکخراوە-کە ئەو پەڕەکەی چەند هەزار کەسێکن -بێجگە لە خۆیان راوێژیان بە هیچ کەس نەکردوە بۆ کارەکەیان(دانانی خەلیفە!)، ئنجا لە حالێکدا کە ژمارەی تێکرای مسوڵمانان لەم رۆژگارەدا، لە ملیارو نیوێك زیاترە، ئایا رێژە (نسبة)ی ئەندامو لایەنگرانی ئەو رێکخراوە (داعش)لە نێو

ئەو هەزارو پێنج سەد ملیۆن (١,٥٠٠,٠٠٠,٠٠٠)دا،سەدا چەندەو، بە چ حەقێك، بەبێ ئاگاداریی‌و ڕاوێژو ڕەزامەندییان،حوكمڕان‌و خەلیفەیان بۆ دادەنێن، ئەویش بابایەكی نەناسراو؟!!

٣ - دانانی ئەو بەناو خەلیفەیە، نەك هەر لە كەش‌و هەوایەكی ئازادو سەربەستدا نەبووە، بەڵكو لە كەش‌و هەوایەكی پڕ هەڕەشەو گوڕەشە -بگرە كوشتن‌و بڕین‌و شێوازی ئەمنییانە-ی وا دا بووە، كە هیچ جیاوازیی لەگەڵ هی ڕژێمە تاكڕەو و دیكتاتۆرەكاندا نەبووە.

٤ - ئەو قەوارەسیاسییە، نەك هەر مایەی تەبایی‌و یەكڕیزیی مسوڵمانانی ژێر ڕكێفی نەبووە، چ لە سووریاو چ لە عێراق، بەڵكو هۆكاری كوشتارێكی نێوخۆیی زۆرو، ئاژاوەو ئاڵۆزییەكی بێڕەزا بوو، كە ئێستاش بەردەوامە!

٥ — وەك پێشتریش باسمان كرد: ئەو قەوارەیەو ئەو بەناو خیلافەتە، نەك هەر سەرجەم مسوڵمانانی لە ژێر سایەی خۆیدا نەحەواندۆتەوە بە خۆشحاڵییەوە، بەڵكو لەسەر سەر زەمینێكی لێك دابڕاو و پچڕ پچڕی بەشێك لە سووریاو عێراقدا، چەند ملیۆن كەسێكی بەزۆر خستۆتە ژێر ڕكێفی خۆیەوە، كە زۆربەی هەرە زۆری ئەو خەڵكە، نەك هەر ناڕازی، بگرە زۆریش بێزارو نیگەران‌و ناڕەحەتن!

٦- ئەوقەوارەسیاسییە،نەك وەك دەوڵەتی خیلافەتی ڕاشیدە، نەیتوانیوە، نامسوڵمانان بەڕێزوحورمەت‌و خۆشحاڵییەوە لەژێر سایەی خۆیدا بحەوێنێتەوە، بگرە نەیتوانیوە مسوڵمانانیش بحەوێنێتەوەو، بەنسبەت نامسوڵمانانیش،لە یەزیدیی‌و نەصرانییەكان،لە دنیادا دەنگی دایەوە،چییان پێكرا:لە كوشتن‌و بەكۆیلەكردن‌و دەركران‌و.... هتد!

٧- ئەو قەوارە بەناو دەوڵەتی خیلافەتەی(داعش)نەك هەر بەهاو ئامانجە بەرزەكانی وەك: دادگەریی‌و ئازادیی‌و یەكسانیی‌و ئارامیی‌و ئاسایش‌و بە

ختەوەریی و گەشەکردن و ئاوەدانیی و...هتدی نەهێناونە دی، بگرە ڕاست پێچەوانەی ئەوەی بەدیاریی بۆ خەڵکی ژێر ڕکێفی خۆی هێناوەو، ئەگەر بڵێین: ئەندامانی(داعش) لە جیاتی ژیان و ئاوەدانیی، پرۆژەی مەرگ و وێرانییان پێیەو، لە جیاتی واقیعی ئێستا، لە مێژوودا دەژین، شتێکی ڕاست و بە جێمان گوتوە.

## دەستپێک

خوێنەری خۆشەویست!

یەکێك لە ڕەفتارە هەرە خراپو دژ بەشەریعەتەکانی گرووپە پەرگیرەکان (المجموعات المتطرفة)، بەتایبەت (داعش) بریتیە لە کوشتنو بڕینو بەزاندنی هەموو سنوورەکان،لەپەنابردنەبەر ترساندنو تۆقاندنو دڵڕەقییدا،چ بەرانبەر بە نامسوڵمانانو، چ بەرانبەر بە مسوڵمانانو،بگرە ئەو گرووپە ئیسلامییانەش کەلە پێش واندا،دژی ستەمو دەستدرێژیی ڕژێمەکان، چەکیان هەڵگرتوە! ئنجا ئایا ئەو ڕەفتارە لە تەرازووی شەریعەتدا چۆنە؟

با سەرنج بدەین:

### یەکەم: چەند ئایەتێکی قورئان لە بارەی گەورەیی تاوانی کوشتنی بە ناهەقەوە:

١- ﴿مِنْ أَجْلِ ذَٰلِكَ كَتَبْنَا عَلَىٰ بَنِي إِسْرَائِيلَ أَنَّهُ مَن قَتَلَ نَفْسًا بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِي الْأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ النَّاسَ جَمِيعًا وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَا أَحْيَا النَّاسَ جَمِيعًا ..... ﴿٣٢﴾﴾ المائدة.

واتە: لەبەر ئەوە (کە ڕابرد) لەسەر بەنی ئیسرائیلمان نووسی کە: هەر کەسێك کەسێك بکوژێ، بێئەوەی کەسی کوشتبێ، یان ئاژاوەگێڕیی لە زەوییدا کردبێ، وەك ئەوە وایە تێکڕای خەڵکی کوشتبێ، وە هەر کەسێك کەسێك بژیەنێتەوە (لە

مەرگ دەربازی بكات) وەك ئەوە وایە، تێكڕای خەڵكی زیندوو كردبێتەوە (لە مەرگ قوتاری كردبن).

٢- ﴿ وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ خَٰلِدًا فِيهَا وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُۥ وَأَعَدَّ لَهُۥ عَذَابًا عَظِيمًا ﴿٩٣﴾ ﴾ النساء.

واتە: هەر كەسێك بە ئانقەست بڕواداریك بكوژێ، ئەوە سزایەكەی دۆزەخە، بە هەمیشەیی تێیدا دەمێنێتەوەو، خوا لێی تووڕە بووەو نەفرینی لێكردوەو، ئازارێكی مەزنی بۆ داناوە.

**دووەم: چەند فەرمایشتێكی پێغەمبەری خاتەم (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) لەبارەی كوشتنی بە ناهەقەوە:**

١- **{أَوَّلُ مَا يُقْضَى بَيْنَ ٱلنَّاسِ يَوْمَ ٱلْقِيَامَةِ فِي ٱلدِّمَاءِ}**[1]

واتە: یەكەم شتێك كە لە ڕۆژی قیامەتدا، لە نێوان خەڵكدا دادوەریی لە بارەوە دەكرێ، خوێنەكانن.

٢- **{فَإِنَّ دِمَاءَكُمْ، وَأَمْوَالَكُمْ، وَأَعْرَاضَكُمْ حَرَامٌ عَلَيْكُمْ، كَحُرْمَةِ يَوْمِكُمْ هَذَا فِي شَهْرِكُمْ هَذَا فِي بَلَدِكُمْ هَذَا إِلَى يَوْمِ تَلْقَوْنَهُ، فَلَا تَرْجِعُوا بَعْدِي كُفَّاراً يَضْرِبُ بعضكم رِقَابَ بَعْضٍ! ثُمَّ قَالَ: اللهمَّ هَلْ بَلَّغْتُ؟ يُبَلِّغُ الشَّاهِدُ الْغَائِبَ}.**[2]

واتە: ... دەجا خوێنەكانتانو سامانەكانتانو ئابڕوو و ناموسەكانتان (واتە: هی هەندێكتان لە هەندێكتان) قەدەغەن، وەك قەدەغەبوونی ئەمڕۆژەتان (كە ڕۆژی

[1] أَخْرَجَهُ ابْنُ أَبِي شَيْبَةَ برقم: (٢٧٩٤٨)، وَأَحْمَد برقم: (٣٦٧٤)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٦٤٧١)، وَالنَّسَائِيُّ في "الكبرى" برقم: (٣٤٥٥)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢٦١٥).

[2] مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ: البُخَارِيُّ برقم: (٧٤٤٧)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٤٣٥٩).

جومعە بوو لە عەرەفە، لە حەجی ماڵئاواییدا) لەم مانگەتاندا، تاکو ئەو ڕۆژەی بە پەروەردگارتان دەگەنەوەو، {لەبارەی کردەوەکانتانەوە لێتان دەپرسێتەوە}، دەجا دوای من کافر مەبنەوە -یان گومڕا مەبنەوە- کە هەندێکتان لە گەردنی هەندێکتان بدەن! ئەی خوایە! ئایا گەیاندم؟! با ئەوەی لێرە ئامادەیە، (ئەم قسانەم) بەو کەسە بگەیەنێ کە لێرە ئامادە نیە.

٣- {لَنْ يَزَالَ الْمُؤْمِنُ فِي فُسْحَةٍ مِنْ دِينِهِ، مَا لَمْ يُصِبْ دَمَاً حَرَامَاً}[١]

واتە: بڕوادار لە دینداریيەکەیدا هەر لە فراوانیی دایە، مادام خوێنی ناهەقی نەڕشتبێ.

٤- {إِنَّ أَخوفَ مَا أَخَافُ عَلَيْكُمْ، رَجُلاً قَرَأَ الْقُرآنَ حَتَّى إِذَا رُئِيَتْ بَهْجَتُهُ عَلَيْهِ وكَانَ رِدْءاً لِلإِسْلاَمِ، انْسَلَخَ مِنْهُ وَنَبَذَهُ وَرَاءَ ظَهْرِهِ وَسَعَى عَلَى جاره بِالسَّيْفِ وَرَمَاهُ بِالشِّرْكِ، قَالَ: قُلْتُ: يَا نَبِيَّ اللهِ، أَيُّهُمَا أَوْلَى بِالشِّرْكِ الْمَرْمِيُّ أَوِ الرَّامِي؟ قَالَ: بَلِ الرَّامِي}[٢].

واتە: ئەوەی لە هەموو شتێك زیاتر مەترسییم لێی هەیە بۆتان: پیاوێکە قورئانی خوێندوە، هەتا کاتێك جوانییەکەی پێیەوە بینراو، پشتیوان بوو بۆ ئیسلام، لە خۆی دارنیو فڕێی دایە پاش پشتیو، شمشێری لە دراوسێیەکەی دەستدایەو، تۆمەتباری کرد بە شیرك، گوتم (واتە: حذیفة) ئەی پێغەمبەری خوا! ئایا کامیان لە پێشترە لە شیرك، تۆمەتبارکار، یان تۆمەتبارکراو؟ فەرمووی: بەڵکو تۆمەتبارکار.

٥- {لا يَحُولَنَّ بَيْنَ أَحَدِكُمْ وَبَيْنَ الْجَنَّةِ "وَهُوَ يَرَاهَا" مِلْءُ كَفٍّ مِنْ دَمِ مُسْلِمٍ أَهْرَاقَهُ ظُلْمَاً}[٣].

١) أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٦٨٦٢)،

٢) أَخْرَجَهُ ابْنُ حِبَّانَ برقم: (٨١)، وَصَحَّحَهُ الألباني في "السلسلة الصحيحة" رقم: (٣٢٠١).

٣) أَخْرَجَهُ الطبراني في "الكبير" برقم: (١٦٦١) . قال الهيثمي: رجاله موثقون .

واتە: با لوێچێك خوێن، كە یەكێكتان بە ناهەق لە مسوڵمانێكی دەڕێژێ، ڕێی چوونە بە هەشتی لێنەگرێ، لە حاڵێكدا كە دەیبینێ..

٦- {لَزَوَالُ الدُّنْيَا أَهْوَنُ عَلَى اللهِ مِنْ قَتْلِ مُؤْمِنٍ بِغَيْرِ حَقٍّ}.(١)

واتە: تێكچوونی دنیا لەلای خوا كەمترە، لەكوشتنی مرۆڤێكی مسوڵمان بە ناهەق.

٧- {مَنْ حَمَلَ عَلَيْنَا السِّلاحَ فَلَيْسَ مِنَّا}.(٢)

واتە: هەر كەسێك چەكمان لە دژی هەڵبگرێ، لە ئێمە نیە. هەڵبەتە هەر كەسێكیش بەڕاستیی بڕوای بەو ئایەتانەی قورئانو، فەرمایشتانەی پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) هەبێ، هەرگیز دەستی ناچێتە ڕشتنی خوێنی هیچ كەسێك- بە ناهەق- چ مسوڵمان بێ،چ نامسوڵمان، چونكە ئەگەر هەندێك لە ئایەتو فەرمایشتەكان باسی بڕواداران‌و مسوڵمانان دەكەن،هەندێكی دیكەیان بە گشتی باسی نەفس (نفس)و، خوێن (دم)ی مرۆڤەكان دەكەن!

## سەربڕینی مرۆڤ لەم ڕۆژگارەدا، ڕەفتارێكی نا شەرعییە:

یەكێك لەو كردارو ڕەفتارە زەقو ڕەقو سڵەمێنەرەوانەی ڕێكخراوی (داعش) كە بەهۆیانەوە ناوی خۆی بە خراپە زڕاند لە دنیادا، بریتی بوو لە سەربڕینی خەڵك، ئنجا ئایا ئەو ڕەفتارە لەم ڕۆژگارەدا، دروست (جائز)ە، یان نا؟!

١) أَخْرَجَهُ التِّرمِذِيّ برقم: (١٣٩٥)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢٦١٩)، وَصَحَّحَهُ الألباني.
٢) أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٦٦٦٠)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٠٠)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٤٥٩)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢٥٧٧).

لە وەڵامدا دەڵێین: نەخێر دروست نیە، چونکە:

**یەکەم**: لە چەندان فەرمایشتی پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ)و شوێنەوار (أثر)ی زانایاندا هاتوە، کە ئەتك کردن (مُثْلَة)ی جەستەی کوژراوان و شێواندنیان، قەدەغەیەو دروست نیە، بۆ وێنە:

١- {أُغْزُوا، وَلا تَغُلُّوا، وَلا تَغْدُرُوا، وَلا تُمَثِّلُوا}.[1]

واتە: جەنگ بکەن (لە ڕێی خوادا)و، دزیی لە دەستکەوت مەکەن و، پەیمان مەشکێنن و، جەستەی کوژراوان ئەتك مەکەن و مەشێوێنن.

٢- {أَعَفُّ النَّاسِ قِتْلَة: أَهْلُ الإِيمانِ}.[2]

واتە: خاوەن بڕوایان لە هەموو کەس دەستپاکترن لە کوشتندا.

٣- {عَنْ عُقْبَة بن عَامر أَنَّهُ قَدِمَ عَلَى أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيق رَضِيَ اللهُ عَنْهُ بِرَأْسِ، البَطْرِيق، فَأَنْكَرَ ذَلِكَ، فَقَالَ: يَا خَلِيفَةَ رَسُول الله! إِنَّهُمْ يَفْعَلُونَ ذَلِكَ بِنَا! قَالَ: أَفَاسْتِنَانٌ بِفَارِسَ وَالرُّومِ؟! لاَ يُحْمَلُ إِلَيَّ رَأْسٌ فَإِنَّمَا يَكْفِي الْكِتَابُ وَالْخَبَرُ}.[3]

واتە: عوقبەی کوڕی عامیر دەڵێ کە: بەسەری بەتریکەوە (پێشەوایەکی نەصرانییەکان بووە) چۆتە لای (أبوبکر الصدیق) ئەویش ڕەخنەی لەوکارە گرتوە، ئەویش گوتوویەتی: ئەی جێنشینی پێغەمبەری خوا! ئەوان ئەو ڕەفتارەمان لەگەڵ دەکەن! ئەویش فەرمووی: ئنجا ئایا چاو لە فارس و ڕۆم دەکەن؟! لەمەودوا هیچ سەرێکم بۆ مەهێنن، نامەوهەواڵ ناردن بەسە.

---

١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٢٩٧٨)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٧٣١)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٦١٢)، وَالتِّرمذيُّ برقم: (١٤٠٨)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢٨٥٨).

٢ أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٣٧٢٩) تعليق شعيب الأرنؤوط: حسن. وَأَخْرَجَهُ أَيْضاً: أَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٦٦٦)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢٦٨٢)، وَأَبُو يَعْلَى برقم: (٥١٤٧).

٣ أَخْرَجَهُ البَيْهَقِيّ برقم: (١٨١٣١)، قال ابن حجر في التلخيص (١٠٨/٤) : إسناده صحيح.

**دووەم:** ئنجا ئەگەر یەکێکیش بڵێ: ئەدی بۆچی کاتی خۆی هاوەڵان (أصحاب) "خوا لێیان ڕازی بێ" خەڵکیان سەربڕیوەو، خواش لە قورئانێدا باسی سەربڕین دەکات: (...فَضَرْبَ ٱلرِّقَابِ...)محمد:٤؟! لە وەڵامدا دەڵێین: کاتی خۆی ئاسانترین شێوازی کوشتن، بریتی بووە لە سەربڕین (ذبح) چونکە چەکی ئەو کاتە بە زۆریی شمشێر بووە،بە شمشێریش سەر لێکردنەوەی دوژمن ئاسانترەو، زووتریش گیانی لەبەردا نامێنێ، هەر بۆیەش خوا "عزوجل" باسی سەربڕینیی کافرانی شەڕفرۆش دەکات.

**سێیەم:** بەڵام ئێستا بۆیە دروست نیە مسوڵمانان، دوژمنە شەڕفرۆشەکانیان سەربڕن، چونکە:

١-ئێستا بە فیشەك یان خنکاندن، یان دەرزی لێدان، ئاسانتر مرۆڤ گیانی دەردەچێ، پێغەمبەریش "(صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ)" فەرموویەتی: (**أَعَفُّ النَّاس قِتْلَةً: أهلُ الإيمان**)[1] کەواتە: پێویستە بە چ شێوازێك مرۆڤ ئاسانتر گیانی دەربچێ، بەو شێوازە بکوژرێ.

٢- مادام ئەتك کردن (التمثيل) قەدەغەکراوەو، لەم ڕۆژگارەشدا بەپێی باو (عرف)ی ئێستا، سەربڕین بە ئەتککردنو شێواندن (مثلة) دادەنرێ، کەواتە، نابێ ئەو شێوازە بەکاربهێنرێ، چونکە وەك پێشتریش باسمان کردوە، زانایان هەموویان لەسەر ئەوە ڕێککەوتوون، کە ئەو حوکمە شەرعییانەی، پەیوەستن بە عورفو باوی کۆمەڵگاوە، هەر کات عورفو باوەکە گۆڕا،پێویستە حوکمە شەرعییەکەش بگۆڕێ، وەك (القرافي) گوتوویەتی -کە پێشتریش قسەکەیمان هێناوەو ماناشمان کردوە: (....أن إجراءَ الأحكام التي مُدْرَكُها العوائد مع تغيُّر تلك العوائد: خلاف الإجماع وجهالة في الدين، بل

١) پێشتر تخريج کرا.

کل ما هو في الشريعة يتبع العوائد، يتغَيَّرُ الحكم فيه عند تغيُّر العادة إلى ما تقتضيه العادَةُ المتجدِّدَة...)[1].

واتە: ... کە جێ بەجێکردنی ئەو حوکمە شەرعییانەی لەسەر بناغەی نەریتو باو (عرف) بنیات نراون، لەگەڵ گۆڕانی ئەو باو و نەریتانەدا، پێچەوانەی کۆڕا (ی زانایان)نو نەزانینە لە ئاییندا، بەڵکو هەرچی لە شەریعەتدا پەیوەستە بەنەریتو باوەکانەوە، لەکاتی گۆڕانی نەریتو باوەکاندا، حوکمەکەشی بۆ ئەوە دەگۆڕێ کە نەریتو باوە تازەکە دەیخوازێ..

کۆتایی ئەم باسەش بە قسەیەکی (إبن عابدين) دێنین، کە دەڵێ: (لو تَمَكَّن من كافر حال قِيَام الحَرْب: لَيْسَ لَهُ أنْ يُمَثِّل بِهِ) [2]

واتە: ئەگەر لەکاتی جەنگدا زەفەری بە کافرێك برد، بۆی نیە جەستەی بشێوێنێ.

هەڵبەتە چەمکی ئەتك کردنو جەستە شێواندن (المثلة والتمثيل)یش، بە پێی عورفو باوی کۆمەڵگاکان دەگۆڕێ، ئنجا مادام لەم ڕۆژگارەدا (سەربڕین) بە ئەتك کردنو شێواندن (مثلة) دادەنرێ، کەواتە: ئەگەر گریمان دوژمنانی ئیسلامیش پێی هەڵسن، دروست نیە مسوڵمانان وەك کاردانەوە (رد فعل)یش بیکەن،چ جای خۆیان دەستپێشخەربن!

ئنجا بەڕاستیی نەزانییو دەمارگیریی (تعصّب) مرۆڤ تووشی عەیبەی گەورەو بێڕەزا دەکات!

چەند سەیرە! هەروەك ئەو گرووپو تاقمە پەڕگیرو سەرلێشێواوانە لەم ڕۆژگارەدا هیچ هۆکارو ئامرازێکی باشتر لە سەربڕین (ذبح)یان نەدۆزیبێتەوە، بۆ خۆشەویست کردنی ئیسلام لەپێش چاوی دنیا!!

[1] الإحكام في تمييز الفتاوى عن الأحكام، وتصرفات القاضي والإمام، ص٢١٨.
[2] حاشية ابن عابدين، ج٤ ص١٣١.

## سووتاندنو خنکاندن:

بەنسبەت سووتاندنو خنکاندن (حرق وغرق)و شێوازو هونەرەکانی دیکەی مرۆڤ کوشتنیشەوە، دەڵێین:

بەپێی ئەو کە ڕابردو بەبەڵگەی فەرموودەی پێغەمبەریش (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) کە فەرموویەتی: {**إِنَّ اللَّهَ كَتَبَ الْإِحْسَانَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ فَإِذَا قَتَلْتُمْ فَأَحْسِنُوا الْقِتْلَةَ وَإِذَا ذَبَحْتُمْ فَأَحْسِنُوا الذَّبْحَ وَلْيُحِدَّ أَحَدُكُمْ شَفْرَتَهُ فَلْيُرِحْ ذَبِيحَتَهُ**} أخرجه أحمد برقم (١٧١٥٤)، والدارمي برقم (١٩٧٠)، ومسلم برقم (١٩٥٥)، وأبو داود برقم (٢٨١٥)، والترمذي برقم (١٤٠٩)، وقال: حسن صحيح، وابن أبي شيبة برقم (٢٧٩٢٩) ، والبيهقي في شعب الإيمان برقم (١١٠٧١).

واتە: خوای بەرز، چاك ئەنجامدانی بۆ هەموو شتێك پێویست کردوە، ئنجا ئەگەر شتێکتان کوشت بەشێوەیەکی جوان بیکوژنو، ئەگەر شتێکتان سەربڕی، جوانی سەر ببڕنو، با یەکێکتان چۆقۆیەکەی تیژ بکاتو سەربڕاوەکەی زوو ئاسوودە بکات.

هەڵبەتە بەشێك لە زانایان ڕایان وایە: لە کاردانەوەداو وەك تۆڵە (ثَأر) دروستە پەنا بۆ ئەو شێوازانەش ببرێ، بەڵام من پێم وایە: لەو حاڵەتانەشدا هەر دروست نیە، ئەو شێوازانە بەکار بێن، چونکە هەمیشە ئەهلی ئیسلام دەبێ لە ئاستی بەرزی ئیسلامدا بنو، مەرج نیە هەرچی نەیارەکانیان لە دژیان کردن بۆیان ڕەوابێ بیکەنو، فەرموودەکەی پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ): {**أعف الناس قِتْلَةً أهل الإيمان**} أخرجه أبو داود برقم (٢٦٦٦)، وابن ماجه برقم (٢٦٨٢)، والبيهقي برقم (١٥٨٥٧).

هەروەها قسەو هەڵوێستەکەی ئەبو بەکری صددیق خوا لێی ڕازیێ: {**أفستنانٌ بفارس والروم؟**} بەڵگەن لەو بارەوە.

## کوشتنی خەڵکی مەدەنیی و لاشەڕ دروست نیە:

لەو بارەوەش فەرموودەو شوێنەوار زۆرن و، پێش فەرموودەو شوێنەواریش، ئایەتی: ﴿ وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمۡ وَلَا تَعۡتَدُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ١٩٠ ﴾البقرة.

واته: هەروەها لە پێناوی خوادا دژی ئەوانە بجەنگن کە لە دژتان دەجەنگن و، دەستدرێژیی مەکەن، بێگومان خوا دەستدرێژکارانی خۆشناوێن.

بەڵێ ئەم ئایەتە موبارەکە بەڵگەیەکی ڕوون و بێ چەندو چوونە، لەسەرئەوە کە دروست نیە لە جەنگیشدا، خەڵکی لاشەڕو مەدەنیی بکوژرێ.

پێغەمبەری خواش (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) لەو بارەوە، ئەم دەقەی لێ گێڕراوەتەوە:

**{عَنْ عَبْدِ اللهِ أَنَّ امْرَأَةً وُجِدَتْ فِي بَعْضِ مَغَازِي رَسُولِ اللهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَقْتُولَةً، فَأَنْكَرَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَتْلَ النِّسَاءِ وَالصِّبْيَانِ}**[1].

واته: لە یەکێك لە جەنگەکانی پێغەمبەردا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) ئافرەتێکی کوژراو بینرا، پێغەمبەری خواش (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) کوشتنی ئافرەتان و منداڵانی قەدەغەکرد.

هەروەها هەر لەو بارەوە ئەو قسەیەی خەلیفەی پێغەمبەری خوا(أبو بكر الصديق)"خوا لێی ڕازی بێ" دێنین کە ئامۆژگاریی (يزيد بن أبي سفيان) یەکێك لە فەرماندەکانی دەکات و دەڵێ: **{وَإِنِّي مُوصِيكَ بِعَشْرٍ: لاَ تَقْتُلَنَّ امْرَأَةً، وَلاَ صَبِيّاً، وَلاَ كَبِيراً هَرِمًا، وَلاَ تَقْطَعَنَّ شَجَرَاً مُثْمِراً، وَلاَ تُخَرِّبَنَّ عَامِراً، وَلاَ تَعْقِرَنَّ**

---

[1] أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٣٠١٤)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٧٤٤).

**شَاةً، وَلاَ بَعِيراً، إِلاَّ لِمَأْكَلَةٍ، وَلاَ تُحْرِقَنَّ نَحْلاً، وَلاَ تُغْرِقَنَّهُ، وَلاَ تَغْلُلْ، وَلاَ تَجْبُنْ }**[1].

واتە: من ئامۆژگارییت دەکەم بە دە (١٠) شتان:

١- ئافرەت مەکوژە.

٢- هەروەها منداڵ.

٣- هەروەها پیری کەنەفت.

٤- درەختی بەردار مەبڕە.

٥- هیچ خانوویێك تێك مەدەن.

٦- مەگەر بۆ خواردن،دەنا مەڕ سەرمەبڕە.

٧- دارخورما مەبڕە.

٨- مەیسووتێنە.

٩- دەستکەوت مەشارەوە.

١٠- مەترسە.

هەڵبەتە ئافرەتو پیرومنداڵ، ئەگەر بەشداریی جەنگیان کرد، حوکمی جەنگاوەرانیان هەیەو دەکوژرێن.

کەواتە:خەڵکی ڕۆژنامەنووس، یان کارمەندی ڕێکخراوە مەدەنییەکان، ..هتد، دروست نیە بکوژرێن، بادەوڵەتو ڕژێمەکانیشیان لەحاڵەتی جەنگدا بن.

ئنجا جێی سەرسووڕمان ئەوەیە کە ڕێکخراوە پەڕگیرەکان، بە تایبەت (داعش) چەند جارێك ئەو جۆرە کەسانەیان کوشتوون، ئەویش بە شێوەی سەربڕینو، سەرەنجام وێڕای گوناهباریی لای خواو قیامەت، عەیبدارییو ناوبەدبوونی دنیاولای خەڵکیشیان وەدەست هێناوە!

---

[1] أَخْرَجَهُ مالك في "الموطأ" برقم: (١٦٢٧) وَإبْنُ أَبي شَيْبَة برقم: (٣٣٩٧٣)، وَالبَيْهَقِيّ فِي "الكبرى" برقم: (١٨٦١٢).

ئنجا بەڕاستی شتێکی سەیرە، گرووپێك بەهۆی سەربڕینی چەند کەسێکەوە، ئاوا خۆی ناشیرینو ناوبەد بکات، لە حالێکدا کە دەوڵەتو ڕژێمی وا هەیە، هەزاران کەس بە شێوەیەك لە شێوەکان دەکوژێ، بێ ئەوەی خۆی لێ بکاتە خاوەن!

ئنجا ئەوەیە کە گوتراوە:ئەوەی نەزان بە خۆی دەکات، دوژمنی ناتوانێ پێی بکات: (قد يبلغ الجاهل من نفسه، مالا يبلغُ منه عَدُوُّهُ).

خوێنەری بەڕێز!

یەکی دیکە لە هەڵوێستو ڕەفتارە ناشەرعییەکانی گرووپە پەڕگیرەکان (المجموعات المتطرفة) بە تایبەت (داعش) بریتیە لە: بە زۆر پەیمان (بیعة) وەرگرتن لە خەڵكو پابەند (مُلْزَم) کردنیان بە گوێڕایەڵییو فەرمانبەریی(السمع والطاعة) بۆ ئاراستەو فەرمانەکانیان،کە بێگومان ئەوە-واتە بە زۆر ناچارکردنی خەڵك بە بەیعەتدانو فەرمانبەریی کردن-نەك هەر شتێکی ڕاستو شەرعیی نیە، بەڵکو ڕاست دژو پێچەوانەی شەریعەتە، چونکە ئیسلام ئەگەر ڕێ نەدات، خۆی وەك ئایینو بەرنامەیەك، کە دوا پەیامو بەرنامەی خوایە بۆ مرۆڤایەتیی،بە زۆر لێکردن (إكراه) بەسەر خەڵکدا بسەپێنرێ، ئەوە چاکتر ڕێ نادات، بە هیچ کەسو گرووپو لایەنێك، کە بە زۆر خۆی بسەپێنیو، خەڵك ناچار بکات بە پەیمان پێدانیو گوێڕایەڵییو فەرمانبەریی بۆ کردنی.

بەڵێ ئەگەر زۆر لێکردنو ناچارکردن (إكراه وإجبار) لە ئەسڵی ئاییندا، بۆ خودی ئیسلام دروست نەبێ:﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ ﴿٢٥٦﴾ ﴾البقرة، ئەوە بێگومان بۆ کارو پرۆژەیەکی ئیسلامیی-ڕاست یان چەوت- کە ڕێکخراوو گرووپێك تەبەنیی کردوە، چاکتر دروستو ڕەوانیە، کەبەسەر خەڵکدا بسەپێنرێ.

ئنجا لە ڕاستییدا ئەو بەزۆر خۆ بەسەر خەڵکدا سەپاندنو، پەیمانی گوێڕایەڵییو فەرمانبەریی بۆ کران، لێوەرگرتنە، عادەتو کلتووری بنەماڵەی سەرەتا ئومەوییو، پاشان عەبباسییو، دواتر عوسمانییەکان بوو، کە دیارە ئەوانیش کارتێکراو (متأثر) بوون بە عادەتی باوی ئەوسای بنەماڵە حوکمڕانەکانی ولاتانی دنیاو، هیچ پەیوەندییەکی کەمو زۆری بەئیسلامەوە نەبوو، هەر بۆیەش مسوڵمانان بەدرێژایی حوکمڕانیی ئەو سێ بنەماڵەیە (ئومەوییو عەبباسییو عوسمانیی)

چەندان شۆڕشو ڕاپەڕینیان لە دژیان کردوە، وەك هەوڵدان بۆ گێڕانەوەی حوکمی ڕاوێژ (حكم الشورى)و ڕاستکردنەوەی ئەو واقیعە خوارو لارەی کە حوکمی میراتییو بنەماڵەیی، هێنا بوویە ئاراوەو، هەمیشەش زانایانی متمانە پێکراوی ئیسلام -بەپێی بۆ لوانیان- پشتگیرو هاوکاری ئەو ڕاپەڕینو شۆڕشانە بوون، کە بێگومان مەرجیش نیە هەموویان هەر کەسانی ڕاستو ساغو دڵسۆز بۆ ئیسلام پێیان هەڵسابن.

شایانی باسیشە هەر لە سەرەتای دەستپێکردنی لادان (إنحراف) لە حوکمڕانیی ڕاوێژیی (الحكمُ الشوريُّ)یەوە لەسەر دەستی (معاوية بن أبي سفيان) کە وەك فەرموودەی پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ئاماژەی پێکردوە، یەکەمین کەس بووە کە ڕێبازو شێوازی پێغەمبەری خوای گۆڕی، وەك فەرموویەتی: {**أَوَّلُ مَنْ يُغَيِّرُ سُنَّتِي: رَجُلٌ مِنْ بَنِي أُمَيَّةَ**}[1]

واتە: یەکەمین کەس کە ڕێبازی من دەگۆڕێ: پیاوێکە لە (هۆزی) بەنی ئومەییە، شیخ ئەلبانییش "خوا لێی خۆشبێ" گوتوویەتی: لەوانەیە مەبەست لە فەرموودەکە گۆڕینی سیستمی هەڵبژاردنی خەلیفە بێ (لە ڕاوێژەوە)وەو گێڕانی بێ بە میراتیی.

بەڵێ، ئنجا هەر لە سەرەتای ئەو لادانەوە، زانایان بێ دەنگ نەبوونو، بالەو بارەوە گوێ لەم دەقە بگرین: لە (صحيح تأريخ الطبري)دا[2] دەڵێ: {أَخْرَجَ الْبُخَارِي في صحيحه: كتاب التفسير- ج:٤٨٢٧" عَنْ يُوسُفَ بْنِ مَاهَكَ قَالَ كَانَ

---

١ أَخْرَجَهُ ابن أبي عاصم في "الأوائل " ٢/٧، وابن كثير في "البداية والنهاية" ج٢ص٢٤٣، والسيوطي في "الجامع الصغير" برقم: ٢٨٤، وقال الألباني في "السلسلة الصحيحة" برقم: ١٧٤٩، ص٣٢٩، ٣٣٠. قلت: هذا إسناد حسن ولعل المراد بالحديث: تغيير نظام اختيار الخليفة وجعله وراثة.

٢ ج٤ ص١١١، محمد بن طاهر البرزنجي.

مَرْوَانُ عَلَى الْحِجَازِ اسْتَعْمَلَهُ مُعَاوِيَةُ فَخَطَبَ فَجَعَلَ يَذْكُرُ يَزِيدَ بْنَ مُعَاوِيَةَ لِكَيْ يُبَايَعَ لَهُ بَعْدَ أَبِيهِ، فَقَالَ لَهُ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِي بَكْرٍ شَيْئًا فَقَالَ خُذُوهُ، فَدَخَلَ بَيْتَ عَائِشَةَ فَلَمْ يَقْدِرُوا عليه، فَقَالَ مَرْوَانُ: إِنَّ هَذَا الَّذِي أَنْزَلَ اللَّهُ فِيهِ: (وَالَّذِي قَالَ لِوَالِدَيْهِ أُفٍّ لَكُمَا أَتَعِدَانِنِي أن أُخرج)، فَقَالَتْ عَائِشَةُ مِنْ وَرَاءِ الْحِجَابِ: مَا أَنْزَلَ اللَّهُ فِينَا شَيْئًا مِنْ الْقُرْآنِ إِلَّا أَنَّ اللَّهَ أَنْزَلَ عُذْرِي.

قلنا: والشيءُ الذي قَالَهُ عبدالرحمن بن أبي بكر، هو ما بَيَّنَتْهُ رواية ابن أبي حاتم عن عبدالله بن المديني قال: إني لفي المسجد حين خطب مروان فقال: إن الله أرى أمير المؤمنين في يزيد رأياً حسناً، وإن يَسْتَخْلِفْهُ فقد استخلف أبو بكرُ عمرَ، فقالَ عبدالرحمن بن أبي بكر: أَهِرقليَّةُ؟ إن أبا بكر والله ماجعلها في أحد من ولده، ولا أحَدٍ من أهل بيته، ولا جعلها معاوية في ولده إلاّ رحمة بولده وكرامة، تفسيرابن كثير سورة الأحقاف، آية: ١٧}.

واته: (يوسف)ی کوڕی (ماهك) گوتوویەتی: موعاویە مەڕوانی لەسەر حیجاز کردبووە حوکمڕان، ئنجا (مەڕوان) وتاری داو باسی یەزیدی کوڕی موعاویەی کرد، تاکو دوای مردنی بابی پەیمانی بۆ وەربگرێ، (عبدالرحمن) کوڕی (أبوبکر)یش شتێکی گوت، (مەڕوان) گوتی: بیگرن، ئەویش چووە ماڵی عائیشەوەو نەیانتوانی بیگرن.

ئنجا مەڕوان گوتی: ئەمە ئەو کەسەیە کە خوا ئەوەی لە بارەوە ناردۆتە خوارێ: {ئەو کەسەی کە بە بابو دایکی خۆی گوت: ئۆف بۆ ئێوە! ئایا گفتم پێدەدەن کە (پاش مردنم) لە زەوی بهێنرێمەوە دەرێ؟} عائیشەش لە پشت پەردەوە گوتی: خوا جگە لە پاکیی‌و بێ گوناهیی من، هیچی لە قورئاندا لە بارەی ئێمەوە نەناردۆتە خوارێ.

گوتمان: ئەو شتەش کە (عبدالرحمن)ی کوڕی (أبو بكر) گوتوویەتی: ئەوەیە کە ڕیوایەتەکەی (إبن أبي حاتم) لە (عبدالله بن المديني)یەوە هێناویەتی، گوتوویەتی:

ئێمە لە مزگەوتێ بووین، کاتێك مەڕوان وتاریداو گوتی: خوا لە بارەی یەزیدەوە، ڕایەکی باشی پێشانی فەرمانداری بڕواداران داوەو، ئەگەر بیشیکاتە جێنشین، ئەوە ئەبوبەکریش عومەری کردۆتە جێنشین، (عبدالرحمن)ی کوڕی ئەبوبەکریش گوتی: بۆچی هیرەقلایەتییە؟ بە خوا ئەبو بەکر حوکمڕانیی پێشنیار نەکرد، نە بۆ هیچ کوڕێکی، نە بۆ هیچ کام لە خزمانی، بەلام موعاویە، تەنیا وەك سۆزداریی‌و ڕێزلێگرتنی کوڕەکەی، کوڕەکەی داناوە.

کەواتە: هەر لە سەرەتاوە مسوڵمانان زانیویانە کەئەوەی موعاویە کردوویەتی، لادان بووە لە جادەی شەریعەت‌و، چاولێکردن‌و لاسایی کردنەوەی فارس‌و ڕۆم‌و، سیستمە میراتییە خۆ سەپێنەرەکەیان بووە.

بۆیە پێویستە هەموولایەك بزانن کە: بەزۆر پەیمان وەرگرتن لە خەڵك‌و، بە تۆبزیی ناچارکردنیان بە گوێڕایەڵیی‌و فەرمانبەریی، وەك ڕێکخراوی (داعش)زۆر بەزەقیی کردوویەتە پیشەو، کەم‌و زۆر هەندێك گرووپ‌و ڕێکخراوی دیکەش مومارەسەیان کردوە، وەك هەموو ڕەفتارە لادەرانەو ناشەرعییەکانی دیکەیان، ماڵی قەڵبەو سەربەخاوەنیەتی‌و، هیچ کەس -ئەگەر عەقڵ‌و ئینساف یان یەکێکیانی هەبێ- بۆی نیە لەسەر ئیسلامی حیساب بکات.

# ئاڵقەی دەیەم و کۆتایی:
# بەهەڵگەڕاوە (مرتد) دانانی لایەنە ئیسلامییە بەشداربووەکانی هەڵبژاردن و پڕۆسەی سیاسیی، ستەم و نەفامییەکی گەورەیە

خوێنەری سەنگینو شیرین!

وەك پێشتریش باسمان کردوە: بە کافردانانی (تکفیر)ی مسوڵمانانی ئەهلی قیبلە، یەکێکە لەنیشانەو خەسڵەتە بنەڕەتییەکانی تاقمو گرووپە پەرگیرەکان، هەر لە گرووپی (خوارج)ەوە، کە لە (علي بن أبي طالب) "خوالێی ڕازی بێ" یاخی بوون، هەتا هەموو ئەوانەی دوای وان، بەوانەی ئێستاشەوە کە لەسەر ڕچەی وان دەڕۆن.

ئاشکراشە کە بەکافردانانی مسوڵمانان، گوناهو تاوانێکی گەورەیەو، ڕەفتارێکی یەکجار مەترسیدارە بۆ خاوەنەکەی، با لەوبارەوە سەرنجی ئەو ئایەتو فارمایشتانەی خوارەوە بدەین:

١- ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا ضَرَبۡتُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَتَبَيَّنُواْ وَلَا تَقُولُواْ لِمَنۡ أَلۡقَىٰٓ إِلَيۡكُمُ ٱلسَّلَٰمَ لَسۡتَ مُؤۡمِنٗا ﴿٩٤﴾ ﴾النساء.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! هەرکات لەڕێی خوادا بەسەفەر چوون(چوون بۆ جەنگو جیهاد) بەرچاوتان ڕوون بکەنەوەو وردبنەوەو، بەکەسێك کە سەلامتان لێدەکات، مەڵێن: بڕوادارنی..

شایانی باسە: هۆی هاتنە خوار (سبب النزول)ی ئەم ئایەتە: تۆمەتبارکردن بە کوفرو پاشان کوشتنو تاڵانکردنی بابایەکی مسوڵمان بووە، لەلایەن ژمارەیەك لە مسوڵمانانەوە - واتە: هاوەڵان-، کە ئەمەش دەقی بەسەرهاتەکەیە:

{كَانَ رَجُلٌ فِي غُنَيْمَةٍ لَهُ، فَلَحِقَهُ الْمُسْلِمُونَ، فَقَالَ: السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ فَقَتَلُوهُ وَأَخَذُوا غُنَيْمَتَهُ، فَأَنْزَلَ اللهُ فِي ذَلِكَ}[1].

---

[1] أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٤٥٩١)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٣٠٢٥).

واتە: پیاوێك چەند سەر مەڕێکی پێبوون، مسوڵمانانیش پێی گەیشتن، ئەویش گوتی: سەلامتان لێ بێ (تاکو دڵنیایان بکاتەوە کە مسوڵمانە)، کەچی کوشتیانو مەڕەکانیشیان بردن، خواش لەوبارەوە ئەم ئایەتەی ناردەخوارێ.[1]

٢- ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِن جَآءَكُمْ فَاسِقٌۢ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوٓا۟ أَن تُصِيبُوا۟ قَوْمًۢا بِجَهَـٰلَةٍ فَتُصْبِحُوا۟ عَلَىٰ مَا فَعَلْتُمْ نَـٰدِمِينَ ﴿٦﴾﴾ الحجرات.

واتە ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! هەرکات بابایەکی لادەر هەواڵێکی بۆ هێنان (دەربارەی کەسانێك) باش وردبنەوەو هەواڵەکە ساغ بکەنەوە، نەوەك بەنەزانیی زیان بەکۆمەڵێك بگەیەننو، سەرەنجام لەسەر ئەوەی کردووتانە ژیوان ببنەوە (پەشێمانیی بکێشن).

دیارە ئەم ئایەتەش هۆی هاتنەخوارەوە (سبب النزول)ی، دیسان تۆمەتبارکردنی خەڵکێك بووە، بە کوفرو هەڵگەڕانەوە لەئیسلام -بەڵام بە درۆ-، پاشان دەرکەوتنی درۆبوونی ئەو تۆمەتە، وەك لە تەفسیرەکاندا هاتوە[2]

٣- {«أَيُّمَا امْرِئٍ قَالَ لأَخِيهِ يَا كَافِرُ! فَقَدْ بَاءَ بِهَا أَحَدُهُمَا إِنْ كَانَ كَمَا قَالَ، وَإِلاَّ رَجَعَتْ عَلَيْهِ»}[3]

واتە: هەرکەسێك بەبرایەکەی بڵێ: ئەی کافر! ئەوە یەکێکیان لەو دووانە هەر دەگرێتەوە، ئنجا ئەگەر (بابای تۆمەتبارکراو بەکوفر) وابێ، ئەگەرنا بۆخۆی (واتە: بۆ تۆمەتبارکارەکە) دەگەڕێتەوە.

٤- {مَنْ لَعَنَ مُؤْمِنًا، فَهُوَ كَقَتْلِهِ، وَمَنْ رَمَى مُؤْمِنًا بِكُفْرٍ فَهُوَ كَقَتْلِهِ}[4].

---

[1] الإستيعاب في بيان الأسباب: ج١ ص ٤٥٩، ٤٦٠.
[2] الإستيعاب في بيان الأسباب: ج٣ص٢٧٤، ٢٧٥.
٣ أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٦١٠٤)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢١٣).
٤ أَخْرَجَهُ الْبُخَارِي برقم: (٦٠٤٧).

واتە: هەرکەسێك نەفرین لەبڕواداریك بکات، وەك کوشتبی وایەو، هەرکەس بڕواداریك بەکوفر تۆمەتبار بکات، وەك کوشتبی وایە.

ئنجا لەلای زانایانیش بنچینەیەکی سەلمێنراو (قاعدة مُسَلَّمة)ە کە: دڵنیایی، بەدوو دڵیی هەڵناوەشێتەوە: (الْيَقِينُ لاَ يَزُولُ بِالشَّكِّ).

(ابن تيمية) لەوبارەوە گوتوویەتی: (فَلَيْسَ لأَحَد أَنْ يُكَفِّرَ أَحَداً مِنَ الْمُسْلِمِينَ، وَإِنْ أَخْطَأَ وَغَلِطَ حَتَّى تُقَامَ عَلَيْهِ الْحُجَّةُ وَتُبَيَّنَ لَهُ الْمَحَجَّةُ، وَمَنْ ثَبَتَ إِيمَانُهُ بِيَقِينٍ لَمْ يَزُلْ ذَلِكَ عَنْهُ بِالشَّكِّ، بَلْ لاَ يَزُولُ إِلاَّ بَعْدَ إِقَامَةِ الْحُجَّةِ وَإِزَالَةِ الشُّبْهَةِ) [١].

واتە: هیچکەس بۆی نیە هیچ کام لە مسوڵمانان بەکافر دابنێ، با هەڵەو تاوانیش بکات، هەتا بەڵگەی لەسەر دادەنرێو ڕێی بۆ ڕوون دەکرێتەوەو، هەرکەس بەدڵنیاییەوە مسوڵمانەتییەکەی چەسپاوبێ، بە هۆی گومانو دوودڵییەوە لێی لاناچێ، بەڵکو هەتا بەڵگەی لەسەر دادەنرێو، شوبهەو گومانی لانەبردرێ (یانی: بیانوو بڕاونەکرێ) سیفەتی مسوڵمانەتیی لاناچێ.

هەروەها زانایانی جەماوەری مسوڵمانان کە بە: (أهل السنّة والجماعة)[٢] ناسراون، بۆجیاکردنەوەیان لەوانەی دەمڕاستی ئەو گرووپو تاقمانەبوون، کە بە هەر کام لە: (خاوەن ئارەزووەکان) و (خاوەن داهێنراوەکان)و (تاقمەکان): (أهل الأهواء)و (أهل البدع) و (الفِرَق) ناسراون، بە پێچەوانەی تاقمە لادەرەکانەوە، زۆر

١ مجموع الفتاوى، ج١٢ص٥٠١.

٢) هەرچەندە من تێبینیم لەسەر بەکارهێنانی ئەو زاراوەیە هەیەو، پێم وایە ڕاستترو سەلامەتتر ئەوەیە کە جگە لە ناوی (مسوڵمان) یان {جەماوەری مسوڵمانان- جمهور المسلمين} هیچ ناوێکی دیکە بەکار نەهێنرێو، هەڵەی گرووپە لادەرەکان (الفرق) دووبارە نەکرێتەوە.
لە کتێبی دووەمی مەوسووعەی: {بیرکردنەوەی ئیسلامیی لەنێوان وەحییو واقیع}یشدا بەدرێژیی لەو بارەوە دواوم.

دووربین‌و وردبین (محتاط ودقیق) بوون، بۆ حوکمی کافربوون بەسەر یەکێك دادان، بۆ نموونە: (النووي) لەوبارەوە گوتوویەتی:

(إعلم أن مذهب أهل الحق أنَّهُ لايُكَفّرُ أحدٌ من أهل القبلة بذنب، ولا يُكَفَّرُ أهل الأهواء والبِدَع، وأن مَنْ جَحَدَ مايُعلَمُ من دين الإسلام ضرورةً، حُكِمَ بِردَّتِهِ وكفره، إلاّ أن يكون قريب عَهْدٍ بالإسلام، أو نشأ ببادية بعيدة ونحوه ممَّن يَخْفى عليه، فَيُعرَّفُ ذلك، فإن استمرَّ حُكِمَ بِكُفْرِه، وكذا حكم من استحلَّ الزنا، أو الخمر أوالقتل أو غير ذلك من المحرّمات التي يعلم تحريمها ضرورة) [١]

واتە: بزانە کە ڕای ئەهلی حەق ئەوەیە: بەهۆی گوناهەوە، هیچ کەس لەئەهلی قیبلە (لەمسوڵمانان) کافر ناکرێ، هەروەها هیچ کام لەخاوەن ئارەزووە داهێنراوەکان {مەبەستی خەواریج‌و شیعەو مورجیئەو موعتەزیلەو...هتد} [٢] بەکافر دانانرێن، وە هەرکەس نکووڵیی لەشتێکی ئایینی ئیسلام کرد، کە بەئاشکرا زانراوبوو (کەبەشێکە لە ئیسلام) ئەوە حوکم بەهەڵگەڕانەوەو کوفری دەکرێ، مەگەر تازە مسوڵمان بێ، یان لە چۆڵەوانییەکی دووردا بووبێ، ئەوە دەبێ لەوبارەوە بەرچاوی ڕوون بکرێتەوە، ئنجا ئەگەر هەر بەردەوام بوو، ئەوە حوکم بەکافربوونی دەکرێ، هەروەها حوکمی هەرکەسێکی دیکەش هەروایە، کە زینا، یان مەی، یان قەتڵ‌و قەدەغەکراوەکانی دیکە، بەحەڵاڵ دەزانێ، کە بەئاشکرا دەزانرێ، قەدەغەن.

کەواتە: بەکافردانان (تکفیر)ی مسوڵمانانێك کە مسوڵمانەتییان ئاشکراو ڕوونەو جێی دڵنیاییە، پێچەوانەی قورئان‌و سوننەت‌و، بیروڕای زاناو پێشەوایانی ڕەسەنی ئیسلامە، وەك خستمانەڕوو، ئەوە بە نسبەت بە کافردانانی هەر مسوڵمانێك بەگشتی، بەڵام بە نسبەت بە کافردانانی خەڵکی ئیسلامیی‌و ئەو

---

١) صحيح مسلم بشرح النووي، ج١ص١٥٠.

٢) ئەوەی نێوان کەوانەکان خۆم زیادم کردوە، بۆ ڕوون بوونەوەی مەبەست.

حیزبو ڕێکخراوە ئیسلامییانەوە، کە هەوڵی بووژاندنەوەی ئیسلامو، هێنانەوەی سایەی شەریعەت بۆسەر سەری ئۆممەت دەدەن! ئەوە ستەمو لادانێکی زۆر گەورەو بێرەزایە.

وەك: (أبو عمر البغدادي) لە وتەیەکیدا بە ناوی: (قل إني بيِّنةٍ من ربِّي) لە ڕۆژی: ٢٠٠٧/٣/١٣ز. گوتوویەتی: (نرى كفر وردّة كل من اشترك في العملية السياسية كحزب المطلق والدليمي والهاشمي وغيرهم، كما نرى أن منهج الحزب الإسلامي منهج كفرٍ وردة).

بەڵێ، ئەو جۆرە بەکافردانانە هەڕەمەکییو بێ بەڵگەو پاساوەی گرووپە پەڕگیرەکان، گوناهو تاوانێکی زلترەو، لادانێکی ترسناکترە، لەڕێڕەوی زانایانی ڕەسەنی ئیسلامو، پێش ئەوەش لەڕێبازی شەریعەت ئنجا دیارە ئەو هەڵوێستو ڕەفتارە چەوتەی، بەکافردانانی حیزبو لایەنە ئیسلامییەکان، کە بڕوایان بە پێکەوە ژیانو، بەشداریی کردن لە هەڵبژاردنەکانو، لە پرۆسەی سیاسییدا هەیە، تایبەت نیە بە ڕێکخراوی (داعش)ەوەو، پێشتریش لەلایەن گرووپو تاقمە پەڕگیرەکانەوە، کەمو زۆر هەبووەو، بە بڕوای منیش ئەو هۆکارانەی بوونە مایەی سەرهەڵدانی ئەو بیروبۆچوونو هەڵوێستە، ئەمانە سەرەکییەکانیانن:

## هۆکارە بنەڕەتییەکانی سەرهەڵدانی پەڕگیریی:

١- کاردانەوە (رد الفعل) بۆ ئەو ستەمو دەستدرێژییەی لەلایەن ڕژێمە عەلمانییە دیکتاتۆرو خۆسەپێنەکانەوە، دەکرێتە سەر تەوژمی ئیسلامیی، لەگرتنو ئەشکەنجەدانو بێبەشکردنو دەرکردنو ..هتد.

٢- سادەو سەرکێڵ تێگەیشتن لە قورئان سوننەتو، پێدا قووڵ نەبوونەوەیان.

٣- نەشارەزاییو بێ ئاگایی بەرانبەر بەبیروڕاو هەڵوێستی زاناو پێشەوایانی متمانە پێکراوی ڕەسەنی ئیسلام.

٤- گومانی بەد (سوء الظن) بردن بە لایەنو ڕێکخراوە ئیسلامییەکانو، لە پشت پەردەی ڕەشەوە تەماشا کردنیان، بەهۆی پڕوپاگەندەی ژەهراوییو، فەتوا حازر بەدەستو ئامادەکراوەکان (الفتاوی الجاهِزة)ەوە، لەلایەن کەسانێکەوە، کە نا ئاشناو بێ ئاگان لەواقیعو، لەچوارچێوەی مەزهەبو مەشرەبێکی دیاریکراوو تەسکدا قەتیس ماونو، ئیسلام تەنیا لەو مەزهەبو مەشرەبەو کتێبو سەرچاوەو شارەزایەکانیدا دەبینن[1]!

٥- دەمارگیرییو داخراویی (التعصّب والإنغلاق) لە نێو بازنەو جوغزێکی تەسکدا، کە ڕێ نادات بابای دەمارگیر هیچ لە دەرەوەی خۆیەوە بزانێ!

کە لە جیاتی ئەوەی بە پێی بنچینەی: (رَأْيي صَوَابٌ يَحْتَمِلُ الْخَطَأ، وَرَأْيُ غَيْرِي خَطَأٌ يَحْتَمِلُ الصَّوَابَ) واتە: ڕای من ڕاستەو، ئەگەری هەڵەبوونی هەیەو، ڕای ئەوی دیکە هەڵەیەو، ئەگەری ڕاست بوونی هەیە، مامەڵە بکەن، بەپێی: (رَأْيي صَوَابٌ لا يَحْتَمِلُ الْخَطَأ، وَرَأْيُ غَيْرِي خَطَأٌ لا يَحْتَمِلُ الصَّوَابَ) واتە: ڕای من ڕاستەو ئەگەری هەڵەی نیەو، ڕای ئەوی دیکە هەڵەیەو، ئەگەری ڕاستیی نیە! ڕەفتار دەکەن!!

ئەگەرنا چ عەقڵو دینو ویژدانێك ڕێ دەدا، کە سەرجەم لایەنو حیزبە ئیسلامییەکان - کە بڕوایان بە بەشداریی کردن لە هەڵبژاردنەکانو پرۆسەی سیاسییدا هەیە- بە کافر دابنرێن، کە هەر ئەوان پێکهێنەری بنەڕەتیی تەوژمی ئیسلامیی (التيار الإسلامي)ین؟! هەروەها بەپلەی یەکەم هەر ئەوان هۆکاری

---

١) مەبەستم ئەو تەوژمو مەشرەبەیە کە کەمو زۆر لەژێر کاریگەریی فیکری (محمد بن عبدالوهاب) دایە، کە دوای خەواریج یەکەمین کەس بووە مسوڵمانانی ئەهلی قیبلەی بە گشتی بەکافر داناون. شایانی باسیشە لە کتێبی پێنجەمی مەوسووعەی: {بیرکردنەوەی ئیسلامیی ...}دا بە درێژیی لەو بارەوە قسەمان کردوەو بەبەڵگەو دیکۆمێنت قسەکانمان پشتڕاست کردوونەوە.

سەرەکیی ئەو ئەندازە هۆشیارییو بێدارییەن، کە لەم ڕۆژگارەدا لە نێو مسوڵماناندا هەیە؟!

هەڵبەتە بیانووی سەرەکیی ئەوانیش بۆ ئەو بیرکردنەوە پووچو هەڵوێستو ڕەفتارە ستەمکارانەو بێ ویژدانانەیان، بەرانبەر بەتەوژمی ئیسلامیی هاوسەنگ (التّيارُ الإِسلامي المتَّزن)، بریتیە لە بەشداریی کردنی لایەنە ئیسلامییەکان لە: (هەڵبژاردنو پەرلەمانو حکوومەتدا)! ئەو پەرلەمانو حکوومەتەی کە کەمو زۆر لەشەریعەت لادەدەن، یان بەلای کەمەوە: ڕایان نەگەیاندوە کە حوکم بەشەریعەت دەکەن!

کە بێگومان ئەوە بیانوویەکی بێ جێیە، چونکە مامەڵەکردن لەگەڵ واقیعدا، جیایە لە دان پێداهێنانی واقیعو، هەر کەس بە ئەلیفو بێی ئیسلام ئاشنابێ، دەزانێ کە مسوڵمان نابێ دان بەهیچ ناشەرعییەك دابنێو، ڕەوایەتیی(شرعية)ی بەبوونی بدات.

بەڵام بێگومان لایەنە ئیسلامییە بەشدارەکانی پرۆسەی سیاسیی، بەڵگەو پاساوی شەرعییانەی زۆر بەهێزی خۆیانیان هەیە بۆ هەڵوێستەکەیان، کە لێرەدا دەرفەتی خستنەڕووی ئەو بەڵگەو پاساوە شەرعییانەمان نیەو، من لە کتێبی: (چەند بابەتێکی سیاسیی هاوچەرخ لەبەر ڕۆشنایی عەقڵو وەحییدا) بە درێژیی ئەو بابەتەم توێژیوەتەوە، بەڵام لێرەشدا هەر بە کورتیی دەڵێم:

مسوڵمانانێك کە لەبەرانبەر واقیعێکی ناشەرعییدا خۆیان دەبیننەوە، ناچارن یەکێك لە چوار هەڵوێستان بنوێنن:

١- بە گژیدا بچننەوەو، بە هێزی خۆی دەبەر ڕاکەن!

٢- بە جێی بهێڵنو کۆچ بکەنو، لەبەری ڕاکەن!

٣- تەسلیمی ببنو فەرمانی بەجێ بێننو، مووێ نەپسێنن!

٤- موداراو تێکەڵیی لەگەڵ بکەن‌و، کارلێکی لەگەڵ بکەن، بەمەبەستی چاککردن‌و ڕاستکردنەوەی.

دیارە لایەن‌و ڕێکخراوە ئیسلامییەکان، ڕێی چوارەمیان هەڵبژاردوە، چونکە:

**یەکەم: بەگژداچوونەوەی واقیع بەهێز**، پێچەوانەی ڕێبازو شێوازی پێغەمبەرانە بە گشتیی‌و، بە تایبەتی پێغەمبەرمان (محمد) (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وەك پێشتریش لە باسی پێکهێنانی قەوارەی سیاسییدا خستمانەڕوو، ئنجا ئەگەر دروست‌و ڕەوا نەبووبێ، پێغەمبەران بە گشتیی‌و پێغەمبەرمان (محمد)"عليه وعليهم الصلاة والسلام" بە تایبەتی، بەهێزو چەك -بەمەبەستی گۆڕانکاریی‌و چاکسازیی کردن، پاکسازیی- ڕووبەڕووی کۆمەڵگا کافرەکانی خۆیان ببنەوەو، خوای کاربەجێ بفەرموێ: دەستتان بپارێزن لەشەڕو، نوێژ بەرپا بکەن‌و زەکات بدەن: ﴿ ...كُفُّوٓاْ أَيۡدِيَكُمۡ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ .... ﴿٧٧﴾ ﴾النساء، ئەوە بێگومان باشترو زیاتر بۆ کۆمەڵ‌و ڕێکخراوێکی ئیسلامیی، دروست‌و ڕەوا نیە، کە بەهێزو چەك ڕووبەڕووی کۆمەڵگا مسوڵمانەکەی خۆیان ببنەوە!

**دووەم: ڕاکردن لە واقیع**، هەر چەندە لە ئەسڵدا دروست (جائز)ە، بەڵام بۆ کەسانێکی ژمارە کەمی وەك هاوەڵانی ئەشکەوت (أصحاب الكهف) کەوا پێدەچێ حەوت کەس بووبن، بەڵام ئایا خەڵکێکی زۆری چەند هەزار کەسیی، یان چەند ملیۆنیی، بۆ کوێ بچن‌و، چ ئەشکەوتێك دەیانگرێ، پاشان بۆچی خەڵك‌و کۆمەڵگا -بەگشتیی- مسوڵمانەکەیان بەجێ بهێڵن؟!! لە حاڵێکدا کە بوارو دەرفەتی بانگەوازو چالاکییان هەیەو، وەك هاوەڵانی ئەشکەوت نەخراونە نێوان: ئەگەری بەربارانکران‌و، گێڕانەوە بۆ نێوکوفرەوەدا، وەك هاوەڵانی ئەشکەوت گوتوویانە:

﴿ إِنَّهُمْ إِن يَظْهَرُوا۟ عَلَيْكُمْ يَرْجُمُوكُمْ أَوْ يُعِيدُوكُمْ فِى مِلَّتِهِمْ وَلَن تُفْلِحُوٓا۟ إِذًا أَبَدًا ﴿٢٠﴾ ﴾الكهف.

**سێیەم: تەسلیم بوونی واقیع،** بە هیچ شێوەیەك دروستو ڕەوانییە، چونکە بێگومان ڕازی بوون بە کوفرو ناشەرعیی، مایەی کافربوونو لە بازنەی ئیمانو ئیسلام دەرچوونەو، ئەوەش یەکدەنگیی زانایان (إجماع العلماء)ی لەسەرە.

بەڵێ دەگونجێ مسوڵمانان بکەونە واقیعێکەوە، کە پێچەوانەو دژی ئیسلام بێو، هیچیشیان لەدەست نەیەت لە بەرانبەریدا، بەڵام هەرگیز ناگونجێ مسوڵمانان بە ویستی ئازادانەی خۆیان، مل بۆ واقیعێکی ناشەرعییانە کە چ بکەنو، پێی ڕازی بن!

**چوارەم:** کەواتە: تەنیا ڕێی چوارەمیان لەبەردەمدا مایەوە، کە بریتییە لەوەی حاڵەتی پێکەوە ژیان (تعایش)و ساچاندنو هەڵکردن (مداراة) بکەنە پیشەو، لە نێو کۆمەڵگایەکەیاندا بژینو، هەوڵی پاکسازییو چاکسازیی تێداکردنی بدەنو، لەسەر گرفتارییەکان خۆڕاگربن، کە ئەمە عادەتی تێکڕای پێغەمبەرانی خوا "علیهم السلام" بووە، هەر لە ئادەمەوە تاکو خاتەم، وەك خوا "عزوجل" لەسەر زمانی هەموو پێغەمبەران ڕوو بە گەلو کۆمەڵگایەکانیان فەرموویەتی:

﴿ ....وَلَنَصْبِرَنَّ عَلَىٰ مَآ ءَاذَيْتُمُونَا ۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُتَوَكِّلُونَ ﴿١٢﴾ ﴾إبراهيم.

واتە: بەدڵنیاییەوە هەرچەندە ئازارمان بدەن، هەر خۆڕاگر دەبینو، با پشت بەستووان بەس پشت بەخوا ببەستن. پێغەمبەری خاتەمیش (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) لەبارەوە فەرموویەتی:

١ - {اَلْمُؤْمِنُ اَلَّذِي يُخَالِطُ اَلنَّاسَ، وَيَصْبِرُ عَلَى أَذَاهُمْ، خَيْرٌ مِنَ اَلَّذِي لا

**يُخَالِطُ النَّاسَ وَلا يَصْبِرُ عَلَى أَذَاهُمْ}**[1].

واته: مسوڵمانێك كه تێكەڵی خەڵك بێ‌و، لەسەر ئازاریان خۆڕاگربێ، باشترە لەمسوڵمانێك كه تێكەڵی خەڵك نابێ‌و، لەسەر ئازاردانیشیان خۆڕاناگرێ.

٢- **{الْمُؤْمِنُ مَأْلَفَةٌ وَلاَ خَيْرَ فِيمَنْ لاَ يَأْلَفُ وَلاَ يُؤْلَفُ}**.[2]

واته: بڕوادار هۆگركاره (وا دەكات خەڵك خۆشیبوێ‌و لێی نیزیك ببنەوە)و، هەر كەس نەهۆگركاربێ، نەهۆگركراو، خێری پێوەنیە.

(النووي)یش (باب)ی ژماره (٧٠)ی كتێبە ناودارەكەی خۆی: (رياض الصالحين) ص ـ٢٤٨ـ بەم ناونیشانه هێناوه: (باب فضل الإختلاط بالناس، وحضور جُمَعهم وجماعاتهم ومشاهد الخير ومجالس العلم ومجالس الذكر معهم، وعيادة مريضهم وحضور جنائزهم، ومواساة محتاجهم، وإرشاد جاهلهم، وغير ذلك من مصالحهم، لمن قدر على الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر، وقَمْع نَفْسِهِ عن الإيذاءِ وصبْرٍ على الأذى).

واته: دەروازەی: باشیی تێكەڵیی لەگەڵ خەڵك‌و ئامادەبوونی نوێژی جومعەو جەماعەتەكانیان‌و، كارەچاكەكانیان‌و كۆڕەكانی زانستییو كۆڕەكانی زیكر لەگەڵیانداو، سەردانی نەخۆشیان‌و ئامادەبوونی جەنازەكانیان‌و، هاوكاریی كردنی ئاتاجیان‌و ڕێنمایی كردنی نەزانیان‌و بەرژەوەندییەكانی دیكەیان، بۆ كەسێك توانای فەرمان بەچاكەو ڕێگریی لەخراپەی هەبێ‌و، بتوانێ خۆی لە ئاست ئازاردانی خەڵكدا مەرزەم بكات‌و، لەسەر ئازاردانەكانیشیان خۆڕاگربێ.

---

١ أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٥٠٢٢)، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح رجاله ثقات رجال الشيخين. وَأَخْرَجَهُ أَيْضاً التِّرمِذِيُّ برقم: (٢٥٠٧)، وَابْنُ مَاجه برقم: (٤٠٣٢).

٢ أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٢٨٩١)، تعليق شعيب الأرنؤوط: متن الحديث حسن. وأورده الألباني في السلسة الصحيحة، ج١ص٧١١.

بەڵێ، ئا ئەوەیە بناغەی عەقیدەیی‌و فیکریی کارو پرۆژەو چالاکیی تەوژمی ئیسلامیی هاوسەنگو، شوێنکەوتووی ڕێبازو شێوازی پێغەمبەرانی خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) و زاناو پێشەوایانی شوێنکەوتوویان، بۆیەش: قسەی بێ بنەماو فەتوای بێ بەڵگەی گرووپە پەڕگیرەکان لە دژی، هیچ بەهایەکی نیەو، ماڵی قەڵبەو سەر بە خاوەنیەتی.

لێرەشدا کۆتایی بە ئالقەی دەیەم دێنینو، بەوەش کۆتایی بەکۆی بەشی دووەم لەبارەی پەڕگیرییەوە، دێنین.

# پێناسەی ئەم بەشە

بەڕێزان!

لەکەس شێرراوە نیە کە لەم ڕۆژگارەماندا مەسەلەی پەڕگیریی‌و توندو تیژیی لەنێو مسوڵمانان‌دا بەگشتیی، بۆتە بنیشتە خۆشکەی سەرزاران، بەتایبەت پاش سەرهەڵدانی {ڕێکخراوی دەوڵەتی ئیسلامیی} ناسراو بە (داعش)، بۆیە بەپێویستم زانی کە زنجیرە باسێك لەوبارەوە بنووسم بەناو و نیشانی: (ڕێکخراوی داعش لووتکەی پەڕگیریی)، ئەویش بەسێ ئامانج:

**یەکەم:** بەرگریی کردن لەئیسلامی بەرجەستە لە قورئان‌و سوونەتداو، ڕەواندنەوەی ئەو تەم‌و مژەی بەهۆی ڕەفتاری پڕ هەڵەو پەڵەی پەڕگیران (متطرفون)ەوە لەزەینی خەڵکێکی زۆردا، لێی ئالاوەو ڕووی گەش‌و درەوشاوەی ڕاستەقینەی شاردۆتەوە، یان شێواندوە.

**دووەم:** بەرچاو ڕوونکردنەوەی ئەو گەنج‌و لاوە خوێن گەرمانەی کە بەدروشم‌و سیما زەق‌و لاف لێدان (إدّعاء)ە ڕووکەشییەکانی پەڕگیران، فریو دەخۆن‌و لەخشتە دەچن‌و، سەرەنجام ئەگەر نەشفەوتێن، دەستیان لەبنی هەمبانەی بەتاڵەوە دەردەچێ‌و، تووشی نائومێدیی‌و ڕەشبینیی دەبن، چونکە بێگومان تێپەڕاندن (غُلوّ) هەمیشە تەمەنی کورتەو بۆ دنیاو قیامەتیش خاوەنەکەی جگە لە پەشێمانیی هیچی لێ سەوز ناکات.

**سێیەم:** ڕێگاگرتن لەکەسانی کینە لەدڵی دژ بەئیسلام‌و مسوڵمانان بەگشتیی‌و تەوژمی ئیسلامیی بەتایبەتی، کە لەپەنای پەرگیرانداو بەبیانووی دژایەتیی کردنیان، قسەی بێ سەرو بەر بکەن‌و، تانەو تەشەر لەئیسلام‌و مسوڵمانان بگرن.

شایانی باسیشە ئەم زنجیرەیە لە (بەرایی)یەك‌و شەش ئاڵقە پێکهاتوە، بەم ناو و نیشانانەی خوارێ:

بەرایی: هۆکارەکانی پەرگیریی‌و چۆنیەتی چارەسەری.

١. پێناسەی داعش‌و هەڵسەنگاندنی بیرو ڕاو ڕەفتارەکانی.

٢. بەکوێلەکردنی مرۆڤەکان لەم ڕۆژگارەدا، تاوانەو دژی شەریعەتە.

٣. هەرجۆرە دەستدرێژییەك بۆ سەر نامسوڵمانانی مەدەنیی بێ زیان، ستەم‌و تاوانە.

٤. بەرگریی کورد لە نیشتیمانی خۆی، ئەرکێکی شەرعییە.

٥. هەرکەسێکی مسوڵمان لە بەرگریی لێکردنی دین‌و ژین‌و نیشتیمانیدا بکوژرێ، شەهیدە.

٦. نابێ بەهەڵە ئەنجامدانی جیهاد، جیهادمان لەبەرچاو بخات.

هیواداریشم ئەم بەشەش هەرسێك ئامانجە سەرەکییەکەی کە بوونە پاڵنەری نووسینی، شێوە بێنێتەدی.

# بەرایی[1]

## هۆکارەکانی پەڕگیریی و چۆنیەتی چارەسەری

ئەم بابەتە لەدوو بڕگەی سەرەکییدا دەخەینە ڕوو:

بڕگەی یەکەم: هۆکارەکانی پەڕگیریی و توندو تیژیی.

بڕگەی دووەم: ڕێگای چارەسەری پەڕگیریی و توندوتیژیی.



١) کاتی خۆی ئەم زنجیرە باسەمان پێش دوو زنجیرە باسەکەی دیکە نووسینەوە، بۆیەش هەندێك شت کە لەم (بەرایی)یەدا بەکورتیی باسکراون لەبارەی هۆکارەکانی سەرهەڵدانی پەڕگیریی‌و توندوتیژیی‌و، ڕێگای چارەسەری، دواتر بە درێژیی قسەیان لەبارەوە کراوە، بەڵام دواتر ڕیزبەندیی بەشەکانمان گۆڕیوەو زنجیرەی سێیەم، لێرەدا بۆتە بەشی یەکەم‌و، سێیەمیش هاتۆتە شوێنی یەکەم‌و، جێگۆڕکەیان پێکراوە.

## بڕگەی یەکەم: هۆکارەکانی پەڕگیریی و توندوتیژیی

توندوتیژیی‌و پەڕگیریی دیاردەیەکی مرۆیی‌و جیهانییەو، تایبەت نیە بە ئایین‌و ئیدۆلۆژیاو گەل‌و کۆمەڵگایەکی دیاریکراوەوە، مێژووی ڕابردوو و واقیعی ئێستای دنیاش باشترین بەڵگەیە لەوبارەوە.

بەگشتیی هۆکارەکانی توندڕەویی‌و پەڕگیریی لەسەر ئاستی تاك‌و گرووپ، دوو بەشن:

أ- هۆکارە خودییەکان: (العَوَامل الذَّاتِية) وەك: دەمارگیریی‌و داخراویی.

ب- هۆکارە بابەتییەکان (العَوَامل الموضُوعِية) وەك: هەبوونی ستەم‌و چەوساندنەوە.

هەڵبەتە هۆکارەکانی پەڕگیریی‌و پەنابردنە بەر توندوتیژیی، لەلایەن هەندێك دەستەوگرووپی ئیسلامییەوە، لەڕۆژگاری ئەمڕۆی مسوڵماناندا، زۆرن، کە گرنگترینیان ئەمانەن:

**یەك:** ئەو بارودۆخە نائاساییەی کە مسوڵمانانی تێدان، کە لەسۆنگەی بەجێماوییانەوە، لەهەردووك بواری دین‌و ژین، یان دینداریی‌و دنیادارییدا، ئەهلی کوفرو زاڵهێزانی تەماعکار، بەستەم‌و دەستدرێژیی جۆراوجۆریان، پشوویان پێ تەنگ کردوون‌و شپرزەیان کردوون‌و، سەرەنجام کەسانێکی دڵگەرم‌و کەم حەوسەڵەو کورتبین، لە کاردانەوە (رد فعل)دا پەنا دەبەنە بەر پەڕگیریی‌و توندوتیژیی.

**دوو:** هەروەها ڕژێمە سیکۆلاریست‌و خۆسەپێن‌و دیکتاتۆرەکانیش، کە ئەگەر ئیسلامییەکان بانگەواز بکەن، بە حەپس‌و زیندان‌و ئەشکەنجە لە گەڵیاندا ڕووبەڕوو دەبنەوەو، ئەگەر بەشداریی هەڵبژاردنیش بکەن‌و لێیان ببەنەوە،

کودەتـای سـەربازییان بەسـەردا دەکـەن‌و، بـە زڵهێـزان‌و ڕژێمـە میراتییـە بەجێماوەکانیش گەلەکۆمەکێیان لە دژ دەکەن! وەك لە میسرو لـە فەڵەستین دژی ئیسلامییەکان ڕوویـدا، دیسـان بەشـێك لەئیسـلامییەکان بـەرەو توندوتیـژیی پاڵـدەدەن، چـونکە بەدیموکراسـییە سـاختەکەیان‌و درووشـم‌و بانگەشە بۆشەکانیان، دووچاری نائومێدیی‌و بە بنبەست گەیشتنیان دەکەن.

**سـێ:** دیسان تێگەیشتنی سەرکێڵانەو ڕووکەشانە (الفهم السطحي)ی بەشێك لە مسوڵمانان، بەتایبەت لە چینی گـەنج‌و لاو، دەربـارەی ئیسـلام‌و دەقـەکانی شـەریعەت‌و، قـووڵ نەبوونـەوەیان بـە قورئـان‌و سـوننەتدا، بـۆ پەیپـێـبردنی ڕاستییەکانی ئیسلام‌و بەها بەرزەکانی، هۆکارێکی دیکـەی کاریگـەری ئـەو کـەچ فـەهمیی‌و حـاڵی نەبوونەیـە، کـە سـەرەنجام خاوەنەکـەی پەلکێشـی توندوتیژیی‌و پەرگیریی دەکات.

بەڵگەش لەسەر ئەوە کە تێگەیشتنی سەرکێڵانەو ڕووکەشیی لەشـەریعەت، مایەی دەمارگیریی‌و داخراویی‌و، پاشـان پـەرگیریی‌و پـەنا بردنـە بـەر تونـدو تیژییـە، ئەوەیـە کـە پێغەمبـەری خـوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) لـەبارەی (خَوَارِج)ەوە، کە یەکەمین گرووپی سەرکێڵ لەدین تێگەیشتووی پەرگیری نێو ئوممەتی ئیسلام بـوو "لـەڕووی ڕیزبەنـدیی کـاتیی (الترتيـب الـزمني)یـەوە" فەرموویـەتی: (**يَقْـرَؤُونَ الْقُـرْآنَ لاَ يُجَـاوِزُ حَنَـاجِرَهُمْ**)[1]، واتـە: قورئـان دەخوێنن، بەڵام لە گەروویان تێناپەڕێ، یانی: لـێی تێناگەن.

**چـوار:** بێگومان هەرکام لە:

١- ڕژێمـە دیکتـاتۆرە میراتییـە طـائیفییـە بەعسـییەکەی بەشـار ئەسـەد لەسوریا، کە وڵاتەکـەی خـۆی بەسـەر خەڵکـە ستەملێکراوە ڕاپەڕیوەکەیدا

---

١) أَخْرَجَـهُ أَحْمَـد بـرقم: (١٤٨٤٦)، وَالبُخَـارِيُّ بـرقم: (٤٧٧١)، وَمُسْـلِمٌ بـرقم: (١٠٦٣)، وَالنَّسَائِيُّ في"الكبرى"برقم: (٨٠٨٧)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٤٨١٩).

کاول کردو، زۆربەی خەڵكو جەماوەرەکەی "کە سوننە مەزهەبن بە عەرەبو کوردەوە" خەڵتانی خاكو خوێن کرد.

٢- حکوومەتە تاکڕەوە طائیفییە هەشت ساڵییەکەی مالیکیی لە عێراق، کە وێڕای پەراوێزخستنو دوورخستنەوەی عەرەبی سوننە لە حوکمڕانییو، تەنگ پێ هەڵچنینو تەنگەتاو کردنیان بەگشتیی، دەستیشی نەپاراست لەکوشتنو بڕینو گرتنو دەربەدەرکردنو ڕاوەدوونانی خەڵکێکی زۆریان، بەتایبەت ئەوانەی کە ڕۆڵی سەرو مشوورخۆریان دەگێڕاو، گوێی نەدا بە داواکارییە ڕەوایەکانیان، کە ماوەی ساڵێك زیاتر بەشێوەی گردبوونەوەی ئاشتییانە لە مەیدانەکانی بەغدادو موسڵو ڕومادییو فەللوجەو سامەڕڕاو...هتددا، بەردەوام بوونو،سەربارەش سوپایەکەی! هێرشی کردە سەر چادرەکانیانو سووتاندنیانو ژمارەیەکیشیان لێ کوشتنو دەستگیرکردن، بەڵێ، هەرکام لەو دوو ڕژێمەو سیاسەتە چەوتەکانیان، کاریگەریی گەورەی هەبوو، بۆ زەمینە خۆشکردن بۆ سەرهەڵدانو گەشەکردنو فراوانبوونی گرووپە توندڕەوەکان بەگشتییو بەتایبەت ڕێکخراوی داعش لە سووریاو عێراق، هەرچەندە هەتا ئێستاش زیانباری گەورەی دەستی داعش وێڕای گەلی کورد، عەرەبی سوننەیە!

## بڕگەی دووەم: ڕێگای چارەسەری پەڕگیریی و توندوتیژیی:

ڕێگـــای چارەســـەرو بنبڕکردنـــی دیـــاردەی توندوتیـــژیی‌و پـــەڕگیرییش لـــەنێو مسولْمانانـدا "بەڕای من" لەم حەوت هۆکارەدا خۆی دەنوێنێ:

**هۆکاری یەکەم:** هەوڵـدانی مسـولْمانان بـۆ خۆگـۆڕین‌و پاکسـازیی‌و چاکسـازیی هەمەلایەنە کردن، لـە دینـداریی‌و دنیاداریيانـدا، چـونکە خۆگـۆڕین‌و خۆچـاککردن لەڕووی فیکریی‌و عـەقیدەیی‌و ڕەوشت‌و ئاکارو...هتدەوە، بناغـەی گـۆڕانی واقیـع‌و پاکسازیی‌و چاکسازیی تێداکرانیەتی، وەك خوای زاناو توانا فەرموویـەتی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوۡمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمۡ ١١﴾ الرعد.

**هۆکاری دووەم:** چـاوبەخۆداگێڕانەوەی مسـولْمانان، لـەبواری ناسـینی ئیسـلامی بەرجەستە لە قورئان‌و سوننەتداو، دڵنیابوون لەو ڕاستییە کـە: تـەنیا وەحیـی خـوا بەکەڵکی هەموو سـەردەم‌و ڕۆژگـارو تێکـڕای کۆمـەڵگایـەکان دێ، بۆیـە پێویسـتە بوێرانەو ئازادانە گوێ‌و چاوی عـەقڵ‌و دڵمان بەڕووی قورئان‌و سوننەتدا بکەینـەوەو، لەبەر ڕۆشـنایی چـاك ناسـین‌و ئاشـنابوون بـەواقیعی ئێسـتای خۆمانـدا، سـەرنجیان بدەین‌و لێیان تێبگەین، بەتایبەت لەبواری دنیاداریی‌و مامـەڵـەکان (المُعَامَلاَت)دا، کە شەریعەت لەڕووی حیکمەتەوە، بەدانانی چەند هێڵێکی گشتی وازی لێهێناوەو، بۆشایی زۆر تێـدا بەجێهێشـتوە، تـاکو بەشـەر بـەگوێرەی پێداویسـتییەکانی ژیـان‌و گوزەرانی کۆشش (إجتهاد) بکات‌و پڕی بکاتەوە.

**هۆکاری سێیەم:** دەبێ وریابین‌و بۆ چوون‌و تێگەیشتنی زاناو پێشەوایانمان، بەپێشین‌و پاشین (السلف والخلف)ەوە، لەبواری هەڵس‌و کەوتە دنیاییەکان (المعاملات الدنيوية)دا، نەکەینە کۆت‌و زنجیرو عەقڵ‌و دەست‌و پێی خۆمانی پێ ببەستین!

**هۆکاری چوارەم:** جەخت کردنەوە لەسەر ڕوونکردنەوەی ئەم ڕاستییانەی خوارێ:

**١-** بەپێی (بوونناسیی ئیسلامیی) خوا مرۆڤی بەگشتی لەسەر زەوی کردۆتە خەلیفەی خۆی‌و تاقی دەکاتەوەو، دنیای بۆکردۆتە تاقیگە (محل ابتلاء)، وەك فەرموویەتی: ﴿ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفُورُ ﴿٢﴾ ﴾الملك، هەروەها مرۆڤەکان ئازادکراون لەبواری بڕوا هێنان‌و نەهێناندا: ﴿ وَقُلِ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ ۖ فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ ﴿٢٩﴾ ﴾الكهف.

بۆیە مسوڵمانان بۆیان نیە هەر بیریش لەوە بکەنەوە، کە ئیسلام بەسەر خەڵکدا فەرز بکەن، چونکە ئەوە پێچەوانەی حیکمەتی دروستکردنی مرۆڤەو، بابای ئیسلام بەسەردا سەپێنراویش، دەکرێ بە موونافیق نەك بڕوادار!

**٢-** ئیسلام کە دوا پەیامی خوایە بۆ مرۆڤەکان، قەوارەیەکی سیاسیی کە بنیاتی دەنێ، دەبێ جێی هەموو مرۆڤەکانی تێدا ببێتەوە، خاوەنی هەر فیکرەو ئاینێك بن، چونکە خوا "عز وجل" لە پێناسەی پێغەمبەری خاتەمدا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّم) فەرموویەتی: ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿١٠٧﴾ ﴾الأنبياء،

کەواتە: شوێنکەوتووانی پێغەمبەری خاتەم (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) ناگونجێ مایەی زەحمەتو نارەحەتیی بن بۆ هیچکەس‌و، ئەگەر وابوون، بەلادەر لەبەرنامەو ڕێبازی وی دادەنرێن‌و، لەدەوڵەتی ئیسلامییشدا، بۆماوەی سێزدە سەدە، وێڕای مسوڵمانان، سەرجەم ئەو نامسوڵمانانەی کە ئامادە بوون هاوولاتیی سەلامەت‌و بێ زیان بن، لەژێر سایەیدا بەڕێزو حورمەتەوە حەوا بوونەوە، هەر لەجوولەکەو نەصرانییەکانەوە بگرە، هەتا یەزیدیی‌و صابیئەو مەجووسیی‌و بووزایی‌و بتپەرست‌و هیندۆسیی‌و.... هتد، ئنجا بێگومان ئەگەر ئەوەی داعش لەماوەی پازدە ڕۆژدا بە یەزیدیی‌و نەصرانییەکانی کرد، دەوڵەتی ئیسلامیی بەزەکاتی ئەوەی کردبایە، ئێستا تاکە نامسوڵمانێك لەجیهانی ئیسلامدا نەمابوو! .

٣- بناغەی هەڵس‌و کەوتی مسوڵمانان لەگەڵ نامسوڵماناندا بریتییە لە: چاکەکاریی‌و هاوکاریی (البر والإقساط) مەگەر ئەو نامسوڵمانانە شەڕ بەمسوڵمانان بفرۆشن‌و زیان بەدین‌و ژینیان بگەیەنن، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ لَّا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓا۟ إِلَيْهِمْ ... ﴿٨﴾ ﴾ المتحنة.

٤- پەرگیریی‌و توندو تیژیی لەئیسلامدا قەدەغەیەو خاوەنەکەی گوناهبارەو، سەرەنجامیشی سەر بەفەتارەت چوون‌و، دەست لەبنی هەمبانەی خاڵییەوە دەرچوونە، وەك خوا "عز وجل" فەرموویەتی: ﴿ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لَا تَغْلُوا۟ فِى دِينِكُمْ ...﴿١٧١﴾ ﴾ النساء.

پێغەمبەریش (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فەرموویەتی: (**هَلَكَ الْمُتَنَطِّعُونَ ثَلاَثاً**)[١].

واتە: پەرگیران فەوتاون.

هەروەها فەرموویەتی: (**إِيَّاكُمْ وَالْغُلُوَّ فِي الدِّينِ، فَإِنَّمَا أَهْلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ الْغُلُوُّ فِي الدِّينِ**)[٢].

واتە: خۆتان لە تێپەڕاندن لە دینداریيدا دوور بگرن، چونکە ئەوانەی پێش ئێوە هەر بە تێپەڕاندن لە دینداریيدا لە بەین چوون.

دیارە مەبەست لە (تنطّع) و (غلوّ)یش زێدەڕۆیی‌و تێپەڕاندنەو، بێگومان جوانیی‌و ڕەونەقی ئیسلام‌و لەگەڵ فیترەتی ساغدا گونجانیشی، بەهۆی هاوسەنگیی (إعتدال)یەوەیەتی، بۆیە هەر کام لە تێپەڕاندن‌و بەزایەدان (إفراط و تفریط) بەلادان‌و گوناهو سەرپێچیی دادەنرێن‌و، دینداریی ڕەسەن‌و ساغ، ئەوەیە کە نە لەشەریعەت تێپەڕێنی، نە لێی بەجێ بمێنی.

٥- زانایانی موعتەبەرو متمانە پێکراوی ئیسلام لە پێشین‌و پاشین، بە پشتبەستن بە چەندان ئایەت‌و فەرموودە، بەکافردانان (تکفیر)ی مسوڵمانانیان بەبێ بەڵگەو ئیسپاتی ڕوون‌و بێ چەندو چوون، بەلادان‌و گوناهێکی گەورە داناوە، بۆیە بە مەنزڵگای کوفر (دارالکفر) دانانی سەرجەم وڵاتانی ئیسلامیی، لە بەرئەوەی لە ڕووی سیاسییەوە بەئیسلام حوکم ناکرێن، لە حاڵێکدا کە پڕن لە مسوڵمان‌و، دروشمەکانی ئیسلامیان

---

١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم:(٣٦٥٥)، وَمُسْلِمٌ برقم:(٢٦٧٠).

٢) أَخْرَجَهُ ابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٠٢٩)، وَالطَّبَرَانِيُّ برقم: (١٢٧٤٧)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٣٠٥٧) وَأَبِي يَعْلَى برقم: (٢٤٢٧)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٣٨٧١) قَالَ شُعَيْب الأرنؤوط: إِسْنَادُهُ صَحِيح عَلَى شَرْطِ مُسْلِم.

تێدا بەرپا دەکرێن، قسەیەکی بێ بنەمایەو، تاوانێکی زلە بەرانبەر بەمسوڵمانان بەگشتیی.

هەروەها بە کافر دانانی سەرجەم ئەو لایەنە ئیسلامییانەی، بەشداریی لە پرۆسەی سیاسیی کۆمەڵگاکانیاندا دەکەنو، بە کافردانانی هەموو ئەو هێزانەی سەربەو ڕژێمو حکومەتانەن، کە کەمو زۆر شەریعەت پیادەناکەن، بەبێ هەڵاواردنو ڕوونکردنەوە (تفصیل)و پۆلێن کردن (تصنیف)، پێچەوانەی ڕای سەرجەم زانایانی ئیسلامە.

پێغەمبەریش (صَلّی اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فەرموویەتی: (**لاَ يَرْمِي رَجُلٌ رَجُلاً بِالفِسْقِ أَوِ الكُفْرِ، إِلاَّ ارْتَدَّتْ عَلَيْهِ، إِنْ لَمْ يَكُنْ صَاحِبُهُ كَذَلِكَ**)[١].

واتە: هیچکەس پیاوێك بە لادانو کوفر تۆمەتبار ناکات، مەگەر بۆخۆی دەگەڕێتەوە، ئەگەر هاوەڵەکەی وانەبێ.

٦- دامەزراندنی دەوڵەتو جێبە جێکردنی شەریعەتو دانانی خەلیفە، وەك داعش کردنی، هەرسێکیان پێچەوانەی عەقڵو شەرعن[٢]، چونکە:

أ- دەوڵەتو قەوارەی سیاسیی لە ئیسلامدا، بەبێ ڕەوایی (شرعية) پێدانی ئازادانەی کۆمەڵگا، دروست نیەو، سیرەو ژیانی پێغەمبەریش (صَلّی اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) باشترین بەڵگەیە لەو بارەوە، چونکە وەك ئاشکرایە پێغەمبەری خوا (صَلّی اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) لەشاری مەککە "کە زۆربەی هەرە زۆری خەڵکەکە بڕوایان پێ نەهێنا" قەوارەی سیاسیی بۆ دانەمەزراو، هەر لەهەوڵی دۆزینەوەی پێگەیەکی جەماوەرییدا بوو، هەتا ڕێی لە خەڵکی (يَثْرِب) هەڵکەوتو لە لای (عَقَبَة) "کە ناوی شوێنێکە لە نیزیك مەککە" پەیمانی یەکەمو دووەمیان لەساڵەکانی

---

١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢١٥٠٣)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٣٣١٧)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٦١).

٢) لە بەشی دووەمدا تیشکی باشتر خراوەتە سەر ئەو سێ مەسەلەیە.

(١٢و١٣) پێغەمبەرایەتییدا، لەگەڵ بەستو -بەزاراوی سیاسیی ئەم ڕۆژگارە- گرێبەستی کۆمەڵایەتیی (العقد الإجتماعي) یان لەگەڵ گرێداو، سەرەنجام پاش کۆچکردنی خۆیو هاوەڵانی، لەمەدینەدا دەوڵەتی دامەزراند.

ب- جێبەجێکردنی شەریعەت، دەبێ بە شێوازی شەرعییانەی شەریعەت بێو، سەرەتا بانگەوازو پەروەردەو تێگەیاندنو، پاشان چارەسەری کێشەو گرفتەکانی خەڵکو دابین کردنی پێداویستییەکانیان هەبێ، نەك لینگەو قووچ: لە سزادانی خەڵکەوە دەست پێبکرێ!

ج- خەلیفەش ئەگەر گریمان بگونجێو بەرژەوەندییش لەدانانیدا هەبێ، {لەم ڕۆژگارەدا کە شێوەی بەڕێوەبردنی ولاتان زۆر گۆڕاوەو بەرەو پێشچوونو، گەشەسەندنی بەخۆوە بینیوەو، ئیسلامیش وەرگرتنی چی باشترو بەسوودترەو بەرژەوەندیی زیاتری تێدایە، لەسەر مسوڵمانانی پێویست دەکات، لەهەرکەسێکەوە بێ، وەك خوا ﷻ فەرموویەتی:

﴿ فَبَشِّرْ عِبَادِ ﴿١٧﴾ ٱلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥٓ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُ ۖ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمْ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَـٰبِ ﴿١٨﴾ ﴾الزمر.

واتە: موژدەش بدە بەو بەندانەم کە گوێ بۆ هەموو قسەیەك دەگرن، پاشان شوێن باشترینی دەکەون}.

دەبێ تێکڕای مشوور خۆرو شارەزاو قسە ڕۆیشتووانی ئوممەت کۆببنەوەو، بەهەموویان پاش ڕاوێژو تاوو توێ کردن، ئنجا لە وبارەوە بڕیار بدەن، وەك خوا "عز وجل" فەرموویەتی:﴿ وَٱلَّذِينَ ٱسْتَجَابُوا۟ لِرَبِّهِمْ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ وَمِمَّا رَزَقْنَـٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٣٨﴾ ﴾الشورى.

واتە: هەروەها (بڕواداران) ئەوانەن کە بەدەم پەروەردگاریانەوە چوونو نوێژیان بەرپا کردوەوکاروباریان لە نێوانیاندا بە ڕاوێژەو لەوەی پێمان داون دەبەخشن.

نەك هەر گرووپێك ئەگەر تۆزە دەستەڵاتێکی وەهمییو کاتیی کەوتە دەست، خەلیفەیەك دابنێ، بێ ئەوەی بزانرێ ئەو بەناو خەلیفەیە کێیەو چۆنە؟! هەروەها بێئەوەی لە ڕووی واقیعیشەوە، حوکمی بەسەر غەیری ئەو پانتاییە دیاریکراوەدا بڕوا، کە بەزۆرو فشارو کوشتنو بڕین خۆی بەسەر خەڵکەکەیدا سەپاندوە! خەلیفەی دووەمیش (عُمَر بْن الخَطَّاب) خوا لێی ڕازی بێ لەوبارەوە گوتوویەتی: (**فَمَنْ بَايَعَ رَجُلاً عَلَى غَيْرِ مَشُورَةٍ مِنَ الْمُسْلِمِينَ، فَلاَ يُتَابَعُ هُوَ وَلاَ الَّذِي بَايَعَهُ تَغِرَّةً أَنْ يُقْتَلاَ**)[1].

واتە: هەرکەسێك بەبێ ڕاوێژی مسوڵمانان بەیعەت "ی خەلیفایەتیی" بە پیاوێك بکات، با ئەو کەسەی بەیعەتی پێدراوەو ئەوەش کە بەیعەتی پێداوە، کەس شوێنیان نەکەوێ، ئەگەرنا دەکوژرێن (واتە: سزایان کوژرانە).

**هۆکاری پێنجەم:** چاو بەخۆدا گێڕانەوەی زلهێزەکان بەگشتییو بەتایبەت ئەمریکاو ڕووسیاو هاوپەیمانەکانیان، لەبواری چۆنیەتی مامەڵەکردنیان لەگەڵ جیهانی ئیسلامییداو، دەست هەڵگرتنیان لە سیاسەتی دووفلیقانەیی (إزدواجية)و بانێکەو دووهەواو، چیدیکە چاو تێنەبڕینی خێرو بێری وڵاتانی ئیسلامییو بەتاڵان نەبردنیو، هەراو ئاژاوە نەنانەوە لەنێو مسوڵماناندا، بەمەبەستی فرۆشتنی چەكو خاڵیکردنەوەی عەمباری جبەخانەکانیانو، گەرمکردنی بازاڕی ئابووریی حەڕامو بێ ویژدانانەی خۆیان، لەسەر حیسابی گیانو سامانی مسوڵمانان!

---

١) أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٦٤٤٢)، وَعَبْد الرَّزَاق فِي "المُصَنَّف" برقم: (٩٧٥٨).

**هۆکاری شەشەم:** دەست هەڵگرتنی حیزبو ڕژێمە سیکۆلاریستو خۆسەپێنەکان لەقۆرخکردنی دەستەڵاتو، درۆکردن بە ناوی دیموکراسییو لیبڕالیزمو ئازادییو مافی مرۆڤو...هتدەوە، کە سەرەنجام بەشێك لە خەڵكو جەماوەر بەگشتییو ئیسلامییەکان بەتایبەت، تووشی نائومێدیی (إحباط)و هەستکردن بە گەیشتنە بنبەست ببنو، بیر لەهەموو شتێك بکەنەوە، بۆ دەرباز بوون لەو واقیعەی گرفتاریی بوون!

**هۆکاری حەوتەم:** ڕێگادان بە تەوژمی ئیسلامیی ڕەسەنو هاوسەنگ، کە بڕوای بە پێکەوەژیانو تەبایيو گەڕانەوە بۆ ئیرادەی خەڵك هەیە، بۆ وەدەستهێنانی ڕەوایەتیی (شرعیة) حوکمڕانییو، پاکسازییو چاکسازیی تێدا کردنی کۆمەڵگاو، پیادە کردنی شەریعەت، بە شێوازی شەرعییانەو حەکیمانەو پلەپلەیی، ئەگەرنا وەك گوتراوە: (وَمَنْ ضَاقَ بِهِ الحَق فَالجَوْر عَلَيْهِ أَضْيق) واتە: هەر کەسێك بەهەقو دادگەریی سەغڵەت بێ، ئەوە بێگومان "ئەگەر مل بۆ هەقو دادگەریی نەدات" ستەمو زۆر زیاتر سەغڵەتو تەنگە تاوی دەکات!

**لە کۆتاییدا دەڵێم:**

بابەشێك لە لایەنە سیکۆلارەکان، وریابنوکینەو بوغزێك کە بەرانبەر بە ئیسلامو تەوژمی ئیسلامیی ڕەسەنو هاوسەنگ لەدڵیاندایە، وایان لێنەکات کە بە بیانووی دژایەتی کردنی داعشو، لەژێر پەردەی هێرشکردنە سەر داعشدا، هێڵە سوورەکان ببەزێنن، کە سەرەنجام هەم خۆشیان تووشی کوفرکردنو کوفر گوتن بکەنو، هەم هەستو نەستی خەڵكو کۆمەڵگاکەشیان بریندار بکەنو، هەم بازاڕی داعشو گرووپە توندڕەوەکانیش قەڵەبالغ بکەنو، بیانوو و پاساوی زیاتر بخەنە دەستی ئەو گەنجو لاوانەی کە لەبەر سادەییو کەم ئەزموونییان، لەلایەکو،

بێزاریی‌و تووڕەییان لە تەوژمی سیکۆلاریستی پەڕگیرو بێ ئینساف، لەلایەکی دیکەوە، گرووپە پەڕگیرو توندڕەوەکان زەفەریان پێ دەبەن‌و ڕاویان دەکەن!

خوا بە کەرەمی خۆی دەرووی خێر لە هەموو لایەك بکاتەوە، بەڵای پەڕگیریی‌و توندڕەوییان، لەهەر لایەکەوە بێ‌و، لەهەر بەرگێکدا بێ، لە کۆڵ بکاتەوە.

**٩/ محرم/ ١٤٣٦ کۆچی**
**٢٠١٤/١١/٢ زایینی**
**هەولێر**

خوێنەری بەڕێز!

ئەم بابەتە لەپێنج بڕگەدا دەخەینە ڕوو، کە ئەمانە ناو و نیشانەکانیانن:

**یەکەم:** ڕوانینێکی مێژوویی.

**دووەم:** داعش چۆن دەبینین؟

**سێیەم:** ئایا ڕێکخراوی داعش پێناسەی تیرۆریزم (terrorism)ی بەسەردا دەچەسپێ؟

**چوارەم:** هۆکارە سەرەکییەکانی ڕێ لێتێکچوونی داعش.

**پێنجەم:** سەرەنجامی داعش چۆن دەبێ؟!

## یەکەم: ڕوانینێکی مێژوویی:

وشەی (داعش) کورتکراوەی (الدَّوْلة الإِسْلاَمِية في العراق و الشام)ە، چۆنیەتی سەرهەڵدانی ئەو ڕێکخراوە لەڕووی مێژووییەوە، بەم شێوەیە بووە:

١- (أبو مُصْعَب الزَّرقَاوي) لەساڵی (٢٠٠٤ز)دا ڕێکخراوێکی بەناوونیشانی: (التوحيد و الجهاد) بنیات نا، کە دوایی پاش بەیعەتدانی (أبُومُصْعَب)، بە (أُسَامَة بْن لادن) ناوەکەی گۆڕا بۆ (قَاعِدة الجهاد في بلاد الرافدين) کە دیارە بەمەبەستی جەنگ کردن دژی هێزەکانی ئەمەریکاو هاوپەیمانەکانی، دروست بوو.

٢- لەساڵی (٢٠٠٦)دا دوای کوژرانی (أبُو مُصْعَب)، (أبُو حَمْزَة المهَاجر) بوو بە ئەمیری ڕێکخراوی (القاعدة)و، دواتر (أبُو عُمَر البَغْدَادِي) بوو بە سەرۆکی ئەو قەوارە سیاسییەی کە لە ژێر ناوی: (دَوْلَة العِرَاق الإِسْلاَمِية)دا خۆی ڕاگەیاند.

٣- لە: (٢٠١٠/٤/١٩)دا هەرکام لە (أبُو عُمَر البَغْدَادِي) و (أبُو حَمْزَة المهَاجر) بە بۆمبارانی فڕۆکەی ئەمریکا، لە ماڵێکدا لەناوچەی (ثرثار) کوژران.

٤- لە: (٢٠١٠/٤/٢٩)دا (أبُوبَكْر البَغْدَادِي) بەئەمیری ڕێکخراوی (دَوْلَةالعِرَاق الإِسْلامية) هەڵبژێردرا، شایانی باسیشە (أبُوبَكْر البَغْدَادِي) نەناوی (أبُوبَكر)ەو نە خەڵکی بەغدادیشە! بەڵکو ناوی: (إبراهيم عوّاد إبراهيم البدري)یەو خەڵکی (سامرّاء)ەو لەدایك بووی (١٩٧١)ە.

٥- لەکۆتاییەکانی ساڵی (٢٠١١)دا (جبهة النصرة) بە قیادەیی (أبو محمّدالجولاني) پێکهات‌و، پاشان (أبو محمّد الجولاني) بوو بە ئەمینداری

گشتیی (الأمين العام)ی (جبهة النصرة)و، جۆرێك لە پەیوەندییشی بە (دولة العراق الإسلامية)ەوە هەبوو.

٦- لە: (٢٠١٣/٤/٩)دا (أبوبكر البَغْدَادِي) بە دەنگێكی تۆماركراو (تسجيل صوتي) ڕایگەیاند كە هەركام لە ڕێكخراوی: (جبهة النّصرة) كە(محمدالجولاني) بەرپرسی بووو، (دولة العراق الإسلامية) كە (أبوبكر البغدادي) بەرپرسی بوو، هەڵوەشێنراونەوەو (الدولة الإسلامية في العراق والشام) (داعش)ی ڕاگەیاندو، خۆشی وەك سەرۆكی ئەو دەوڵەتە ناساند!

هەڵبەتە ڕێكخراوی (الدولة الإسلامية)دەڵێن: ئەمە دوای ئەوەبوو كە (أبو محمّد العدناني) بەڕەسمیی بەهەموو لایەنە ئیسلامییەكانی ڕاگەیاند كە لەنێو خۆیاندا (خليفة)یەك هەڵبژێرن، بەڵام هیچكەس وەڵامی نەبووە!

بەڵام من پێموایە كە پێشتر هەمووشتێك دانراوەو، ئەو مەسەلەیە ئەگەر ڕاستیش بێ، زیاتر مۆزایەدەی ئیعلامیی بووەو، بێگومان (خليفة)ش بەو شێوەیە دانانرێ!

بەڵام هەرزوو (أبو محمد الجولاني) بەناوی (جبهة النصرة)ەوە ڕایگەیاند كە بەڵێ پەیوەندییان بە (دولة العراق الإسلامية)ەوە هەبووە، بەڵام ڕاشیگەیاند كە ئاگاداری ئەو مەسەلەیە نەبوونو ڕازیش نینو، سەرەنجام (جبهة النصرة) چووە پاڵ (القاعدة)و، (داعش)یش وەك ڕێكخراوێكی سەربەخۆ مایەوەو، شەڕو كوشتاری زۆریشیان لەنێوان دابوو.

٧- لە: (٢٠١٤/٦/١٠)دا داعش شاری موصڵو دەوروبەری گرتو، دواتر بەرەو ناوچە عەرەبی سوننە نشینەكانی دیكەش كشاو، دەڤەرێكی فراوانی كۆنترۆڵ كرد.

لە: (٢٠١٤/٦/٢٩) ئەو ڕێکخراوە ڕایگەیاند: کە (أبوبکر البغدادي) بەخەلیفەی مسوڵمانان داناوەو، ناوی (الدولة الإسلامیة في العراق و الشام) (داعش) نەهێڵراو، تەنیا ناوی (الدولة الإسلامیة) مایەوە، وەك ناوونیشانی ئەو ڕێکخراوە، هەرچەندە تازە ناوی (داعش)یان وا پێوە نووساو لێیان نابێتەوە!

## دووەم: داعش چۆن دەبینین؟

بەپێی ئەوە کە هەتا ئێستا لەبیروڕاو بۆچوونو ڕەفتارو هەڵوێستەکانی ئەو ڕێکخراوەوە بۆمان دەرکەوتوە، ئەوەیە کە هەرچەندە خۆی بە ڕێکخراوێکی ئیسلامییو بگرەبەقەوارەو دەوڵەتێکی ئیسلامییش دەناسێنێ، بەڵام گەلێك بیروبۆچوونی هەڵەوکرچو کاڵو سەرکێڵانەو دواکەوتووانەی لەبارەی ئیسلامو دینو ژینەوە هەنو، زۆر هەڵوێستی دژو پێچەوانەی شەریعەتو بەهابەرزەکانی لێ دەرکەوتوون، کە ئیسلامو مسوڵمانانیان زۆر لەسەر قەرزدار بوونەتەوەو، کەرەسەیەکی خاوی زۆرو زەوەندیان بەبەلاش خستۆتە دەستی ناحەزانی ئیسلامو مسوڵمانانەوە، لە زلهێزەکانو ڕژێمە دیکتاتۆرو خۆسەپێنەکانو، حیزبە سیکۆلاریستە پەڕگیرو کینە لە دڵەکان، بۆ بانگەشەی ژەهراوییو ناحەزانەیان دژی ئیسلامو مسوڵمانان بەگشتیو، لایەنە ئیسلامییە هاوسەنگو خاوەن بنکە جەماوەرییەکان بەتایبەت، بەڵام دیارە مەبەستمان لەو قسانە ئەوە نیە کە تۆمەتی لەئیسلام دەرچوونو کافربوون ئاراستەی داعش بکەین، با ئەوانیش ئەوە عادەتیان بێ کە نەیارەکانی خۆیان بە نامسوڵمان ناوزەند نەکەن، ئاشکراشە بۆ ڕەواییو بگرە پێویست بوونی بەرگریی لەدینو ژینو خەڵكو وڵاتی خۆکردنیش، هیچ پەك لەسەر بەکافردانانی داعش نەکەوتوە، چونکە ستەمو دەستدرێژیی لەهەرکەسو لایەنێکەوەبێ، دەبێ بەرپەرچ بدرێتەوە، وەك خوای دادگەر فەرموویەتی: ﴿لَا تَظْلِمُونَ وَلَا تُظْلَمُونَ ﴿٢٧٩﴾﴾ البقرة، واتە: نەستەم بکەنو نە ڕێ بدەن ستەمیشتان لێ بکرێ.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿فَمَنِ ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ فَٱعْتَدُوا۟ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ ﴿١٩٤﴾﴾ البقرة.

واتە: هەرکەسێك دەستدرێژیی کردە سەرتان، وەك دەستدرێژیی وی بەرپەرچی دەستدرێژییەکەی بدەنەوە...

ئنجا سەرنجو هەڵسەنگاندنمان بۆ ڕێکخراوی دەوڵەتی ئیسلامیی (الدولةالإسلامیة) ناسراو بە (داعش) لەم پێنج خاڵەدا، بەکورتیی و پوختیی دەخەینەڕوو:

**یەك:** ئەم ڕێکخراوە زۆرترین تەمو مژو نیشانەی پرسیاری بەدەورەوەو لەبارەوە هەن‌و، ناڕوونیی زۆر لەسەر زۆر لایەنی هەیە:

١- هەم لەسەر چۆنیەتی سەرهەڵدانیو کتو پڕ گەورەبوون.

٢- هەم لەسەر ئیدارەی کاروباریو نەخشەو پلانەکانی.

٣- هەم لەسەر ئەو ئیمکانیەتە زەبەلاحەی کەوتۆتە دەستی، لەپارەو چەكو عەتادو.. هتد.

٤- هەم لەسەر ستراتیژو ئەجینداکانی.

٥- هەم لەسەر چۆنیەتی ڕێگادران بەو هەموو خەڵکە کە لەزۆر وڵاتانی دنیاوە پێوەی پەیوەست بن.

٦- هەم لەسەر جۆری پەیوەندییەکانی.

٧- هەم لەسەر کەسی یەکەمیو ستافەکەیو... هتد!

ئنجا بەڕاستی من هەتا ئێستا نەمتوانیوە قەناعەت بەخۆم بهێنم، کە ئەو ڕێکخراوە (داعش) تەنیا خۆیەتی خۆی بەڕێوە دەباتو، دەستی هیچ دەوڵەتو قەوارەیەکی دیکەی لەڕێی دەزگا هەواڵگرییەکان (أجهزة المخابرات)ەوە لەپشت نیە، چ دەوڵەتی ڕۆژئاوایی، چ ناوچەیی (إقلیمي)، چ عەرەبیی!

چونکە من پێموایە ئەورووپاو ڕۆژئاوا (غـرب) کـە بانگـەوازی ئیسـلامیی زۆر تێیدا لەگەشـەکردنو بـەرەو پێشچـووندایە، سـوودی بـاش لەبیروبۆچـوونو هـەڵسو کەوتە لارو ناشیرینەکانی (داعش) وەردەگرن، بۆ دروسـتکردنی پـەردەو دیـوارێکی مەحکەمو، تەمو مژێکی زۆر لەنێوان خەڵکەکەیانو ئیسـلامدا، کـە بـەزمانی حـاڵ "ئەگەر بەوتاریش نەیڵێن" بەخەڵكو جەماوەری وڵاتەکانیان بڵێن: ئـەو ئیسـلامەی کە لەبانگخوازو زانایەکان دەیبیستنو، ئێوەی بۆ بانگ دەکرێن، ئەگـەر دەسـتەڵاتی هـەبێ، دەوڵـەتێکی وەك ئـەوەی (داعش)تـان بـۆ دادەمەزرێنیو،بـەوجۆرەش شـەریعەتتان بەسـەردا پیـادە (تطبیـق) دەکـاتو، خەلیفەیـەکی وەك (أبوبکرالبغدادي)شتان بەسەرەوە دەکاتە حوکمڕان!

ئنجـا بۆخۆتـان هەڵبـژێرنو عافێتتـان بێ!هـەروەها ڕژێـمو قـەوارە عەرەبییـە میراتییو خۆسەپێنەکانیش، بەخەڵکەکەیان دەڵێن: ئایا حەزدەکـەن ئیسـلامییەکان حوکمتان بکەن!

فەرموون: ئەوە (داعش) نموونەی حوکمی ئیسلامییەکان!

دیارە لەحاڵەتێکی واشدا وەك گوتراوە: (مردنـی پێشـان بـدە، بەگرانـەتا شـوکر دەبـێ!) بێگومـان هەرکەسـێك پێـی وابـێ بـەدیلی ڕژێمـە حوکمڕانـەکانی ئێسـتا، دەوڵەتو قـەوارە سەرسوڕهێنەرەکەی (داعـش)ە، مـەگـەر چـۆن دەنـا دەڵـێ: هـەر لێیگەڕێ چاکی مەکە، با خراپ نەبێ!

**دوو**: بەڕای زۆربەی "ئەگەر نـەڵێین تێکـڕای" زانایـانی موعتەبـەری هاوچـەرخ، ئـەو ڕێکخـراوە لەتونـدڕەوییو توندوتیژییـدا، هـەموو ڕێکخـراوو گرووپـە پـەڕگیرو تێپەڕێنەر (متطرِّف ومُفْرِط)ەکـانی کـۆنو تـازەی بەجێهێشـتوەو، لەشـێوازی کـارو چالاکییو شێوەی مامەڵـەکردنی لەگـەڵ خەڵکـدا، چ لەحاڵـەتی بەرەنگاربوونـەوەو جەنگو، چ لە حاڵەتی ئاساییدا، لە هەموو گرووپە پـەڕگیرەکان زیـاتر لـە ڕووحـی

ئیسلام‌و شەریعەت دوور کەوتۆتەوە، وە لەڕاستییدا (داعش) پڕۆژەی مەرگی پێیە بۆخۆی‌و خەڵك، لەحاڵێکدا کە ئیسلام پڕۆژەو بەرنامەی ژیانە، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱسْتَجِيبُوا۟ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِيكُمْ ۖ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يَحُولُ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَقَلْبِهِۦ وَأَنَّهُۥٓ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾الأنفال.

واتە: ئەی بڕوادارینە! بەدەم بانگی خواو پێغەمبەرەکەیەوە بچن، هەرکات بانگیان کردن بۆ (ئایین‌و بەرنامەیەك) کە زیندووتان دەکاتەوە...

**سێ**: هۆکاری سەرەکیی ئەو لادان‌و سەرگەردانییەی ئەو ڕێکخراوەش، بریتیە لە تەبەننیی کردنی بیرۆکەی بەکافردانان (تکفیر)ی:

١) سەرجەم وڵاتانی ئیسلامیی، کە لەڕووی سیاسییەوە، بە پێی شەریعەت‌و یاساکانی بەڕێوەناچن، وەك: (أبو عمر البغدادي) لە وتەیەکیدا بەناونیشانی: (قُلْ إنّي عَلَى بيّنة مِنْ رَبِّي) {لە: ٢٠٠٧/٣/١٣دا} گوتوویەتی: (وَنَعْتَقِد بأنّ الديار إِذَا عَلَتْها شرَائعُ الكُفر وكَانَت الغلبة فيها لِأحكام الكفر دُونَ أَحْكَام الإِسلام، فَهِي دَار كُفر).
واتە: ئێمە پێمانوایە کە هەرکات سیستەمەکانی کوفر لەوڵاتاندا باڵادەست بوون‌و، یاساکانی کوفریان تێدا جێبەجێ کران، ئەوە مەنزڵگای کوفرن.

٢) تێکڕای حکومەتەکانی جیهانی ئیسلام‌و سەرجەم هێزە سەربازییەکان، وەك (أَبُو مُحَمَّد العدناني) لەوتەیەکیدا بەناونیشانی: (السِّلْمِيَّةُ دِين مَنْ؟) لە: ٢٠١٣/٨/٣١دا گوتوویەتی: (لابدَّ أن نصدع بحقيقة مرة لطالما كتمها العُلَمَاء أَلا وَهِي: كُفر الجيوش الحامية لأنظمة الطواغيت).

واتە: دەبێ ڕاستییەکی تاڵ بڵێین کە لەمێژە زانایان شاردوویانەتەوە، کە بریتیە لە بەکافردانانی هێزو سوپایە پارێزەرەکانی ڕژێمە طاغووتییەکان.

٣) تێکڕای لایەنو ڕێکخراوە ئیسلامییەکانی بەشداربووی پرۆسەی سیاسییو هەڵبژاردن، وەك (أبوعمر البغدادي) لە وتەیەکیدا لە (٢٠٠٧/٣/١٣) گوتوویەتی: (نرى كفر و ردة كل من اشترك في العملية السياسية، كحزب المطلق والدليمي والهاشمي وغيرهم، كما نرى أنَّ منهج الحزب الإسلامي، منهج كفر و ردة).

واتە: پێمانوایە هەر کەسێك لەپرۆسەی سیاسییدا بەشداربێ، کافرو هەڵگەڕاوەیە، وەك حیزبەکەی موتڵەگو دلێمییو هاشمییو ئەوانی دیکەش، هەروەها بەرنامەی حیزبی ئیسلامییمان، پێ بەرنامەیەکی کافرانەو هەڵگەڕاوانەیە.

## بەرپەرچدانەوەی بیرۆکەی بەکافردانانی داعش:

بۆ سەرجەم وڵاتانی ئیسلامییو، دەوڵەتو قەوارە سیاسییەکانو، ئەو ڕێکخراو و لایەنە ئیسلامییانەی بەشداریی لە پرۆسەی سیاسییدا دەکەن:

هەڵبەتە من لێرەدا نامەوێ بەدرێژیی لەوبارەوە بنووسم، چونکە ئەوە لە حەوسەڵەی ئەم نووسینەدا نیە، بۆیە هەربەکورتیی دەڵێم:

یەکێك لە بنچینە شەرعییەکان کە ئەهلی ئیسلام لەسەریان ڕێك کەوتوون، ئەوەیە کە یەقین بەگومان هەڵناوەشێتەوە: (الْيَقِينُ لا يَزُولُ بِالشَّكِّ) کەواتە: هەرکەسێكو هەر خەڵكو کۆمەڵگایەك لە مسوڵمانەتییان دڵنیابووین، دروست نیە بەگومانو دوودڵیی تۆمەتبار بکرێن بەکوفرو هەڵگەڕانەوە، مەگەر لەوبارەوە بەڵگەی ڕوونو بێ چەندوچوونمان هەبێ، کە بەڵگەیەکی ئاشکرامان لەلایەن خواوە لەسەری هەبێ، وەك پێغەمبەری خوا(صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فەرموویەتی: (إلاَّ أَنْ تَرَوْا

كُفْرَاً بَوَاحَاً عِنْدَكُمْ مِنَ اللهِ فِيهِ بُرْهَانٌ)[1].

(النووي)یش لەوبارەوە نووسیویەتی:

(إعلم أن مذهب أهل الحق: أنه لا يُكَفَّرُ أحدٌ من أهل القبلة بذنبٍ و لايكفَّر أهل الأهواء والبدع، وأَنَّ من جَحَد ما يُعْلَمُ من دين الإسلام ضرورة، حُكِمَ بردَّته وكُفْرِه، إلاّ أن يكون قريب عهدٍ بالإسلام، أو نشأ ببادية بعيدة، ونحوه ممَّن يخفى عليه، فيُعَرَّفُ ذلك، فإن استمرَّ، حكم بكفره، وكذا حكم من استحلَّ الزِّنا، أو الخمر أو القتل أو غير ذلك من المحرمات التي يعلم تحريمها ضرورة)[2].

واتە: بزانە کە ڕای ئەهلی حەق ئەوەیە کە هیچکەس لە ئەهلی قیبلە بەهۆی گوناهەوە بەکافر دانانرێ‌و، شوێنکەوتووانی ئارەزووەکان‌و داهێنراوەکان (مەبەستی خەواریج‌و شیعە مورجیئەو...هتدە) بەکافر دانانرێن‌و، هەرکەسێك نکوولّیی لە شتێك بکات، کە مەسەلەیەکی بەئاشکرا زانراوی ئیسلام بێ، حوکمی هەڵگەڕانەوەو بێبڕوایی بەسەردا دەدرێ، مەگەر کەسێك لە چۆڵەوانییەکی دووردا بووبێ‌و، وێنەی وی کە شتی وای لێ پەنهان بێ، ئەو کەسە ئەو شتەی نایزانێ، فێری دەکرێ، ئنجا ئەگەر هەر بەردەوام بوو، حوکمی کوفری بۆ دەدرێ، هەروەها هەرئەوەش حوکمی هەرکەسێکە کە زیناو مەی‌و قەتڵ‌و قەدەغەکراوەکانی دیکە "کە بەئاشکرا دەزانرێ، قەدەغەن" بە حەڵاڵ بزانێ.

**چوار**: ئەو ڕێکخراوە وێڕای ئەوە کە پەڵەی ناشیرین‌و ڕەشی زۆری هێناوەتە سەر مسوڵمانان‌و، بۆتە مایەی بێزراندنی ئیسلام لەبەرچاوی خەڵکێکی زۆری نائاشنا بە ئیسلام، زەرەرمەندی گەورەش بەدەستیەوە تەوژمی ئیسلامیی هاوسەنگ (التیّار

---

١) أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٦٦٤٧)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٤٨٧٧)

٢)صحيح مسلم بشرح النووي، ج١ ص١٥٠.

الإسلامي المُتَّزن)ەو، بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ، ئاو بە ئاشی حیزبو ڕژێمە سێکۆلاریستە ناحەزەکان تەوژمی ئیسلامییدا دەکاتو، خزمەتێکی بەلاشیان دەکات، کە هەرچی زیاتر خەڵكو جەماوەر چەواشە بکەنو پێیان بڵێن: ئیسلام بە کەڵکی ژیانو گوزەران نایەتو، بەڵگەش بیروبۆچوونو هەڵسوکەوتەکانی (داعش)ە!

**پێنج:** هەروەها شەڕ فرۆشتنی ئەو ڕێکخراوە بە گەلی کوردو گێچەڵ پێکردنی، چ لە هەرێمی کوردستانو، چ لە ڕۆژئاوای کوردستاندا، بەهەموو پێوەرێکی عەقڵو شەرعو بەرژەوەندیی، ستەمێکی گەورەو هەڵوێستێکی بێ بەڵگەو پاساوە، لەحاڵێکدا کە:

١- هەرێمی کوردستان بۆتە پەناو شوێنی تێدا حەوانەوەی سەدان هەزار خەڵکی بێ پەناو ستەمدیدە، لە عەرەبی سوننەو غەیری ئەوانیش.

٢- گەلی کورد لە سووریاو هەر شوێنێکی دیکەش، زیاد لە مافی ڕەوای خۆی کە خوای دادگەر بەهەموو گەلانی دنیای داوە "کە لە خاكو وڵاتی خۆیدا ئازادانە بژیو ژێر چەپۆك نەبێ" داوای نەکردوە!

## سێ یەم : ئایا ڕێکخراوی (داعش) پێناسەی تیرۆریزم (terrorism)ی بەسەردا دەچەسپێ؟

وشەی تیرۆریزم (terrorism) ئەم ڕۆژگارە بۆتە زاراوەیەکی سیاسیی کە زۆر بەکاردێ، بەڵام هەتا ئێستا پێناسەو واتایەکی دیارییکراو (مُحدَّد)ی نیەو، ڕەنگە دیاریی نەکردنی واتاو چەمکێکی ڕوونیش بۆ ئەو وشەیە، ئامانجی سیاسیی لەپشتەوە هەبێ، تاکو وەك تیغێکی دوو دم (سلاح ذوحدَّین) بەکاربێ، بۆ نموونە:

شیشانییەکان کە دژی دەوڵەتی ڕووسیا دەجەنگن‌و، داوای مافی چارەنووسیان دەکەن، ڕووسیا بە تیرۆریستو، ئەمەریکاش "ئەگەر لەبەرژەوەندییدابێ" بەشۆڕشگێڕو ئازادیخوازیان دەزانێ.

بەڵام پێموایە هەتا ئێستا باشترین‌و ڕوونترین پێناسە بۆ وشەی ناوبراو کە لەزمانی عەرەبییدا بە (إرهاب) لێکدراوەتەوە، کە بەکوردی دەبێتە ترساندن‌و تۆقاندن، ئەوەیە کە بگوترێ: (تیرۆر بریتییە لەبەکارهێنانی ترساندن‌و تۆقاندن لەکاتی ئاشتییدا، یان تۆقاندنی خەڵك‌و کەسانی مەدەنیی‌و لاشەڕ لەجەنگدا، بەبەکارهێنانی هێزو توندوتیژیی، بەمەبەستی هێنانەدی ئامانجێکی سیاسیی)، وەك:

١- (المعجم الوسيط) گوتوویەتی:(الإرهابيون: وصفٌ يطلق على الَّذِينَ يَسلُكُون سَبيل العُنْفِ والإرهَاب لتَحقيق أَهْدَافهم السياسية)[1]، واتە: ئیرهابییەکان وەسفێکە بۆ کەسانێك بەکاردێ کە بۆ هێنانەدی ئامانجە سیاسییەکانیان، ڕێی توندو تیژیی‌و تۆقاندن دەگرنە بەر.

١) بڕوانە: ص ٣٧٦.

٢- (معجم روبير الصغير الفرنسي) گوتوویەتی: (تيارٌ يَتَّخِذ الإجرائات الإستثنائية العنيفة بانتظام للوصول إلى أهدافٍ سياسية)[1].

واتە: تەوژمێکە بۆ گەیشتن بە ئامانجە سیاسییەکان بە شێوەیەکی بەرنامەیی ڕێکارە توندو تیژە نائاساییەکان، دەگرێتە بەر.

(معجم لاروس الفرنسي) بەمجۆرە پێناسەی تیرۆریزم دەکات: (عبارة عن جملة أعمال العُنْف ترتكبها مَنَظَّمة، من أجل خلقِ جَوٍّ من الرُّعْب، أومن أجل قلْب نظام الحكم)[2].

واتە: تیروریزم بریتیە لە کۆمەڵە کردارێکی توندوو تیژانە کە ڕێکخراوێك ڕەچاویان دەکات بەمەبەستی ڕەخساندنێکی کەش و هەوایەکی ترسناك، یان بۆ کودەتاکردن بەسەر ڕژێمێکدا.

شایانی باسیشە کە وشەی terrorism)) یەکەمجار لەساڵی (١٧٩٨) لەلایەن (ملحق الأكاديمية الفرنسية)وە بەکارهات، بۆ پێناسەی حکومەتی شۆڕشی فەرەنسا، کە خەڵکی دەتۆقاندو بەناوی شۆڕشەوە هەڕەشەی لێدەکردن، بەڵام دواتر زیاتر بۆ توندوتیژییەك بەکارهات، کە لەلایەن تاکەکان و گرووپەکانی دەرەوەی یاساوە ئەنجام دەدرا[3].

ئنجا پێویستە بگوترێ: کە وشەی (إرهاب) کە تەرجەمەی (terrorism)ی پێکراوە، لەجێی خۆیدانیە، چونکە: دەگونجێ ترساندن (إرهاب) شتێکی بەجێ بێ، بۆ وێنە: ئەگەر دژمنی خۆت بترسێنی تاکو ستەمت لێ نەکات، نەك هەر باشە، بگرە پێویستیشە، وەك خوای دادگەر فەرموویەتی:

---

١) فقه الجهاد ج٢ ص١١٧٨، د. يوسف القرضاوي.

٢)فقه الجهاد ج٢ ص١١٧٨، د. يوسف القرضاوي.

٣)فقه الجهاد ج٢ ص١١٧٨، د. يوسف القرضاوي.

﴿ وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن قُوَّةٖ وَمِن رِّبَاطِ ٱلۡخَيۡلِ تُرۡهِبُونَ بِهِۦ عَدُوَّ ٱللَّهِ وَعَدُوَّكُمۡ وَءَاخَرِينَ مِن دُونِهِمۡ لَا تَعۡلَمُونَهُمُ ٱللَّهُ يَعۡلَمُهُمۡۚ وَمَا تُنفِقُواْ مِن شَيۡءٖ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ يُوَفَّ إِلَيۡكُمۡ وَأَنتُمۡ لَا تُظۡلَمُونَ ٦٠ ﴾الأنفال.

دەشگونجێ ترساندنو تۆقاندنو بەکارهێنانی زەبرو زەنگ، تاوانێکی زۆر زل بێ، بۆ وێنە: ئەگەر لەکاتی ئاشتییدا بەکاری بێنی، یان لەجەنگدا دژی خەڵکی مەدەنییو لاشەڕ بەکاری بێنی.

ئنجا ئایا ڕێکخراوی (داعش) پێناسەی تیرۆریست (Terrorist) دەیگرێتەوە؟!

دەڵێین: بەڵێ، هەرکەس سەرنجی بیروبۆچوونو ڕەفتارو هەڵوێستەکانی ڕێکخراوی ناوبراو بدات، کە چۆن دەست لە خەڵکی سیڤیل (مدني)و لاشەڕ ناپارێزنو زۆریش مەبەستیانە بەکوشتنی بەکۆمەڵو سەربڕینو سووتاندنو خنکاندنو ئەشکەنجەدان، ترسو بیم بڵاوبکەنەوە، تاکو بەخەیاڵی خۆیان سەرەنجام واقیع بگۆڕنو بەوجۆرەی لێ بکەن، کە بەحیسابی وان ئیسلام دەیخوازێ! هیچ گومانی نامێنێ کە (داعش) شێوە پێناسەی تیرۆریستیان بەسەردا دەچەسپێ.

بەڵام بێگومان پێناسەی (تیرۆریست) تەنیا بەسەر ڕێکخراوی داعشدا ناچەسپێو، هەر قەوارەو گرووپو ڕێکخراوو باندو کەسێکی دیکەش بیەوێ، بەزەبری ترساندنو تۆقاندنو کوشتنو بڕین پڕۆژەو بەرنامەو فیکرەی خۆی بەسەر خەڵکدا بسەپێنێ، دەکەوێتە هەمان خانەوەو، هەمان پێناسە دەیگرێتەوە، عەلمانیی بێ یان ئیسلامییو، ڕۆژهەڵاتیی بێ، یان ڕۆژئاوایی.

## چوارەم: هۆکارە سەرەکییەکانی ڕێ لێتێکچوونی (داعش):

پێم وایە هۆکارە سەرەکییەکانی ئەو پەرگیریی و لادانەی داعش، ئەم سێیانەن:

## یەك: زێدەڕۆیی لەبەکافردانان‌دا:

وەك پێشتر باسمان کردو ،چەند قسەیەکی بەرپرسانیانمان بەنموونە هێناوەیەوە، ئنجا بێگومان کەسێکیش سەرجەم وڵاتانی ئیسلامیی بەمەنزڵگای کوفر (دار الكفر) بزانێ و، تێکڕای دەوڵەتەکان و سوپاو هێزەکانیان بەکافر دابنێ، بگرە سەرجەم لایەنە ئیسلامییە بەشداربووەکانی پرۆسەی حوکمڕانیی، بەکافرو هەڵگەڕاوە دابنێ! ئەوە ئەو بیروبۆچوونەی هەر سەری بەو ڕەفتارو هەڵسوکەوتانە دەگەیەنێ، کە ڕۆژانە لەکەناڵەکانی ڕاگەیاندندا دەیانبینین و دەیانبیستین.

ئنجا دیارە ئێمە پێشتر لەبارەی بەرپەرچدانەوەی بیرۆکەی بەکافردانانی مسوڵمانانی ئەهلی قیبلەدا، هەندێك شتمان گوت و، لێرەش هەندێك قسەی دیکە لەوبارەوە دەکەین:

(إِبْنُ تيمية) لەو بارەوە گوتوویەتی: (فَلَيْسَ لِأَحَدٍ أَنْ يُكَفِّرَ أَحَدًا مِنَ الْمُسْلِمِينَ وَإِنْ أَخْطَأَ وَغَلِطَ حَتَّى تُقَامَ عَلَيْهِ الْحُجَّةُ وَتُبَيَّنَ لَهُ الْمَحَجَّةُ، وَمَنْ ثَبَتَ إِيمَانُهُ بِيَقِينٍ لَمْ يَزُلْ ذَلِكَ عَنْهُ بِالشَّكِّ، بَلْ لا يَزُولُ إِلاَّ بَعْدَ إِقَامَةِ الْحُجَّةِ وَإِزَالَةِ الشُّبْهَةِ)[1].

واتە: هیچکەس بۆی نیە هیچ کام لەمسوڵمانان ئەگەر هەڵەو گوناهیشیان هەبێ، بەکافر دابنێ، هەتا بەڵگەی لەسەر تەواونەکرێ و ئیشکالەکەی لانەدرێ (با کوفریشی هەبێ) مسوڵمانەتییەکەی لاناچێ.

---

١) مجموع الفتاوى، ج١٢ ص٥٠١.

هەروەها (إبْنُ تيمية) لەبارەی حوکمڕانێکەوە کە لەبەر هۆکارێك یان چەند هۆکارێکی لەئیرادەی خۆی بەدەر، ناتوانێ حوکم بەقورئان بکات، یان بەتەواویی حوکمی پێ بکات، گوتوویەتی:

(النَّجَاشِيُّ هُوَ وَإِنْ كَانَ مَلِكَ النَّصَارَى فَلَمْ يُطِعْهُ قَوْمُهُ فِي الدُّخُولِ فِي الإِسْلامِ، بَلْ إِنَّمَا دَخَلَ مَعَهُ نَفَرٌ مِنْهُمْ، وَلِهَذَا لَمَّا مَاتَ، لَمْ يَكُنْ هُنَاكَ أَحَدٌ يُصَلِّي عَلَيْهِ... وَنَحْنُ نَعْلَمُ قَطْعًا أَنَّهُ لَمْ يَكُنْ يُمْكِنُهُ أَنْ يَحْكُمَ بَيْنَهُمْ بِحُكْمِ الْقُرْآنِ... وَكَثِيرًا مَا يَتَوَلَّى الرَّجُلُ بَيْنَ الْمُسْلِمِينَ وَالتَّتَارِ قَاضِيًا بَلْ وَإِمَامًا، وَفِي نَفْسِهِ أُمُورٌ مِنْ الْعَدْلِ يُرِيدُ أَنْ يَعْمَلَ بِهَا فَلا يُمْكِنُهُ ذَلِكَ، بَلْ هُنَاكَ مَنْ يَمْنَعُهُ ذَلِكَ، وَلَا يُكَلِّفُ اللهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا، وَ (عُمَرُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ) عُودِيَ وَأُوذِيَ عَلَى بَعْضِ مَا أَقَامَهُ مِنْ الْعَدْلِ وَقِيلَ: إِنَّهُ سُمَّ عَلَى ذَلِكَ، فَالنَّجَاشِيُّ وَأَمْثَالُهُ سُعَدَاءُ فِي الْجَنَّةِ، وَإِنْ كَانُوا لَمْ يَلْتَزِمُوا مِنْ شَرَائِعِ الإِسْلامِ مَا لا يَقْدِرُونَ عَلَى الْتِزَامِهِ، بَلْ كَانُوا يَحْكُمُونَ بِالأَحْكَامِ الَّتِي يُمْكِنُهُمْ الْحُكْمُ بِهَا)[1].

نەجاشیی هەرچەندە کە پادشای نەصرانییەکان بوو، بەڵام خەڵکەکەی بۆ هاتنە نێو ئیسلام بەقسەیان نەکردوە، تەنیا چەند کەسێکیان لەگەڵی مسوڵمان بوون هەربۆیەش کاتێك مرد، کەس نەبوو نوێژی لەسەر بکات... ئنجا ئێمە دڵنیاین کە بۆی نەگونجاوە حوکم بە قورئان بکات... زۆر جاریش پیاوێك لەنێوان مسوڵمانانو تەتاریەکاندا دەبێتە قازیی، بگرە پێشنوێژیش، کەچی زۆر شتی دادگەرانەی لە دڵدا هەیە، بەڵام بۆی نالوێ بیکات، بگرە جاری وا هەیە یەکێك ڕێشی لێ دەگرێو، خواش لە توانا بەدەر لەکەس داوا ناکات، (عمر بن عبدالعزیز)یش لەسەر بەشێك لە دادگەرییکە پێی هەڵسا، دژایەتیی کراو ئازار دراو گوتراوە: لەسەر ئەوە ژەهر خواردووش کرا.

---

١) مجموع الفتاوی، ج١٩ ص٢١٧.

هەڵبەتە نەجاشیی‌و هاوڕێنەکانی بەختەوەرو بەهەشتین، هەرچەندە ئەوەی کە لە ئیسلام بۆیان نەگونجاوە، پێیەوە پابەند نەبوون، بەڵکو تەنیا ئەو یاسا شەرعییانەیان جێ بەجێ کردوون، کە بۆیان گونجاو بوون.

## دوو: تەنیا کوفر بەهۆکاری جەنگ لەگەڵ کرانی نامسوڵمانان، دانان:

کە ئەمە ڕایەکی زۆر بێهێزی زانایانەو، پێچەوانەی دەقی قورئانیشە، وەك خوا فەرموویەتی:

١- ﴿ وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمۡ وَلَا تَعۡتَدُوٓاْ ﴿١٩٠﴾ ﴾ البقرة.

٢- هەروەها فەرموویەتی:﴿ فَإِنِ ٱعۡتَزَلُوكُمۡ فَلَمۡ يُقَٰتِلُوكُمۡ وَأَلۡقَوۡاْ إِلَيۡكُمُ ٱلسَّلَمَ فَمَا جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمۡ عَلَيۡهِمۡ سَبِيلٗا ﴿٩٠﴾ ﴾النساء.

هەردووك ئایەتەکەش زۆر ڕوونن، کە لە مسوڵمانان قەدەغەیە شەڕ لەگەڵ نامسوڵمانانی لاشەڕو بێ لایەندا بکەن!

(إبْنُ تيمية)ش لەوبارەوە گوتوویەتی: (وَكَانت سيرته أن كُلَّ مَنْ هادَنَهُ من الكُفّار، لَمْ يُقاتِلْهُ، وَهَذِهِ كتب السيرة والحَدِيث والتفسير والفقه والمغَازِي تنطق بهَذَا، وَهَذَا مُتَواتر فِي سِيرته، فَهُوَ لَمْ يبدأ أَحَداً من الكفار بقتَالٍ...)[1]

کە پوختەی مەبەستەکەی ئەوەیە: پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) هەرگیز جەنگی لەدژی کافرانێکی لاشەڕو ئاشتییخواز نەکردوە، بەڵام داعش مسوڵمانانیش لەدەستی سەلامەت نەبوون، بەعەرەب‌و کوردو سوننەو شیعەو ئیسلامیی‌و عەلمانییەوە، چ جای نامسوڵمانان!

---

١) قاعدة مختصرة في قتال الكفار ومداهنتهم، ص١٣٤.

دیاره ئێمه "خوا یاربێ" له ئالْقەی سێیەمی ئەم زنجیره باسەدا، تیشکی زیاتر دەخەینه سەر ئەو بابەته، که دەبێ قەوارەیەکی سیاسیی ئیسلامیی، چۆن مامەڵه لەگەڵ نا مسوڵماناندا بکات!

## سێ: دەمارگیریی لەڕاددەبەدەر بۆ بیروڕاو بۆچوونی خۆ:

ئەمیش هۆکارێکی دیکەی بنەڕەتیی پەڕگیریی‌و لادانی (داعش)و گرووپە پەڕگیرەکانی دیکەی هاووێنەشیەتی‌و، بەهۆی ئەو دەمارگیریی‌و داخراویی‌و دۆستایەتیی‌و دوژمنایەتیی (وَلاء وبراء) لەسەر بناغەی ڕێکخراو بیروڕای حیزبیی بنیات نانەوە، داعش سەنگەریان بەر لە نامسوڵمانان، لە مسوڵمانان‌و ئیسلامییانێك گرتوە، که ئامادەنین بەیعەتیان پێبدەن‌و بەقسەیان بکەن‌و، دەستیان هەتا ئانیشك بە خوێنی خەڵکێکی زۆری ئیسلامیی سوور بووە، چ لەسووریاو چ لەعێراقیش، هەر لەبەر ئەوەی ئامادە نەبوون، بچنە ژێر ڕکێفیانەوە!

**پێنجەم: سەرەنجامی (داعش) چۆن دەبێ؟**

بێگومــان تــەنها خــوا پەنهانزانــە، ﴿ قُل لَّا يَعْلَمُ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ٱلْغَيْبَ إِلَّا ٱللَّهُ ۚ وَمَا يَشْعُرُونَ أَيَّانَ يُبْعَثُونَ ﴿٦٥﴾ ﴾النمل، بەڵام بەپێی یاساکانی خـوا (سُـنَن الله) کــە لــەژیانی بەشــەردا دانــاونو، یــەکێکیان بریتیــە لــەوە کــە ســتەمو دەســتدرێژیو تێپەڕانـدن، هەمیشــە تەمــەنی کورتــەو زۆر بڕناکـات، وەك خـوای کاربەجێ فەرموویـەتی: ﴿ وَمَا كُنَّا مُهْلِكِي ٱلْقُرَىٰٓ إِلَّا وَأَهْلُهَا ظَٰلِمُونَ ﴿٥٩﴾ ﴾القصـص، واتــە: ئێمــە عادەتمـان نیـە ئاوەدانییـەکان بفـەوتێنین، مەگـەر خەڵکەکەیان ستەمکاربن.

هەروەها زانایانی ئیسلام، وەك بنچینەیەك گوتوویانە: (قَدْ يَدوم الملك مَعَ الكُفْرِ وَلاَ يَدُومُ مَعَ الظُّلْم) واتـە: حـوکمڕانیی بـەکوفرەوە دەوام دەکـات، بـەڵام بەزوڵمـەوە پایەدار نابێ.

ئنجـا گرفتــی ئـەو ڕێکخـراوە ئەوەیـە کـە نـەهیچ زانایـەکی متمانـە پێکـراوو موعتەبەریان لەنێودایە "وەك لەئـەنجامی بەدواداچوونی زۆردا بـۆم دەرکـەوت" وە نەگوێش بۆ هیچ زانایەك دەگـرن، تەنانـەت ئەوانـەش کـەکاتی خـۆی ڕێ نیشـاندەر (مُنظِّـر)ی ڕێکخـراوە تونـدو پـەڕگیرەکانیش بـوون، وەك: (أَبُـو مُحَمَّـد المقدِسـي و أَبُوقَتَادَة الفَلَسْطِيني وَأَبُـو بَصِـير وَأَيْمَـن الظَّـوَاهِرِي) هەربۆیـەش (الـدکتور عبـدالله الحسيني) لەبارەی ئەو ڕێکخراوەوە گوتوویەتی: (وَإِنَّني وَاللهِ لَمْ أَرَ عُلَمَاءَ الجِهَاد فِي الأَرْض اتَّفَقوا عَلَى نقد مَشْروعِ إِسْلامي ومخالفتـه كَمَـا اتَّفَقـوا عَلَـى نقـد مَشْـرُوع الدَّوْلَة فِي الشَّام).

واتە: بەخوا من زانایانی پسپۆڕی بواری جیهادم لەسەر زەمینـدا نـەدیون، کـە وەك ڕەخنـەگرتنییان لـەپڕۆژەی ڕێکخـراوی دەوڵـەت (داعـش) لەشـامو دژایـەتیی کردنـی، لەسـەر ڕەخنـەلێگرتنی هـیچ پڕۆژەیـەکی دیکـەی ئیسـلامیی، ئـاوا کـۆڕا بووبن.

بۆیە من پێموایە سەرەنجامی ئـەو ڕێکخـراوە، بریتیـە لەسـەربەفەتارەت چـوون، پێشم سەیربوو، کە ئەمریکا سێ ساڵ ماوەی دانا بۆ لەبەین چوونی (داعـش)، کـە من پێموایە هێندە ناخایەنێ، مەگەر ئـەو ماسـتە مـووێکی، یـان چـەند مـووێکی تێدابن‌و، بویسترێ بۆهێنانەدی چەند ئامانجێك، شەڕەکە درێژە بکێشێ!

هەڵبەتـە یـەکجار یـەکجاریش لەسـەر دڵـم قورسـە کـە ئێسـتا ئـەمریکاو هاوپەیمانەکانی وا دێنە بەرچاو، کە دەربازکەر (مُخَلِّص)ی خەڵکی سووریاو عێراقن لە دەستی داعش، کـە لەڕاسـتییدا ئـەوان ئەجینـداو بەرژەوەنـدیی خۆیـان هەیـەو، لەبەرچاوی کاڵی خەڵك نیە، بـەڵام چـی بکـەین کـە داعـش کـارێکی کـردوە، ئـاوا دیمەنێك سازبێ‌و، خەڵکێکی زۆریش لەوبارەوە چەواشە ببێ‌و کڵاویان بچێتە سەر!

پێشنـانیش گوتوویانە: (قد يبلغ الجاهل من نفسه مالا يبلغ منـه عـدوّه!) واتـە: نەزان کاری وا بەخۆی دەکات، کە دوژمنی لەدژی پێی نەکرابێ!

گرنگیشــە کــە هــەموو لایــەك بــە ئیســلامیی‌و عــەلمانیی‌و مســوڵمان‌و نامسـوڵمانەوە، دەرس‌و پەنـد لەهەڵـەو پەڵـەو تـاوان‌و لادانـی داعـش‌و غـەیری داعشیش وەربگرن‌و، بێگومانیش هەموو مسوڵمانێك لەسەر دڵـی بـارێکی گرانـە، کە کۆمـەڵێك گـەنج‌و لاوی سـادەو نەشـارەزاو بـێ ئـەزموون، بـەناوی ئیسـلامەوەو لەژێر بەیـداغی ئیسـلامدا، بەکوشـت بـدرێن‌و، خەڵکێکیشـیان بەدەسـت بەکوشـت بدرێ بەناهەق‌و، سەرنجامیش نەك هیچ کەڵێنێك بـۆ ئیسـلام‌و مسـوڵمانان نـەگرن،

بگرە ببنە مایەی ئیحراج کردنی مسوڵمانانو[1]، لەبەر چاوان بێزراندنی ئیسلام"دیارە لەبەرچاوی خەڵکی نا ئاشنا بەئیسلام"، بۆیە پێویستە لەخوا بپارێینەوە، کە گەنجو لاوەکانمان هێندە لەئایینو بەرنامەکەی شارەزا بکات، کە (کا)و (دان)ی هەر ڕێکخراو و لایەنێك کە بەناوی ئیسلامەوە دێتە ئاراوە، لەیەك جیا بکەنەوەو، لەبەر ڕووکەش بینییو سەرکێڵیی، دوومەڵ بەبەز حاڵی نەبنو، وانەبن کە لەقیامەتدا وێڕای ماندووبوونی زۆریش، هەگبە بەتاڵو دەست خاڵیی بن، چونکە بێگومان کردەوەکان بەبێ دوو مەرجی سەرەکیی قبووڵ ناکرێن:

یەکەم: بەپێی شەریعەت بوون (الإتّبَاع).

دووەم: تەنیا بۆ خوابوون (الإخْلاَص).

وەلەڕاستییدا هیچ کام لەو دووانە کەلێنی ئەوی دیکە پڕناکاتەوەو، دەبێ هەردووکیان پێکەوە بن، وەك خوای دادگەر فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلْمُتَّقِينَ ۝٢٧﴾المائدة.

واتە: بێگومان خوا کردەوان تەنیا لە پارێزکاران وەردەگرێ.

ئاشکراشە هەرکەس خۆی لەلادان لەشەریعەت (الإنحراف عن الشريعة)و شیركو ڕیابازیی نەپارێزێ، بەپارێزکار (مُتَّقي) دانانرێو، مادام پارێزکاریش نەبێ، کردەوەکانی لەلای خوا وەرناگیرێن.

هەروەها گرنگیشە کە هەموولایەك لەدڵو زمانی خۆمان وریابینو، بەهۆی بیروبۆچوونە پەرگیرو سەقەتو، کردارو ڕەفتارە دزێوو ناشیرینەکانی (داعش)ەوە، گومانمان بەرانبەر بە ئیسلام خراپ نەبێو، زمانمان یان قەڵەممان بەرانبەری بەدگۆیی

---

١) ئێستاش: {٢٠١٨/٩/٢٤ – ١٤ محرم ١٤٤٠ك} واتە: دوای چوار ساڵ دوو مانگ کەم لەکاتی نووسینی ئەم باسە: {٢٠١٤/١١/٩ز – ٦ محرم ١٤٣٦ك} ئەوەی پێشبینییمان کردبوو، کتو مت هاتە دی!!

نەكات، چونكە ئیسلامێك كە بۆماوەی سێزدە سەدە، دەیان جۆرە ئایینو فیكرەی لەگەڵ مسوڵمانانندا پێكەوە كۆكردوونەوەو، بەتەبایی پێكەوە سازاندوونی، حەیفو ستەمە بەهۆی هەڵەو لادانو تاوانی هەندێك لەشوێنكەوتوانییەوە، بەناهەق تۆمەتبارو تاوانبار بكرێ!

## دەستپێک

سەرەتا دەڵێین:

مەبەست لەم باسە، خستنە ڕووی ئەو ڕاستییەیە، کە ئەوەی ڕێکخراوی دەوڵەتی ئیسلامیی ناسراو بە (داعش) دژی یەزیدییەکان کردی، کە ئافرەتەکانیانی کردە کۆیلەو، وەك کەنیزەك (جاریة) مامەڵەی لەگەڵ کردن، ستەمێکی گەورەیەو ڕەفتارێکی دژی شەریعەتەو، هەرچەندە بەناوی ئیسلامو لەژێر بەیداغی ئیسلامدا کراوە، بەڵام ئیسلام لێی بەرییە، بابزانین چۆنو بۆچی؟

خوا پشتیوان بێ لەچوار بڕگەدا ئەم بابەتە دەتوێژینەوە، کە ئەمانە ناوو نیشانەکانیانن:

١- ئاوڕدانەوەیەك لە مێژوو.

٢- ئیسلام چی لە سیستمی کۆیلایەتیی کرد؟

٣- لەکەیەوە بڕیاری نەهێشتنی کۆیلایەتیی درا؟:

٤- ئایا لەم ڕۆژگارەدا دروستە مرۆڤ بکرێتە کۆیلە ؟!

## بڕگەی یەکەم: ئاوڕدانەوەیەك لە مێژوو:

سەرجەم سەرچاوە مێژووییەکان پێمان دەڵێن: کە کۆیلایەتیی (الرِّق) لەلای ئۆممەتو کۆمەڵگا پێشووەکان وەك: میصرییەکانو بابلییەکانو بەرهەمییەکانو فارسەکانو ڕۆمەکانو عەرەبەکان، شتێکی باو بووە، هەروەها جوایەتیی (الیهودیة)یش بڕیاری لەسەرداوەو، نەصرانییەتیش دانی پێدا هێناوە، بگرە تێکڕای فەیلەسووفەکانی یۆنان، وەك: (ئەفلاتوونو ئەرستۆ)و، یاسا زانەکانی ڕۆم، وەك: (شیشرۆنو سینیك)یش سەلماندوویانەو بەشتێکی ئاساییان زانیوە.

یەکەمین جاریش ڕۆمەکان دیلەکانی جەنگیان کردنە کۆیلە[1].

هەروەها کتێبەکانی جوولەکەو نەصرانییەکانیش بەڕاشکاویی باسی ڕەوایەتیی کۆیلایەتییان کردوە، بۆ وێنە: ئێستاش لە (پەیمانی کۆن)دا کە کتێبی پیرۆزی هەرکام لە جوولەکەو نەصرانییەکانە، ئەم دەقە دەخوێنینەوە:

(وَحِين تَتَقدَّمون لمحارَبة مَدِينَة فَادْعوهَا للصُّلح أَوَّلاً، فَإِن أَجابتكُم إلى الصُّلْح وَاستسلمَت لَكُمْ، فَكُلّ الشّعب الساكن فِيهَا يُصبِحُ عَبيدًا لَكُم...).

واتە: کاتێك بۆ شەڕی شارێك دەچن، یەکەمجار بانگیان بکەن بۆ سوڵح، ئنجا ئەگەر سوڵحیان کردنو ملکەچتان بوون، ئەوە هەموو دانیشتووەکانی دەبنە کۆیلەتان[2].

هەروەها ئێستاش لە (پەیمانی نوێ)دا کە کتێبی پیرۆزی نەصرانییەکانە، ئەم دەقە دەخوێنینەوە: (أَيُّهَا العَبيد ! أَطيعوا سَادتكُم البشريين بخَوفٍ وارتعادٍ مِنْ قَلْبٍ صَادِق كَمَنْ يطيع المسِيح...)[1].

---

١) بڕوانە: (الرّق في الإسلام)ی أحمد شفيق باشا، ص٩-٢٧، (مدوَّنة جوستنيان) ص١١.

٢) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، سفر التثنية، الإصحاح: ٢٠، ص٣٩٢.

واتە: ئەی کۆیلەکان! فەرمانبەریی مرۆڤە خاوەنەکانتان بکەن، بەترسو لەرزەوەو بەدڵێکی ڕاستەوە، وەك کەسێك کە فەرمانبەریی مەسیح دەکات.

کەواتە: بابزانرێ کە کتێبی پیرۆز (الكتاب المقدَّس)ی جوولەکەو نەصرانییەکان لەبارەی کۆیلایەتییەوە چی دەڵێ؟ پاشان سەرنجی قورئانیش دەدەین لەو بارەوە.



١ )التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد الجديد، الرسالة إلى مؤمني أفسس السادة والعبيد، ص ٢٥٣٢.

## بڕگەی دووەم: ئیسلام چی لە سیستمی کۆیلایەتیی کرد؟

کاتێك ئیسلام "دوایین نوسخەی بەرنامەی خواو دوا پەیامی خوا بۆ مرۆڤایەتی" هات سیستمی کۆیلایەتیی (نظام الرّق) چەندان سەدە بوو ڕەگ‌و ڕیشەی بە قووڵایی مێژووی بەشەردا چوو بووە خوارو، لەنێو سەرجەم گەل‌و وڵاتانی دنیادا، شتێکی باوو کارپێکراوو، بە ئاسایی‌و سروشتی تەماشاکراو بووو، بەشێکی گەورەوگرنگی ژیانی سیاسیی‌و ئابووریی‌و کۆمەڵایەتیی کۆمەڵگایەکانی پێکدەهێنا، وەك چۆن ئێستا سیستمی سەرمایەداریی (النظام الرأسمالي) بە بناغەی زۆربەی قەوارە سیاسیی‌و کۆمەڵگایەکانی ئەم ڕۆژگارە دادەنرێ[1].

بۆیە نەدەگونجا ئیسلام لەلایەن خۆیەوەو بە نووکە قەڵەمێك، ئەو واقیعە پڕ ستەم‌و نامرۆڤانەیە بگۆڕێ، هەرچەندە هێندەی کێوێك لەسەر دڵی قورس بوو، کە مرۆڤەکان هەندێکیان هەندێکیان بکەنە کۆیلەو کەنیزەك‌و، وەك کەل‌و پەل‌و ئاژەڵ، سەوداو مامەڵەیان پێ بکەن، بۆیە ئیسلام هەڵسا بۆ گۆڕینی ئەو واقیعە نالەبارە، سیاسەتێکی پلەپلەیی گرتەبەر، بەم شێوەیەی خوارێ:

### یەك: چارەسەری فیکریی:

لەسۆنگەی ئەوەوە کە هەڵسوکەوتەکان (تصرّفات) زادەی بۆچوونەکان (تصوّرات)ن، ئەگەر بویستری هەڵسوکەوتێکی خراپ، چاك بکرێ، دەبێ ئەو بیرو بۆچوونە چەوتەی لێیەوە هەڵقوڵیوە، ڕاست بکرێتەوە، ئیسلامیش بۆ بنبڕکردنی دیاردەی کۆیلایەتیی، هەر وایکردو، سەرەتا خوای کاربەجێ‌و زانا لە چەندان

١)بڕوانە: آثار الحرب، دکتور: وهبة الزحيلي، ص٤٠٩.

ئایەتدا ئەو ڕاستییەی ڕاگەیاند، کە مرۆڤەکان هەموویان وەچەو زادەی باب‌و دایکێکن‌و یەکسانن‌و، بە پارێزکاریی، بەرزیی‌و نزمییان لەنێودا پەیدا دەبێ، بۆنموونە:

﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴿١٣﴾ ﴾الحجرات.

واتە: ئەی خەڵکینە! ئێمە ئێوەمان لەنێرو مێیەك وەدیهێناوەو گێڕاومانن بە چەندان گەل‌و هۆز، تاکو یەك ئاشنا بن، بێگومان بەڕێزترینتان لەلای خوا پارێزکارترینتانە، بەدڵنیایی خوا زانای شارەزایە.

ئەمەش بۆئەوەی هەم کۆیلەکان بەر لە جەستەو ڕواڵەتیان، ڕووح‌و ناخییان ئازاد بێ‌و، هەست بەڕێزو حورمەتی یەکسانیی خۆیان بکەن لەگەڵ گەورەکانیان‌و، هەم گەورەکانیشیان بزانن: کە هیچیان لەوان زیاد نیەو وەك یەکن.

## دوو: وشك کردنی سەرچاوەکانی لێوەهاتنی کۆیلە:

پێش هاتنی ئیسلام، جگە لە دیلەکانی جەنگ (أسرى الحرب) لە چەند ڕێیەکی دیکەشەوە، خەڵك دەکرانە کۆیلە، وەك:

١. قەرزدارێك کە قەرزەکەی پێ نەدرابایەوە، دەبووە کۆیلەی خاوەن قەرز.

٢. ژنێك کە لە مێردی ڕایکردباوگیرابایەوە، دەبووە کۆیلەی مێردەکەی.

٣. دزییکردن، بابای دز دەبووە کۆیلەی دزیی لێکراو.

٤. خۆکردنە کۆیلەی یەکێکی دیکە.

٥. ڕاکردوو لە جەنگ.

بەڵام ئیسلام جگە لە دیلی جەنگ "ئەویش بەشێوەیەكی كاتیی" هەموو ڕێیەكانی دیكەی كە خەڵكیان لێوە دەكرایە كۆیلە، بەستنیو، زۆربەی هەرە زۆری سەرچاوەكانی كۆیلایەتیی لەلایەن خۆیەوە یەكسەر وشك كردن.

## سێ: ئازادكردنی ئەو كۆیلانەی هەبوون:

ئیسلام چەندان ڕێی دانان بۆ ئازادكردنی كۆیلان:

١- دانانی هەشتیەك (١/٨)ی زەكات بۆ ئازادكردنی كۆیلان، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ لِلْفُقَرَآءِ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَٱلْعَٰمِلِينَ عَلَيْهَا وَٱلْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِى ٱلرِّقَابِ وَٱلْغَٰرِمِينَ وَفِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ ۖ فَرِيضَةً مِّنَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٦٠﴾﴾التوبة.

دیارە مەبەست لە (في الرقاب) كۆیلەكانن، كەواتە: هەشتیەكی زەكاتی هەموو مسوڵمانان، خوای دادگەر بۆ ئازادكردنی كۆیلانی تەرخان كردبوو.

٢- (المكاتبة) كە بریتییە لە ڕێككەوتنی كۆیلەو خاوەنەكەی، لەسەر پێدانی ئەندازەیەك بەخاوەنەكەیو خۆكڕینەوەی، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿وَٱلَّذِينَ يَبْتَغُونَ ٱلْكِتَٰبَ مِمَّا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ فَكَاتِبُوهُمْ إِنْ عَلِمْتُمْ فِيهِمْ خَيْرًا ۖ وَءَاتُوهُم مِّن مَّالِ ٱللَّهِ ٱلَّذِىٓ ءَاتَىٰكُمْ ﴿٣٣﴾﴾النور.

وەك دەبینین خوای زانا فەرمانی كردوە بە خاوەن كۆیلەكان، كە هەركات كۆیلەكانیان داوای موكاتەبەیان لێیان كرد، لەگەڵیان بكەن (مادام تێیان ڕادەبینن)و هاوكارییشیان بكەن.

٣- دانانی ئازادكردنی كۆیلەیەك، وەك سزاوكەفارەت بۆ چەند جۆرە گوناهو هەڵەیەك:

أ- کوشتنی بە هەڵە: (خطأ): ﴿وَمَن قَتَلَ مُؤْمِنًا خَطَئًا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ ﴿٩٢﴾﴾ النساء.

ب- شکاندنی سوێند: ﴿لَا يُؤَاخِذُكُمُ اللَّهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ الْأَيْمَانَ ۖ فَكَفَّارَتُهُ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَاكِينَ مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ أَوْ كِسْوَتُهُمْ أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ ۖ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ ۚ ذَٰلِكَ كَفَّارَةُ أَيْمَانِكُمْ إِذَا حَلَفْتُمْ ۚ وَاحْفَظُوا أَيْمَانَكُمْ ۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٨٩﴾﴾ المائدة.

ج- ظیهارکردنی مێرد لە ژنی: ﴿وَالَّذِينَ يُظَاهِرُونَ مِن نِّسَائِهِمْ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُوا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مِّن قَبْلِ أَن يَتَمَاسَّا ﴿٣﴾﴾ المجادلة.

(ظهار)یش ئەوەیە کە مێرد بە ژنی بڵێ: تۆ وەك پشتی دایکم وای.

## چوار: جوانترین مامەڵەکردن لەگەڵیاندا:

بۆنموونە: پێغەمبەری خوا (صَلّی اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّم) فەرمانی بە مسوڵمانان کردوە، کە وشەی (عبد) و (أمة) بۆ کۆیلەکانیان بەکارنەهێنن و لەجیاتی ئەوە، وشەی: (فتاي و فتاتي) یان (غلامي و جاريتي) بەکاربهێنن، کە (فتى) و (فتاة) بە مانای کوڕوکچی گەنجە، (غلام) و (جارية)ش بە هەمان شێوە، هەمان مانایان هەیە، وەك فەرموویەتی:

١- (لا يَقُولُ أَحَدُكُمْ: عَبْدِي وَأَمَتِي، كُلُّكُمْ عَبِيدُ اللهِ، وَكُلُّ نِسَائِكُمْ إِمَاءُ اللهِ، وَلَكِنْ لِيَقُلْ: غُلامِي وَجَارِيَتِي وَفَتَايَ وَفَتَاتِي)[١]

٢- (إِخْوَانُكُمْ جَعَلَهُمُ اللَّهُ تَحْتَ أَيْدِيكُمْ، فَمَنْ كَانَ أَخُوهُ تَحْتَ يَدِهِ، فَلْيُطْعِمْهُ مِنْ طَعَامِهِ، وَلْيُلْبِسْهُ مِنْ لِبَاسِهِ، وَلاَ يُكَلِّفْهُ مَا يَغْلِبُهُ، فَإِنْ كَلَّفَهُ مَا يَغْلِبُهُ فَلْيُعِنْهُ عَلَيْهِ).[٢]

وەك دەبینین پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) کۆیلەکان بەبرای ئازادەکان ناودەباتو، فەرمانیش بەئازادەکان دەکات کە برایانە لەگەڵیان هەڵسو کەوت بکەنو، لەهەمان خواردنو پۆشاکی خۆیانیان پێ بدەنو، لەکاروباردا هاکاریان بن.



١) أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٢٢٤٩)، وَأَحْمَد برقم: (٩٩٦٥)، وَالنَّسَائِيُّ في "الكبرى" برقم: (١٠٠٧٠)، وَأَبُو يَعْلَى برقم: (٦٥٠٦).

٢) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢١٤٤٧)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٢٤٠٧)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٦٦١)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٥١٥٨)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٩٤٥)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٦٩٠).

## بڕگەی سێیەم: لەکەیەوە بڕیاری نەهێشتنی کۆیلایەتیی درا؟

هەرچەندە ئیسلام بەردی بناغەی نەهێشتنی کۆیلایەتیی داناو، بەشێوەیەکی پلەپلەییو حەکیمانەش مامەڵەی ئەو واقیعە نەخوازراو و سەپێنراوەدا کردو، غەیری ئەوەش نە مەنتیقیی بوو، نە واقیعیی و کردەییش دەبوو، بەڵام بەداخەوە لە ئەنجامی گۆڕانی شێوازی دانانی حوکمڕانانی مسوڵمان، لەڕاوێژەوە بۆ میراتیی و ڕەچەڵەکیی و، گەلێك جۆرە لادانی دیکەش، کە لێرەدا دەرفەتی باسکردنیان نیە، سەرەنجام لەجیاتی ئەوەی مسوڵمانان "لەڕووی نەهێشتنی کۆیلایەتییەوە" خەڵکی دیکەی وڵاتان بخەنە ژێر کاریگەریی خۆیانەوەو، ئەوان یەکجارەکیی بڕیاری نەهێشتنی ئەو دیاردە قێزەونە بدەن، کە بەر لە هەر شتێك لەگەڵ بناغەی ئایینەکەیاندا "کە خوا بەیەکگرتن (توحيد الله)ە" تێك دەگیرێ، پاشان لەگەڵ ئەو ڕێزوحورمەتەدا دژ دەوەستێ کە خوا لە مرۆڤی ناوە: ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ ﴿٧٠﴾ ﴾الإسراء، بەداخەوە ئەوان کەوتنە ژێر کاریگەریی و هەژموونی کلتوورو فەرهەنگی ڕزیوو دواکەوتووانەی گەلانی دیکەو، لەوڵاتانی ئیسلامییشدا وەك وڵاتانی دیکە، بازاڕی کۆیلەوکەنیزەکان تادەهات گەرم و قەڵەباڵغ دەبوو!

هەتا سەرەنجام لەکۆنگرەی (ڤیەننا) لەساڵی (١٨١٥)زدا، دەوڵەتە ئەورووپاییەکان بڕیاری قەدەغەکردنی بازرگانیی کردن بە کۆیلانیانداو، دوایین ڕێککەوتنیش لەوبارەوە بریتیی بوو لە ڕێککەوتننامەی (جنيڤ) کە لەڕۆژی: (١٩٥٦/٩/٧)دا، بەیەکجارەکیی بازرگانیی کردن بەکۆیلەوەی قەدەغەکرد[1]

---

١)بڕوانە: تأريخ الفقه الإسلامي، محمد سلام مدكور، ص٤٢.

شایانی باسیشە کە دەوڵـەتی عوسمـانییش ئەوکاتـە "واتـە: سـاڵی: ١٨١٥"دا، پشتگیریی بڕیاری نەهێشتنی بازرگانییکردن بە کۆیلەوەی کردو، خۆشـحاڵیی خـۆی دەربڕی بەو هەنگاوە[1].



١) بڕوانه: آثار الحرب، د. وهبة الزُّحيلي، ص٤١١، ٤١٢ .

## بڕگەی چوارەم: ئایا لەم ڕۆژگارەدا دروستە مرۆڤ بکرێتە کۆیلە؟!

لەوەڵامدا دەڵێین: نەخێر، چونکە:

١/ وەك پێشتریش گوتمان: ئیسلام وەك واقیعێکی سەپێنراوی ڕەتکراوە (واقع مفروض) مامەڵەی لەگەڵ دیاردەی کۆیلایەتییدا کردووەو، سەرجەم سەرچاوەکانی لێوەهاتنی کۆیلەی وشكو چۆڕەبڕ کردوەو، تەنیا ڕێی دیلەکانی جەنگی هێشتۆتەوە بەناچاریی و، لەسەر بنەمای مامەڵەی هاوشێوە (المعاملة بالمِثْل) دیلەکانی جەنگی "ئەویش بەشێوەیەکی کاتیی" بەکۆیلە گرتوە، چونکە نەدەگونجا سوپای ئیسلام دیلەکانی لەلایەن بەرانبەرەکانیەوە بکرێنە کۆیلەو، ئەوانیش دیلەکانیان بە بەلاش یان قەرەبوو (مَنّاً أو فِداءً) بەربدەن‌و، سەرەنجام ئەوە دەبوو بە جەنگێکی دەروونیی سەخت کە ئیسلام دژ بە سوپایەکەی خۆی دەیکردو، هاندانێکیش دەبوو بۆ ناحەزەکانی لەدژی، کە ئەگەر نەکوژرێن، سەرەنجام ئازاد دەکرێن‌و، دووبارە لەدژی تێهەڵدەچنەوە !

بۆیە عەقڵ‌و مەنتیق‌و واقیع‌و بەرژەوەندیی، خوازیاری ئەوەبوون، کە ئیسلام ئەو ڕێیە بەشێوەیەکی کاتیی بهێڵێتەوە.

٢/ هیچ ئایەتێکی قورئان‌و دەقێکی سوننەت نیە کە فەرمان بکات بەکۆیلەکردنی هیچ مرۆڤێك، بەڵام چەندان ئایەت‌و دەقی سوننەت هەن، کە فەرمان دەکەن بەئازادکردنی کۆیلە، بۆیە زۆر ڕاستە ئەگەر بگوترێ: ئیسلام ئازادکردنی کۆیلانی هێنا، نەك بەکۆیلەکردنی مرۆڤەکان (جَاءَ الإِسْلَامَ بالعِتْقِ وَلَمْ يَأت بالرق).

یەکێك لەو شوێنانەش کە باسی ئازادکردنی کۆیلان دەکات ئەمەیە: ﴿ فَلَا ٱقۡتَحَمَ ٱلۡعَقَبَةَ ﴿١١﴾ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلۡعَقَبَةُ ﴿١٢﴾ فَكُّ رَقَبَةٍ ﴿١٣﴾ ﴾البلد.

واتە: ئەو کەسە دەرووی سەختی نەبڕیوەو، تۆ چووزانی دەرووی سەخت چییە؟ ئازادکردنی کۆیلەیەکە.

کەواتە: ئازادکردنی مرۆڤێك لەداوای کۆیلایەتیی، کارێکی هێندە گەورەو گرنگ بووە لەڕوانگەی قورئانەوە، وەك بڕینی دەروویەکی سەخت وابووە!

٣/ پێشتر باسمان کرد کە ئیسلام هەموو سەرچاوەکانی کۆیلایەتیی وشك کردنو، هەموو ڕێیەکانی گرتن بێجگە لە یەك ڕێ، ئەویش بریتی بوو لە دیلەکانی جەنگ (أسرى الحرب) ئەویش بەشێوەیەکی کاتییو بەناچارییو، وەك کاردانەوە (رد فعل)و مامەڵەی هاوشێوە (المعاملة بالمثل).

ئنجا ئێمە تەنیا یەك ئایەتمان لە قورئاندا هەیە، لەبارەی چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ دیلەکانی جەنگدا، کە دواحوکمی ئیسلامی تێدایە لەوبارەوە، ئەویش ئەوەیە کە خوا "عز وجل" فەرموویەتی:﴿ فَإِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَضَرۡبَ ٱلرِّقَابِ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَثۡخَنتُمُوهُمۡ فَشُدُّواْ ٱلۡوَثَاقَ فَإِمَّا مَنَّۢا بَعۡدُ وَإِمَّا فِدَآءً حَتَّىٰ تَضَعَ ٱلۡحَرۡبُ أَوۡزَارَهَا ﴿٤﴾ ﴾محمد.

واتە: ئنجا هەرکات بەرەنگاری ئەوانەی بێبڕوان بوونەوە، ئەوە لە گەردنیان بدەن (چونکە چەکی ئەوکاتە زیاتر شمشێر بووەو، بەلەگەردن دانی بابای شەڕکەریش بە شمشێر، زووتر دەکوژرێ) هەتا کاتێك کە شپرزەتان کردن، کەلەپچەیان توند بکەنو بەدیلیان بگرن، پاشانیش یان بەخۆڕاییو چاکە لەگەڵدا کردن، یان بەقەرەبوو و بەرانبەر (دیل بە دیل یان بەپارە) بەریان بدەن، هەتا جەنگ قورساییەکانی خۆی دادەنێ (کۆتایی دێ).

وەك دەبینین خوای كاربەجێ فەرمان بەبڕوادارن دەكات كە لەكاتی بەرەنگاربوونەوەی دوژمنانی بێبڕوای شەڕفرۆشدا، زەبر لەو شوێنەیان بدەن كە زووتر پێی دەكوژرێن‌و، پاش لەپەلو پۆ خستنیان، ئنجا بەدیلیان بگرن.

دوایيش بۆ شێوازی مامەڵەكردن لەگەڵ دیلەكاندا "بۆ چۆنیەتی بەردانیان" تەنیا دوو ڕێیان دادەنێ كە سێیەمیان نیە: ﴿ فَإِمَّا مَنًّۢا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَآءً ﴾ (٤) محمد، یانی: پاشان یان منەتباریان بكەن‌و بەبێ بەرانبەر بەریان بدەن، یان بەبەرانبەرو قەرەبوو.

ئنجا دیارە قەرەبوو (فداء)ەكە دەگونجێ دیل بەدیل بێ‌و، دەشگونجێ ماڵ‌و سامان بێ‌و، دەشگونجێ "مادام بابای دیل پارەی نەبێ" هەر جۆرە خزمەتێك بێ كە پێشكەشی دەكات، وەك چۆن پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّم) بۆ ئەو دیلانەی جەنگی بەدر، كە ماڵ‌و سامانیان نەبوو، لەبەرانبەر ئەوەدا بەریدان، كە منداڵەكانی پشتیوانان فێری نووسین بكەن، وەك لەم شوێنەوار (أثر)ەدا هاتوە:

**(عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: كَانَ نَاسٌ مِنَ الأَسْرَى يَوْمَ بَدْرٍ، لَمْ يَكُنْ لَهُمْ فِدَاءٌ فَجَعَلَ رَسُولُ اللهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّم) فِدَاءَهُمْ أَنْ يُعَلِّمُوا أَوْلادَ الأَنْصَارِ الْكِتَابَةَ)**[1]

شایانی باسیشە هەندێك لە زانایان وا لەڕستەی: (فَشُدُّوا الوَثَاق) حاڵی بوون كە مانای بە كۆیلەكردن (إسترقاق) بگەیەنێ! بەڵام بێگومان ئەوە ڕاست نیە، چونكە كەلەپچەكردن (شدّ الوثاق) تەنیا بەدیل گرتن دەگەیەنێ‌و، هیچ پەیوەندیی بە بەكۆیلەكردن (إسترقاق و إستعباد)ەوە نیە!

بگرە ئەم ئایەتە بە ئاماژە پێمان دەڵێ: كە بەكۆیلەكردن دروست نیە، چونكە مادام خوا دەفەرموێ: پاش {بەدیل گرتنیان}، یان بە چاكەو منەت كردن بەریان

١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٢١٦)، تعليق شعيب الأرنؤوط: حَسَنٌ.

بدەن، یان بەبەرانبەر، کەواتە: هیچ شتێکی دیکەی سێیەم، وەك: کوشتن، یان بەکۆیلەکردن دروست نیە.

٤/ یەکێك بۆی هەیە بپرسێ:

مادام قورئان بۆ دیلەکانی جەنگ، تەنیا باسی بەردانیانی کردوە، چ بە بەلاش‌و چاکە، چ بە بەرانبەرو قەرەبوو، ئەدی بۆچی لە سوننەت‌و سیرەی پێغەمبەری خوادا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) بەکۆیلەکردن (إسترقاق) هەبووە؟!

لەوەڵامدا دەڵێین:

**یەك:** لەو جەنگانەدا کە پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) دژی نامسوڵمانانی شەڕفرۆش‌و پەیمان شکێن، لە بتپەرست‌و خاوەن کتێبەکان، کردوونی، هیچ پیاوێك (نێرینەیەکی باڵغ)ی نەکردۆتە کۆیلە، بەڵکو تەنیا ئافرەتان‌و منداڵەکانی بەکۆیلەکردوون، وەك (إبن القيم) گوتوویەتی: (**إِنَّ النَّبِيَّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) لم يَسْتَرِقَّ في حَيَاتِه ذكراً بالِغَاً قَطُّ، وَإِنَّمَا استرقَّ النِّسَاءَ وَالصِّبيان**).[1]

دیارە بەنسبەت ئافرەت‌و منداڵانیشەوە، بەکۆیلەگرتنیان، بریتی بووە لە حەواندنەوەیان‌و خستنیانەگەڵ خێزانە مسوڵمانەکان، پاش نەمانی پیاوەکانیان‌و، تێکچوونی شیرازەی خێزانەکانیان، کە بێگومان لەو رۆژگارەدا هیچ بەدیلێك بۆ ئەو چارەسەرە ناچارییە نەبووە.

**دوو:** هەر کەسێکیش لە نامسوڵمانە شەڕفرۆشەکان، دوایی مسوڵمان بووبێ، ئافرەت‌و منداڵەکانیان بۆ ئازادکراون، وەك پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ

---

١) زاد المعاد في هَدْي خير العباد، ج٣، ص١١٥.

وَسَلَّمَ) شەش هەزار (٦٠٠٠) لە ژن و منداڵە بەدیل گیراوەکانی هۆزی (هوازن)ی دانەوە پیاوەکانیان، پاش ئەوەی مسوڵمان بوون[1].

هەروەها هەرکام لە خەڵکی مەککە کە پێی فەرموون: بڕۆن بەردراون (**إذهبوا فأنتم الطلقاء**) رواه البيهقي: (١١٨/٩) ، هەروەها خەڵکی (خَيْبَر)یشی بە چاکە (مَنّ) بەردا، وە هۆزی (بنو المصطلق)یش دوای ئەوەی پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) (جويرية بنت الحارث)ی لێ بەهاوسەرگرتن، مسوڵمانان وەك رێزلێنان لەو خزمایەتییە، ژن و منداڵەکانیان بەردان، کە سەد خێزان بوون[2].

**سێ**: وەك پێشتریش باسمان کرد: ئەو هەڵوێستەش لەلایەن پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) و پاشان چوار خەلیفە راشیدەکانییەوە، هەڵوێستێکی ناچاریی بووە، کە بارودۆخی سیاسیی ئەوکاتەی دەوڵەتانی دنیا فەرزی کردوە، مامەڵەیەکی کاتیی (معاملة مؤقتة) بووە، لەگەڵ ئەو نەریتە جیهانییە نەخوازراوەدا، بەنسبەت ئیسلام و مسوڵمانانەوە، کە وەك پێشتریش گوتمان: ئەو نەریتی مرۆڤ بەکۆیلەکردنە، پێچەوانە ودژی دوو بنەرەتی هەرە گەورەی ئیسلامە، کە بریتین لە:

١- تەنیا خواپەرستن (توحيد الله في العبادة): ﴿ فَٱعۡلَمۡ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ ﴿١٩﴾ ﴾محمد، واتە: بزانە کە جگە لە خوا هیچ پەرستراوێك نیە (شایستەی پەرستران بێ).

---

١) صحيح البخاري رقم: (٢٨٥١)، ومسلم برقم: (١٧٤٤).
٢)أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُد برقم: (٣٩٣١).

٢- ڕێز وحورمەتی مرۆڤ گرتن (تكريم الإنسان): ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ ﴿٧٠﴾﴾الإسراء، واتە: بێگومان ڕێزمان لە وەچەی ئادەم گرتوە.

چونكە تەنیا خواپەرستن‌و بەس خوا بەپەرستراو (معبود) دانان، خوازیاری ئەوەیە كە مرۆڤەكان لەبەرانبەر خوادا یەكسان بن‌و، سەیدوكۆیلەیان لەنێودا نەبن !

هەروەها ڕێزو حورمەتی مرۆڤ گرتنیش، خوازیاری ئەوەیە كە هەموویان ئازادو سەربەست بن‌و، هیچ كەس ژێردەست‌و كۆیلەی كەس نەبێ.

٥/ ئنجا مادام:

**یەك:** ئیسلام چ وەك بوونناسیی (ontology)، چ وەك ئیمان‌و عەقیدەو، چ وەك شەریعەت، دژی كۆیلایەتیی‌و زەبوونیی مرۆڤ بۆ مرۆڤ بێ.

**دوو:** هیچ ئایەتێكی قورئان‌و دەقێكی سوننەتیش نەبێ، كە فەرمان بە مسوڵمانان بكات، دیلەكانی جەنگ لە كافران بكەنە كۆیلە.

**سێ:** ئەوەش كە لە سیرەی پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) و چوار خەلیفە ڕاشیدەكانیشیدا هاتوە، ئەوپەڕی دروست‌و ڕەوا بوون (جواز وإباحة)ی بەكۆیلەكردن بگەیەنێ، وەك كاردانەوەو مامەڵەی هاوشێوە (رد الفعل والمعاملة بالمثل) بۆ دوژمنانێك، كە ئەوكاتە هەر بەو شێوەیە مامەڵەیان لەگەڵ دیلەكانی جەنگدا دەكرد.

**چوار:** هەروەها مادام ئیسلام ئایینی عەقڵی سەلیم‌و فیترەتی ساغە، وەك خوا "سبحانه وتعالى" فەرموویەتی: ﴿فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًاۚ فِطْرَتَ

ٱللَّهِ ٱلَّتِي فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيۡهَاۚ لَا تَبۡدِيلَ لِخَلۡقِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٣٠﴾ الروم.

کە وەك دەبینین خوای زاناو شارەزا ئایینو بەرنامە پاكو ڕاستەكەی خۆی (ئیسلام)و، سروشتی ساغی مرۆڤی بە دوو ڕووی ڕاستییەك داناون، ئنجا هەر كام لە: عەقڵی سەلیمو فیترەتی ساغیش، نكوولیی لە بەكۆیلەكردنی مرۆڤەكان دەكەن.

**پێنج:** ئنجا مادام یەكەمینجار ئیسلام لەسەر زمانی خەلیفەی دووەمی پێغەمبەری خوا عومەری كوڕی خەتتاب "خوا لێی ڕازی بێ" ئەو ڕاستییەی وەبیر مرۆڤایەتیی هێنایەوە، كە مرۆڤەكان بە ئازادیی لەدایك بوونو، هیچكەس بۆی نیە بیانكاتە كۆیلەو ژێردەستو بیانچەوسێنێتەوە، وەك عومەر بە والی میصر (عمرو بن العاص)و كوڕەكەی گوت، لەكاتێكدا كوڕەكەی والی میصر بە قامچی لە كابرایەكی قیبتیی دابوو، چونكە ئەسپەكەی پێش ئەسپی وی كەوتۆتەوە، لە غارغارێنو پێشبڕكەدا:

(مذ كم تَعَبَّدتُم النَّاس، وَقَدْ وَلَدتهُم أُمَّهَاتُهُم أَحْرَاراً؟!)[1]

واتە: لەكەیەوە خەڵكتان كردۆتە كۆیلە، لە حاڵێكدا كە دایكیان بە ئازادیی هێناویاننە دنیاوە؟!

**شەش:** هەروەها مادام زانایانی ئیسلام لەسەر ئەوە یەكدەنگن، كە لە كوێو چۆن باشتر دادگەریی (عَدْل) بچەسپێو، بەرژەوەندیی (مصلحة) بێتەدی، شەریعەت لەوێیەو، هەر هۆكارو ئامرازێكو شێوازێك چەسپاندنی

١)بڕوانە: كنز العمال، ج١٢، ص٨٧٣.

دادگەریی‌و هێنانەدی بەرژەوەندیی، پەکی لەسەری بکەوێ، ئەوە پێویست دەبێ، بەپێی بنچینەی: (مَا لا يَتِمُّ الْوَاجِبُ إلاَّ بِهِ فَهُوَ وَاجِبٌ)، واتە: هەرشتێك فەرزێك پەکی لەسەری بکەوێ، فەرزە، هەروەها بنچینەی: (للوسائل حكم المقاصد)، واتە: ئامرازەکان حوکمی ئامانجەکانیان هەیە.

(إبن القيِّم)یش لەوبارەوە "کە دادگەریی‌و بەرژەوەندیی لەکوێ بێ شەریعەت لەوێیە" نووسیویەتی: (فَإن ظَهَرَت أمارَاتُ العَدْلِ وَأسفر وَجهَهُ بأيِّ طَرِيقٍ كَانَ، فَثَمَّ شَرْعُ الله وَدِينُهُ)[1].

واتە: هەرکات نیشانەکانی دادگەریی دەرکەوتن‌و، بەهەر شێوەیەك بێ ڕووی دەرەوشایەوە، ئەوە شەرع‌و بەرنامەی خوا لەوێیە.

ئنجا بێگومان دادگەریی‌و بەرژەوەندیی گشتییش "بۆ مرۆڤایەتیی" لەوەدایە کە هیچکەس نەك هەر نەکرێتە کۆیلە، بگرە بەهیچ شێوەیەك ستەمی لێ نەکرێ‌و نەچەوسێنرێتەوەو، بەپێچەوانەوە: چەوساندنەوەو کۆیلایەتیی، گەورەترین ستەمەو، گەورەترین زیانبارییە بۆ مرۆڤایەتیی.

**حەوت:** دیسان مادام ئێمە چەندان ئایەتمان لە قورئانی بەپێزدا هەن، کە فەرمان بەرزگارکردن‌و ئازادکردنی کۆیلان دەکەن، بۆ وێنە:

١- ﴿ وَءَاتَى ٱلْمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ ذَوِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَـٰمَىٰ وَٱلْمَسَـٰكِينَ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ وَٱلسَّآئِلِينَ وَفِى ٱلرِّقَابِ ﴿١٧٧﴾ ﴾البقرة.

٢- ﴿ وَمَن قَتَلَ مُؤْمِنًا خَطَـًٔا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ وَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦٓ ﴿٩٢﴾ ﴾النساء،

١) الطرق الحكمية في السياسة الشرعية، ص٢٣.

٣- ﴿ وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ ٱلْأَيْمَٰنَ ۖ فَكَفَّٰرَتُهُۥٓ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَٰكِينَ مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ أَوْ كِسْوَتُهُمْ أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ ﴿٨٩﴾ ﴾المائدة.

٤- ﴿إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ لِلْفُقَرَآءِ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَٱلْعَٰمِلِينَ عَلَيْهَا وَٱلْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِى ٱلرِّقَابِ ﴿٦٠﴾ ﴾التوبة.

٥- ﴿ وَٱلَّذِينَ يَبْتَغُونَ ٱلْكِتَٰبَ مِمَّا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ فَكَاتِبُوهُمْ إِنْ عَلِمْتُمْ فِيهِمْ خَيْرًا ۖ وَءَاتُوهُم مِّن مَّالِ ٱللَّهِ ٱلَّذِىٓ ءَاتَىٰكُمْ ﴿٣٣﴾ ﴾النور.

٦- ﴿ وَٱلَّذِينَ يُظَٰهِرُونَ مِن نِّسَآئِهِمْ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُوا۟ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مِّن قَبْلِ أَن يَتَمَآسَّا ۚ ﴿٣﴾ ﴾المجادلة.

٧- ﴿ فَلَا ٱقْتَحَمَ ٱلْعَقَبَةَ ﴿١١﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا ٱلْعَقَبَةُ ﴿١٢﴾ فَكُّ رَقَبَةٍ ﴿١٣﴾ ﴾البلد.

کەواتە: ئیسلام زۆر مەبەستی بووە کە دیاردەی کۆیلایەتیی نەمێنێو، ئەو کۆیلانەی ئەو ڕۆژگارەش "ڕۆژگاری دابەزینیی قورئان" هەبوون، لەداوی کۆیلایەتیی قوتاریان بێو ئازاد بن.

**هەشت**: هەروەها مادام خوا ستایشی خۆی کردوە لەسەر نەهێشتنی ستەمکاران، وەك لە سووڕەتی (الأنعام)دا فەرموویەتی:﴿ فَقُطِعَ دَابِرُ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ ۚ وَٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٥﴾ ﴾.

واتە: ئیدی کۆمەڵی ستەمکاران دوا بڕابوونو، ستایش بۆ خوای پەروەردگاری جیهانەکان.

کە بەدڵنیاییەوە خەڵكو میللەتان کردنە کۆیلەو ژێردەستیش، گەورەترین ستەمە.

**نـۆ:** هەروەها مادام خوای دادگەر سەرزەنشتی مسوڵمانان دەکات، کە لەتوانایان دایە چەوساوان ڕزگار بکەن، کەچی کەمتەرخەمیی دەکەن، لە جەنگو جیهادکردندا بۆ قوتارکردنیان: وەك خوای کاربەجێو دادگەر فەرموویەتی: ﴿وَمَا لَكُمْ لَا تُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلْمُسْتَضْعَفِينَ ۝٧٥﴾ النساء، کە بێگومان کۆیلەبوونی مرۆڤیش، خراپترین جۆری چەوسێنرانەوەیەتی.

**دە:** دیسان مادام فیرعەون "کە نموونەی حوکمڕانی ملهوڕ وخۆسەپێنو لەخوا یاخییە" گەلی مووسا (بنو إسرائیل)ی کردبووە کۆیلەو دەیچەوساندنەوە، وەك مووسا "علیه السلام" لە وەڵامی ئەو قسەیەیدا کە لەماڵی ویدا گەورەکراوە، پێی فەرمووە: ﴿وَتِلْكَ نِعْمَةٌ تَمُنُّهَا عَلَيَّ أَنْ عَبَّدتَّ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ۝٢٢﴾ الشعراء.

واتە: ئەو چاکەیەش کە دەیکەیە منەت لەسەرم، بەهۆی ئەوەوە بوو کە بەنی ئیسرائیلت کردبووە کۆیلەو ژێردەست. {یانی: ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە کە دایکم مەترسیی کوژرانی منی بووە لەلایەن تۆوە (کە نێرینەکانی بەنی ئیسرائیلت سەردەبڕین) من نەدەخرامە تابووتەوەو بەئاودا نەدەدرامو، لەلایەن ئێوەوە نەدەگیرامەوەو، سەرەنجام لە ماڵی تۆدا بەخێو نەدەکرام!}.

کەواتە: بەکۆیلەکردنی خەڵك عادەتی فیرعەونەکانەو، دەربازکردنیشیان لە کۆیلایەتیو ژێردەستەیی عادەتی پێغەمبەران "علیهم السلام" بووە،

چونکە مووسا "عليه السلام" بە فیرعەونی فەرموووە: ﴿ فَأْتِيَاهُ فَقُولَا إِنَّا رَسُولَا رَبِّكَ فَأَرْسِلْ مَعَنَا بَنِي إِسْرَائِيلَ وَلَا تُعَذِّبْهُمْ قَدْ جِئْنَاكَ بِآيَةٍ مِنْ رَبِّكَ وَالسَّلَامُ عَلَى مَنِ اتَّبَعَ الْهُدَى ﴿٤٧﴾ ﴾طه.

واتە: هەردووكتان بچنە لای (فیرعەون) پێی بڵێن: ئێمە نێرراوانی پەروەردگارتین، دەجا بەنی ئیسرائیلمان لەگەڵ بنێرەو مەیانچەوسێنەوە، بە دڵنیایی لە پەروەردگارتانەوە نیشانەو بەڵگەمان بۆ هێناوی‌و سەلامیش لەو کەسە بێ کە شوێن ڕێنمایی (خوا) دەکەوێ.

پاشان خوا دەربازکردنی بەنی ئیسرائیل لە کۆیلایەتیی‌و ژێردەستەیی فیرعەون، بە چاکەیەکی گەورەو، نیعمەتێکی بەرچاوی خۆی دادەنێ، وەك فەرموویەتی: ﴿ وَنُرِيدُ أَنْ نَمُنَّ عَلَى الَّذِينَ اسْتُضْعِفُوا فِي الْأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ الْوَارِثِينَ ﴿٥﴾ وَنُمَكِّنَ لَهُمْ فِي الْأَرْضِ ﴿٦﴾ ﴾القصص. واتە: دەشمانەوێ چاکە لەگەڵ ئەوانە بکەین کە لەزەویدا چەوسێنراونەوەو بیانکەینە پێشەوا بیانگێڕین بە میراتگر، هەروەها لەزەویدا دەسترۆیشتوویان بکەین.

**یازدە:** دیسان مادام بەشەر سەرەنجام پاش دوازدە سێزدە سەدە، دوای دابەزینی قورئان‌و بانگی ئازادیی‌و یەکسانیی مرۆڤەکانی بەگوێی دنیادا دانی، گەیشتە ئەو ئاستەی کە ئەوەی قورئان لە یەکەمین ڕۆژەوە ویستی بیکات، کە نەهێشتنی کۆیلایەتییە، بڕیاری لەسەر بدات‌و لەسەری ڕێك بکەوێ: لەبەر هەموو ئەوانە: بەهیچ جۆرێك ڕەوا نیە بەناوی ئیسلام‌و شەریعەتەکەیەوە، هیچ مرۆڤێك بکرێتە کۆیلەو، ئەوەی ڕێکخراوی (داعش) بەرانبەر بە ئافرەتە یەزیدییەکانی کرد، کارێکی ستەم‌و ناڕەوا

بووو، هیچ بنەمایەکی شەرعیی نیە، بە هەر بیانوو و پاساوێکەوە کرابێ و، ئیسلام لێی بەرییەو ماڵی قەڵبەو سەر بەخاوەنیەتی.

ئنجا شایانی باسە کە هەم خودی بە کۆیلەکردنی ئافرەتە یەزیدییەکان، شتێکی قەدەغەیەو گوناهێکی گەورەیەو، هەم فرۆشتنیشیان قەدەغەیەو ستەمەو، هەم چوونە لاشیان بەناوی کەنیزەك، بە دەستدرێژیی و زینا دادەنرێ، واتە: سێ گوناهو تاوانی گەورە گەورەو، لەهەمووشیان گەورەتر ئەنجامدانی ئەو گوناهو تاوانەیە، بەناوی ئیسلام و جێبەجێکردنی شەریعەتەوە!

ئنجا لە بارەی گەورەیی تاوانی بەکۆیلەکردن و فرۆشتنی مرۆڤی ئازاد (حُرّ)ەوە، نا مسوڵمان بێ، یان مسوڵمان، با سەرنجی ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّم) بدەین: (عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللَّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّم): قَالَ اَللهُ: ثَلاثَةٌ أَنَا خَصْمُهُمْ يَوْمَ اَلْقِيَامَةِ: رَجُلٌ أَعْطَى بِي ثُمَّ غَدَرَ، وَرَجُلٌ بَاعَ حُرًّا، فَأَكَلَ ثَمَنَهُ، وَرَجُلٌ اِسْتَأْجَرَ أَجِيرًا ، فَاسْتَوْفَى مِنْهُ، وَلَمْ يُعْطِهِ أَجْرَهُ)[1].

واتە: خوا فەرموویەتی: سێ کەس خۆم لەسەریان دەبمە داواکار (مُدَّعي) لەرۆژی قیامەتدا: {هەرکەسێکیش من داواکار (مُدَّعي) بم لەسەری، لێی دەبەمەوە} پیاوێك بەناوی منەوە پەیمان بدات و دوایی بیشکێنێ و، پیاوێك مرۆڤێکی ئازاد بفرۆشێ و پارەکەی بخوات و، پیاوێك کرێکارێك بەکرێ بگرێ و ئیشەکەی خۆی پێ تەواو بکات و، کرێیەکەی نەداتێ.

کەواتە: فرۆشتنی ئافرەتە ئازادە یەزیدییەکان، لەلایەن داعشەوە، تاوانێکە کە لەرۆژی دواییدا، دووچاری لێپرسینەوەو سزای سەختی خوایان دەکات.

---

١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٨٦٧٧)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٢١٥٠).

لەکۆتایی ئەم باسەشدا بەپێویستی دەزانم وەڵامی دوو پرسیاران بدەینەوە:

## وەڵامی دوو پرسیار:

**پرسیاری یەکەم:** مادام لەڕۆژگاری پێغەمبەری خوا (صَلّی اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) و چوار خەلیفە ڕاشیدەکانیدا بەشێوەیەك لەشێوەکان بەکۆیلەکردن ڕەوا بووبێ، چۆن دەڵێی لەم ڕۆژگارەدا ڕەوا نیە، ئایا هیچ دەقێك ئەو حوکمەی نەسخ کردۆتەوە؟!

**وەڵام:** پێشتر باسمان کرد کە مامەڵەی پێغەمبەری خوا (صَلّی اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ)و خەلیفە ڕاشیدەکانی لەگەڵ ئەو مەسەلەیەدا، لەژێر فشاری واقیعی سیاسەتی نێودەوڵەتیی ئەوسادا بووەو، مامەڵەیەکی کاتییو ناچارییو کاردانەوەو مامەڵەی هاوشێوە (المعاملة بالمثل) بووە، نەك حوکمێکی گشتی شەریعەت، تاکو گۆڕانی بەسەردانەیەت.

دیارە حوکمەکانی شەریعەتیش لەڕووی چەسپانوگۆڕان (الثبات والتغيّر)ەوە، دوو جۆرن:

**جۆری یەکەم:** حوکمی گشتییو چەسپاوو گۆڕان هەڵناگرن وەك: فەرزبوونی نوێژو زەکاتو، قەدەغەبوونی شەرابو سوود.

**جۆری دووەم:** حوکمی تایبەتییوکاتیینو گۆڕانیان بەسەردا دێ، وەك: حوکمەکانی بواری سیاسییو ئیدارییو تەمبێ کردن (تعزير).

هەر بۆیەش مامەڵەی هەندێك لە چوار خەلیفەکان لەگەڵ هەندێك بابەتدا، لە هی ڕۆژگاری پێغەمبەری خوا (صَلّی اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) جیا بووە، بۆ وێنە: پێغەمبەری خوا (صَلّی اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) سەرزەمینی خەیبەری دابەشکرد، بەڵام عومەر "خوا لێی

ڕازی بێ" (خەلیفەی دووەم) سەرزەمینی عیراق (سواد العراق)ی دابەش نەکرد، ئنجا (إبن قدامة) لەوبارەوە گوتوویەتی: (..لأنَّ النَّبِيَّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فَعَل مَا هُوَ الأَصْلَح فِي زَمَنِه، وَعُمَر فَعَل مَا هُوَ الأَصْلَح فِي زَمَنِه)[1]

واتە: چونکە پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) ئەوەی کردوە، کە بۆ ڕۆژگاری خۆی باشتربووەو، عومەریش ئەوەی کردوە، کە بۆ ڕۆژگاری وی باشتربووە.

هەروەها (إبن القيِّم) لەوبارەوە نووسیویەتی:

(الأَحْكَام نَوْعَان: نَوْع لايتغيّر عَن حَالَةٍ وَاحِدَة هُوَ عَلَيْهَا، لا بحَسَب الأزمنة ولا الأَمْكنَة ولا اجتهَاد الأئِمَة، كَوجُوب الوَاجبَات، وَتَحْرِيم المحَرَّمَات، والحدود المقدّرة بالشرع على الجرائم ونحو ذلك...وَالنَّوع الثاني: مايتغيّر بحَسَب اقتضاءِ المصلَحَة لَه زَمَانَاً وَمَكَانَاً وَحَالاً، كمقَادِير التعزيرات وأجناسها وصفاتها، فإنَّ الشارع يُنوِّعُ فيها بحسب المصلحة...)[2].

واتە: حوکمە شەرعییەکان دوو جۆرن: جۆرێکیان هەر لەسەر یەك حاڵەتن‌وگۆڕانیان بەسەردا نایەت، نە بەهۆی کاتەکانەوەو، نە بەهۆی شوێنەکانەوەو، نە بەهۆی کۆشش‌و ڕای پێشەوایانەوە، وەك: پێویست بوونی ئەرکەکان‌و، قەدەغەبوونی قەدەغەکان‌و، ئەو سزایانەی کە بە شەرع بۆ تاوانەکان دانراون‌و، وێنەی ئەوانە...

جۆری دووەمیان ئەوانەن کە بەگوێرەی خوازیاریی بەرژەوەندیی بۆیان، بەپێی کات‌و شوێن‌و حاڵ، دەگۆڕێن، وەك ئەندازەکانی سزادانەکان {کە حوکمڕانان بە کۆششی خۆیان وەك تەمبێ کردن (تعزير) دایان دەنێن}و جۆرەکانیان‌و سیفەتەکانیان، چونکە شەرعدانەر بەپێی بەرژەوەندیی جۆراوجۆریان دەکات...

---

١) بڕوانە: المغني لابن قدامة، ج٤، ص١٨٩، هەروەها: فقه الجهاد، د. يوسف القرضاوي، ج٢، ص٩٨٦.

٢) إغاثة اللّهْفان من مصائد الشيطان، ج١، ص٣٤٦.

هەروەها (القَرَّافِي) لەوبارەوە مەسەلەیەکی زۆر گرنگ دەخاتەڕوو، کە دەڵێ:

(...أن إجراءَ الأَحْكَام الَّتِي مُدْرَكُهَا العَوَائِدُ، مَعَ تَغيُّر تِلْكَ العَوَائِد: خِلاف الإجْمَاع وَجَهَالَة فِي الدِّين، بَلْ كُلّ مَا فِي الشريعة يَتْبَعُ العوائِدَ: يَتَغَيَّرُ الحكمُ فيه عند تغيُّر العادة إلى ماتقتضيه العادة المُتَجدِّدة... وَكَذَلِكَ الإِطْلاَق فِي الوَصَايَا وَالأَيْمان، وَجَمِيع أَبْوَاب الفِقْه المحْمُولَة عَلَى العوائد، إِذَا تغيَّرت العادةُ، تغيَّرت الأحكام في تلك الأبواب...)[1].

واتە: ...کە (وەك خۆیان) ئەنجامدانی ئەو حوکمانەی پەیوەستن بە عادەتو نەریتەکانەوە، وێڕای گۆڕانی ئەو عادەتو نەریتانە: پێچەوانەی کۆڕایەو نەزانییە لە ئاییندا، بەڵکو هەرچی لە شەریعەتدا پەیوەست بێ بە عورفو عادەتەکانەوە، حوکمەکەی بەپێی گۆڕانی عورفو عادەتەکە دەگۆڕێ، بۆئەوە کە عورفو باوە تازەکە دەیخوازێ...هەروەها ئەوەی کە بەڕەهایی دەگوترێ لەبواری وەصیەتەکانو سوێندەکانو، تێکڕای بابەتە فیقهییەکانی کە پەیوەستن بە عورفو باوەکانەوە، هەرکات عورفو باوەکە گۆڕا، ئەو حوکمانەش کە لەو بوارانەدان، دەگۆڕێن.

کەواتە: لەم ڕۆژگارەماندا کە عورفو باوو عادەتی سیاسییو نێودەوڵەتیی دنیا، لەبواری مامەڵە لەگەڵ دیلەکانی جەنگدا بەتایبەتییو، بابەتی بەکۆیلەکردنی مرۆڤدا، بەگشتی گۆڕاوەو، وەك پێشتر گوتمان لەساڵی (١٩٥٦)دا لەکۆنگرەی (جنێڤ) بڕیاری کۆتایی نێودەوڵەتیی لەبارەی نەهێشتنی بازرگانییکردن بە کۆیلانەوە درا، کەواتە: ئێستا نەك هەر هیچ واقیعێکی ناچارکەر نیە، کە وا لە مسوڵمانانو قەوارە سیاسییەکانیان بکات، لەکاتێکدا کە ئایینو شەریعەتەکەیان دژی بەکۆیلەکردنی مرۆڤە، لەسەر بناغەی مامەڵەی هاوشێوە (المعاملة بالمثل)و بەناچاریی بچنە نێو بازاڕی بەکۆیلەکردنەوە، بەڵکو بەپێچەوانەوە: واقیعێکی

---

١) الإحكام في تمييز الفتاوى عن الأحكام وتصرُّفات القاضي والإمام، ص٢١٨، ٢١٩.

دیکەی هاندەر بۆ ئازادیی مرۆڤەکانو، نەهێشتنی کۆیلەیی هەیە، واتە: ئەو عورفو باوە خراپەی کاتی خۆی مسوڵمانانی ناچارکردوە، دیلەکانی دوژمنانی جەنگیان بەکۆیلە بکەن، ئێستا گۆڕاوە، کەواتە: وەك (القَرَّافِي) گوتوویەتی: کۆڕا (إجماع) و تێگەیشتن لە ئایین (فهم الدين) خوازیاری ئەوەنو، مسوڵمانان پابەند (مُلْزَم) دەکەن، کە ئەو هەڵوێستو حوکمە شەرعییەی کاتی خۆی بارودۆخو واقیعێکی ناشەرعییو نەگونجاو ناچاری کردوون، تەبەننیی بکەن، ئێستا بیگۆڕن بە هەڵوێستوحوکمێکی دیکەی شەرعیی گونجاو لەگەڵ شەریعەتو، لەگەڵ واقیعی ئێستاو عورفو باوی ئێستای دنیاداو، هیچ پێویستی بە هەبوونی لابەر (ناسخ)ێك ناکات بۆ حوکمە پێشووەکە، چونکە حوکمە پێشووەکە حوکمێکی چەسپاو و نەگۆڕی شەریعەت نەبووە، بەڵکو بڕیارو هەڵوێستێکی ناچارییو کاتیی بووە، بەرانبەر بە واقیعێکی ناشەرعیی نەخوازراو و، بەگۆڕانو لاچوونی واقیعو هەلو مەرجە ناچارکەرو نەخوازراوەکە، یەکسەر ئەو بڕیارو هەڵوێستەش، پاساوی نەماوەو، کۆتایی پێ هاتوە، وەك هەر هەڵوێستو بڕیارێکی دیکەی هەڵقوڵاوی عادەتو هەلو مەرجی کۆمەڵگا.

**پرسیاری دووەم:** ئایا لەم ڕۆژگارەدا، لەسەر بناغەی مامەڵەی هاوشێوە (المعاملة بالمثل) ئەگەر ئەهلی کوفر دیلەکانی مسوڵمانانیان بەکۆیلەکردن، دروستە مسوڵمانانیش دیلەکانی وان بەکۆیلە بکەن؟!

**لەوەڵامدا دەڵێین:**

هەرچەندە ئیسلام بە سروشت، وەك بوونناسییەکەی و، وەك ئیمان و عەقیدەکەی و، وەك شەریعەتەکەی، دژی کۆیلایەتییە، بەڵام وەك چۆن لەڕۆژگاری پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) و چوار خەلیفە ڕاشیدەکانیدا، وەك کاردانەوەو مامەڵەی هاوشێوەو بەناچاریی، ئەو بڕیارە نەخوازراوە، دراو، ئەو هەڵوێستە ناچارییە، تەبەنیی کرا، ئێستاش بەهەمان شێوە دەگونجێ ئەو بڕیارە بدرێ و، ئەو هەڵوێستە بگیرێتەبەر، چونکە خوا "سبحانه وتعالى" فەرموویەتی:﴿ فَمَنِ ٱعۡتَدَىٰ عَلَيۡكُمۡ فَٱعۡتَدُواْ عَلَيۡهِ بِمِثۡلِ مَا ٱعۡتَدَىٰ عَلَيۡكُمۡ ﴿١٩٤﴾ ﴾البقرة.

واتە: ئنجا هەر کەسێك دەستدرێژیی کردنەسەر، ئەوە وەك ئەو دەستدرێژییەی کردوویەتە سەرتان، دەستدرێژیی بکەنەوەسەر...

بەڵام بێگومان ئەوە لەحاڵێکدایە کە مسوڵمانان بەرژەوەندیی لەو کاردانەوەو مامەڵەی هاوشێوەیەدا ببینن،دەنا ئەگەر پێیان وابوو زیانی لە قازانجی زیاترە، ئەوە بێگومان دروست نیەو، مەرجیش نیە هەرچی بێبڕواییان لەخۆیان وەشاندەوە، مسوڵمانانیش لەخۆیانی بوەشێننەوەو، بەشایستەی خۆیانی بزانن.

# دەستپێک

بەڕێزان!

پاش ئەوەی (ڕێکخراوی دەوڵەتی ئیسلامیی) ناسراو بە (داعش) لە (٢٠١٤/٦/١٠)دا لەهێرشو پەلامارێکی کتو پڕو کورتخایەندا، شاری (موصل)و دەڤەرێکی فراوانی لەناوچە عەرەبی سوننە نشینەکانی خستە ژێر ڕکێفی خۆی، وێڕای کۆمەڵێك هەڵسوکەوتو ڕەفتاری ناشەرعیی، کە ئێستاش بەردەوامن[1]، وەك ناچارکردنی خەڵك لەسەر کۆمەڵێك هەڵسوکەوتی تایبەتیو لەنێوانیاندا پۆشینی جلو بەرگێکی تایبەتیو، کوشتنو بەدیل گرتنی ژمارەیەکی زۆر لە (یەزیدییەکان)و، بە کەنیزەكو کۆیلە کردنی ئافرەتەکانیانو، ناچارکردنی زۆربەی هەرەزۆری نەصرانییەکان کە مادام سەرانە نەدەن" لەسەر ئەوە کە: ماڵو حاڵی خۆیان بەجێ بهێڵنو، ئاوارەو دەربەدەر ببن!

ئنجا ئایا ئەوەی (داعش) کردی، ڕاستە -وەك ئیددیعا دەکەن- بڕیاری شەریعەتەو، دەبێ قەوارەیەکی سیاسیی ئیسلامیی بەوجۆرە مامەڵە لەگەڵ نامسوڵمانانێکدا بکات، کە بەجەنگ یان بەبێ جەنگ دەکەونە ژێر ڕکێفی؟! یان ئەو ڕەفتارو هەڵوێستانەی (داعش) لادانن لەشەریعەتو، ماڵی قەڵب سەر بەخاوەنیانن؟!

---

١) واتە: هەتا کاتی نووسینی ئەم زنجیرە باسە لە چاپی یەکەمیاندا، بەڵام (الحمدلله) ئێستا: {٢٠١٨/٩/٢٥ز – ١٥محرم ١٤٤٠ك} هەوری ڕەشی داعش لە ئاسمانی ئەو ناوچانەی داگیری کردبوون، تاڕادەیەکی زۆر ڕەویوەتەوەو لاچووە.

ئێمە لەم ئاڵقەیەدا هەوڵی وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە دەدەین، لەپێنج بڕگەدا کە ئەمانە ناوونیشانەکانیانن:

- **بناغەی مامەڵەی قەوارەیەکی ئیسلامیی لەگەڵ هاووڵاتییانی نامسوڵمانی بێ زەڕدا: چاکەکاریی‌و هاوکارییە.**
- **هۆکاری جەنگ کردن لەدژی نامسوڵمانان، دەستدرێژییانە نەك کوفریان.**
- **حوکمی قورئان دەربارەی دیلەکانی جەنگ لەنامسوڵمانانی شەڕفرۆش، نەبەکۆیلەکردنە نەکوشتن، بەڵکو بەردرانیانە بە بەلاش یان بەقەرەبوو.**
- **ناچارکردنی نامسوڵمانانی هاووڵاتیی، لەم ڕۆژگارەدا کە یان سەرانە (جزیە) بدەن، یان نیشتیمانیان بەجێ بهێڵن، تاوان‌و ستەمەو، ماڵ‌و سامانیشیان حەڕامە دەستکاریی بکرێ.**
- **قەوارەی سیاسیی لەئیسلامدا، دەبێ مایەی بەختەوەریی سەرجەم کۆمەڵگابێ‌و ڕەحمەت بێ بۆیان، نەك بەڵاو گرفتاریی‌و زەحمەت!**

## بڕگەی یەکەم: بناغەی مامەڵەی قەوارەیەکی ئیسلامیی لەگەڵ هاووڵاتییانی نامسوڵمانی بێ زەڕدا: چاکەکاریی و هاوکارییە:

وەك پێشتریش باسی ئەم مەسەلەیەمان کرد، خوای کاربەجێ فەرموویەتی: ﴿لَا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓا۟ إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٨﴾﴾ الممتحنة.

واتە: ئەوانەی لەسەر ئایینتان لەدژتان ناجەنگن و لەماڵەکانتان وەدەریان نەناون، خوا لێتان قەدەغە ناکات، کە چاکەیان لەگەڵ بکەن و هاوکارییان بکەن، بێگومان خوا هاوکاریکارانی خۆشدەوێن.

بەڵێ بناغەی مامەڵەکردنی دەوڵەت و کۆمەڵگایەکی ئیسلامیی لەگەڵ هاووڵاتییانی نامسوڵمانیدا، ئەوەیە کە لەگەڵیان چاکەکارو هاوکاربێ، چاکەکاریی لەڕووی مەعنەوییەوەو، هاوکاریی و بەخشین لەڕووی مادديیەوە، بەڵام بەمەرجێك ئەو نامسوڵمانانە، هاووڵاتییەکی باش و بێ زیان بن و، لەڕووی دین و ژینەوە، بەرانبەر بە مسوڵمانان و کۆمەڵگاو قەوارەکەیان، سەلامەت و بێ زەڕبن.

**کەواتە**: هەر قەوارەییەکی سیاسیی ئیسلامیی لەسەر جگە لەو بناغەیە، مامەڵە لەگەڵ هاووڵاتییانی نامسوڵمانیدا بکات و، هەر جۆرە دەستدرێژییەکیان لەهەر ڕوویێکەوە بکاتە سەری، ئەوە بەئەندازەی دەستدرێژیی و ستەمەکەی، لە ئیسلام لایداوەو، لێی دوور کەوتۆتەوەو، بەیداغ و ڕیش و شیعاریش شەفاعەتی بۆ ناکەن، چونکە ناوی بێ نێوەڕۆك و، شیعاری بێ کردارو، ڕیشی بێ ئیش، هیچ ئیعتیبارێکیان نیە.

## بڕگەی دووەم: هۆکاری جەنگ کردن لەدژی نامسوڵمانان، دەستدرێژییانە نەك کوفریان:

دیارە ئێمە پێشتریش -لە ئاڵقەی دووەمدا- باسی ئەو مەسەلەیەمان کردو، لێرەش هەر بەکورتیی دەڵێین:

**یەك:** فەرمایشتی خوا کە دەفەرموێ: ﴿ وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمۡ وَلَا تَعۡتَدُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ﴿١٩٠﴾ ﴾البقرة.

واتە: لەڕێی خوادا لەدژی ئەوانە بجەنگن کە لەدژتان دەجەنگن‌و، دەستدرێژیی مەکەن، بەدڵنیایی خوا دەستدرێژکارانی خۆشناوێت.

**دوو:** هەروەها فەرمایشتی خوا "عز وجل" کە فەرموویەتی:﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ يَصِلُونَ إِلَىٰ قَوۡمِۭ بَيۡنَكُمۡ وَبَيۡنَهُم مِّيثَٰقٌ أَوۡ جَآءُوكُمۡ حَصِرَتۡ صُدُورُهُمۡ أَن يُقَٰتِلُوكُمۡ أَوۡ يُقَٰتِلُواْ قَوۡمَهُمۡۚ وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَسَلَّطَهُمۡ عَلَيۡكُمۡ فَلَقَٰتَلُوكُمۡۚ فَإِنِ ٱعۡتَزَلُوكُمۡ فَلَمۡ يُقَٰتِلُوكُمۡ وَأَلۡقَوۡاْ إِلَيۡكُمُ ٱلسَّلَمَ فَمَا جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمۡ عَلَيۡهِمۡ سَبِيلٗا ﴿٩٠﴾ ﴾النساء.

واتە: (بۆتان هەیە لەگەڵ کافرانی جەنگ لەدژکەرتاندا بجەنگن) جگە لەکەسانێك کەسەر بە کۆمەڵێکن کە لەنێوان ئێوەو ئەواندا پەیمانێك هەیە، یان هاتوونە لاتان سینەیان تەنگ‌و سەغڵەتە کە لەدژی ئێوە بجەنگن، یان لەدژی کۆمەڵەکەیان‌و، ئەگەر خوا ویستبای بەسەر ئێوەیدا باڵادەست دەکردن‌و لەدژتان دەجەنگین، ئنجا هەرکات ئەوان خۆیان لێ پاراستن‌و لەدژتان نەجەنگین‌و، پەیامی ئاشتییان بۆ ناردن، ئەوە خوا ڕێتان نادات لەدژیان بجەنگن.

**سێ**: هەروەها فەرمایشتی خوا "تبارك و تعالى": ﴿ وَإِن جَنَحُواْ لِلسَّلۡمِ فَٱجۡنَحۡ لَهَا وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿٦١﴾ ﴾الأنفال.

واتە: هەرکات (نامسوڵمانانی شەڕفرۆش) لای ئاشتییان گرت، تۆش لای ئاشتی بگرەو، پشتیش بەخوا ببەستە، بێگومان ئەو بیسەری زانایە.

بەڵێ ئەو سێ فەرمایشتەی خوای بەرزو مەزن، هەرکامیان دەقە لەسەر ئەوە کە قەوارەی ئیسلامیی بۆی نیە، جگە لە کافرانی شەڕفرۆش‌و سەنگەرگرتوو لەدژی ئیسلام‌و مسوڵمانان، دژی هیچ کافرێکی دیکە بجەنگێ.

شایانی باسیشە کە ئەو ڕایە ڕای زۆربەو جەماوەری زانایانە کە (أَبُو حَنِيفَة ومالك وأحمد)یان لەنێودانو، ڕای بەرانبەریشی هی (شافعي)یە، (ابْنُ تَيْمِيَة)ش لەبارەی ئەو مەسەلەیەوە نامیلکەیەکی نووسیوە بەناوونیشانی: (قاعدة في قتال الكفار: هل سببه المقاتلة أوالكفر؟)، کە سەرجەم لەونامیلکەیەدا هەشت (٨) بەڵگەی هێناونەوە بۆ ئیسپاتی ڕاستیی ئەو ڕایە، کە جگەلە کافرانی شەڕفرۆش، دروست نیە جەنگ دژی هیچ کافرێکی دیکە بکرێ، منیش پوختیان دەکەمەوەو نێوەڕۆکەکەیان بە شێوازی خۆم دادەڕێژمەوە:

١- ﴿ وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمۡ وَلَا تَعۡتَدُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ﴿١٩٠﴾ ﴾البقرة.

وەك دەبینین حوکمەکە بەوەوە پەیوەست کراوە، کە ئەوان جەنگمان لەدژ دەکەن کەواتە: هۆکاری جەنگ لەدژکرانیان (عِلّة القتال)، جەنگ کردنیانە لەدژمان.

٢-لە (سنن)دا هاتوە: کە پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) لەیەکێك لە جەنگەکاندا بەلای ژنێکی کوژراودا ڕەت بوو، فەرمووی: (**مَاكَانَت هَذِهِ**

لِتُقَاتِلَ)[1] واتە: ئەمە جەنگی نەکردوە! (بۆچی کوژراوە؟) کەواتە: هۆکاری کوشتن جەنگ کردنە.

٣-خوا فەرموویەتی: ﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِ ﴾البقرة.

واتە: ناچارکردن لەوەرگرتنی ئاییندا ڕەوانیە.

ئنجا ئەگەر بابای کافر لەسەر ئەوە کوژرابایە کە مسوڵمان ببێ، ئەوە مەزنترین جۆری ناچارکردن لەسەر ئایین دەهاتەدی.

٤- خوا فەرموویەتی:﴿ فَإِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَضَرۡبَ ٱلرِّقَابِ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَثۡخَنتُمُوهُمۡ فَشُدُّواْ ٱلۡوَثَاقَ فَإِمَّا مَنَّۢا بَعۡدُ وَإِمَّا فِدَآءً ﴾محمد.

واتە: هەرکات بەرەنگاری کافران بوونەوە، لەگەردن دان پیشەتان بێ، هەتا کاتێك کە لە پەلو پۆتان خستن، ئەوجار بەدیلیان بگرن، پاشان یان بەچاکە، یان بەقەرەبوو، بەریان بدەن.

ئنجا دیارە ئەگەر تەنیا کوفر پاساوی کوشتنیان بووایە، نەدەبوو بەربدرێن!

٥-هەر کۆمەڵێك لەکافران ئامادەیی ئاشتی دەربڕیبێ، پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) جەنگی لەگەڵ نەکردوەو، هەرگیز دەستپێشخەری نەکردوە بۆ جەنگ، ئنجا ئەگەر تەنیا کوفر هۆکاری جەنگو جیهاد بووایە، هەڵوێستەکەی بەجۆرێکی دیکەدەبوو.

٦-ئەگەر تەنیا کوفری کافران ڕەواکەر (مُبیح)ی کوشتنیان بووایە، پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) (سعد بن معاذ)ی بەرەزامەندیی هۆزی (بنو قریظة)ش نەدەکردە دادوەر (حَكَمْ) داخۆ چییان لێ بکات؟ چونکە

---

١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٦٠٣٥)، وَأَبُو دَاوُد برقم: (٢٦٦٩)، وَالنَّسَائِي فِي "الكبرى" برقم: (٨٦٢٥)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢٨٤٢)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٤٧٨٩)، وَالحَاكِمُ برقم: (٢٥٦٥) وَقَالَ: صَحِيح عَلَى شَرْطِ الشَّيْخَين.

ئەگەر (سعد) بڕیاری بەخشینیشی بۆ دابان، هەرجیَبەجیَ دەکرا، ئنجا ئەگەر تەنیا کوفر پاساوی کوشتنیان بووایە، هەر لەسەرەتاوە دەیکوشتن.

٧-ئەگەر کوفری نامسوڵمانان -بەتەنیا- ڕەواکەر (مُبیح)ی کوشتنیان بووایە، نەدەگونجا هیچ جۆرە کافرێك سەرانە (جزیة)ی لێوەربگیرێ.

٨-بناغە لەکوشتنی مرۆڤەکاندا: قەدەغەبوونە، با نامسوڵمانیش بن‌و، خوا تەنیا ئەوەندە ڕێی بەکوشتنی مرۆڤانداوە، کە پێویست بێ بۆ چاکبوونی خەڵك‌و کۆمەڵگا، هەربۆیەش کوشتنی کافرێك کە زیانی بۆ مسوڵمانان نیە، بەبێ هۆکارێکی پێویستکەر، خراپەکاریی (فساد)یەکە، کە خواو پێغەمبەرەکەی حەزی لێ ناکەن.

**پاشان (ابن تیمیة) لەکۆتاییدا دەڵێ:**

(إنَّ الأَصْلَ هُوَ إِبقَاءُ الكُفَّار وَتَقرِيرهم، لأَنَّ الله تعالى مَا أَرَادَ إِفْنَاءَ الخَلْقِ ولا خَلَقَهُم لِيُقْتَلوا وَإِنَّما أُبِيح قَتلُهم لِعَارِضٍ ضررٍ وجِدَ مِنْهُم، إلاَّ أَن ذَلِكَ لَيْسَ جَزَاءً لَهُمْ عَلَى كُفْرِهم، فَإِن دَارَ الدُّنيا لَيْسَت دَار جُزَاء بَلْ الجَزَاء فِي الآخِرَة)[1].

واتە: بناغە بریتیە لە هێشتنەوەی کافران‌و لێگەڕانیان، چونکە خوای بەرز نەیویستوە خەڵك بفەوتێنێ‌و، بۆئەوە دروستی نەکردوون کە بکوژرێن‌و، تەنیا لەبەر زیانگەیاندنیان کوژرانیان ڕەواکراوە (لەجەنگدا)، بەڵام ئەوە سزادانیان نیە لەسەر کوفرەکەیان، چونکە مەنزڵگای دنیا مەنزڵگای سزاو پاداشت نیە، بەڵکو سزاو پاداشت لەدوا ڕۆژدایە.

کەواتە: هەڵکوتانە سەرو هێرش‌و پەلاماری (داعش) بۆسەر یەزیدییەکان‌و، کوشتن‌و گرتن‌و بەکۆیلەکردنییان‌و، پاشان سەرپشك کردنی نەصرانییەکان لەنێوان

---

١) قاعدة مختصرة في قتال الكفار ومهادنتهم، ص ٨٧ ومابعدها.

سەرانە (جزية)دانو دەربەدەركراندا، بەبیانووی ئەوەی كە نامسوڵمانن، بێ ئەوەی ژیانی ئایینو ژیانیان بۆ مسوڵمانان بووبێ، ڕەفتارێكی ناشەرعییەو، پێچەوانەی قورئانو سوننەتی پێغەمبەری خوایە (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ).

**بڕگەی سێیەم: حوکمی قورئان دەربارەی دیلەکانی جەنگ لە نامسوڵمانانی شەڕفرۆش، نە بەکۆیلەکردنە، نەکوشتن، بەڵکو بەچاکە مامەڵە لەگەڵ کردنیانو، پاشان بەردانیانە بەچاکە، یان بەقەرەبوو:**

وەك پێشتر باسمان کرد، نامسوڵمانانێکی بێلایەن (محايد) یان لاشەڕو ئاشتییخواز، بەهیچ جۆرێك دروست نیە مسوڵمانان ئازاریان بدەنو، شەڕیان پێ بفرۆشنو، گێچەڵیان پێ بکەن.

بەڵام نامسوڵمانانێك کە دەستدرێژیی دەکەنە سەر مسوڵمانانو شەڕیان پێ دەفرۆشنو گێچەڵیان پێدەکەن، ئاشکرایە مسوڵمانان بۆیان هەیە بەرپەرچیان بدەنەوە، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿فَمَنِ ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ فَٱعْتَدُوا۟ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ ﴿١٩٤﴾﴾البقرة.

هەڵبەتە لەجەنگیشدا بەزۆریی وایە کە کوژراویش دەبنو دیلیش دەبن، ئنجا ئایا ئیسلام چ ڕێو شوێنێکی داناوە، بۆچۆنیەتی مامەڵەکردنی مسوڵمانان لەگەڵ دیلەکانی کافراندا؟

## شێوازی مامەڵەکردن لەگەڵ دیلدا:

لەو پێنج خاڵەی خوارێدا، وەڵامی ئەو پرسیارە دەدەینەوە:

## یەك: بەچاکە مامەڵەکردن لەگەڵ دیلدا:

١) خوای بەبەزەیی فەرموویەتی: ﴿ وَيُطْعِمُونَ ٱلطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ مِسْكِينًا وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا ﴿٨﴾ إِنَّمَا نُطْعِمُكُمْ لِوَجْهِ ٱللَّهِ لَا نُرِيدُ مِنكُمْ جَزَآءً وَلَا شُكُورًا ﴿٩﴾ ﴾الإنسان.

واتە: (بەندە باشەکانی خوا) خواردنێك کە حەزیان لێیەتی، دەیبەخشن بەنەدارو هەتیوو دیل (لەدڵی خۆیاندا پێیان دەڵێن:) بێگومان بەس لەبەر ڕەزامەندیی خوا خواردنتان دەدەینێ و، نەچاکەدانەوەو نەسوپاسگوزارییمان لێتان ناوێ.

پێغەمبەری خواش (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فەرموویەتی: (**استَوصوا بالأُسَارَى خَيْراً**)[1]. واتە: لەگەڵ دیلان دا باش بن.

دیارە زانایانیش هەموویان لەسەر ئەوە یەکدەنگن، کە پێویستە لەڕووی خواردنو خواردنەوەو بەرگو پۆشاكو جێگاو ڕێگاو، هەر پێداویستییەکی دیکەوە، مامەڵەی باش لەگەڵ دیلاندا بکرێو، ڕێزیان لێ بگیرێو ئەزیەت نەدرێن، وەك (أبو يوسف) گوتوویەتی: (والأسيرِ من أسرى المشركين، لابُدَّ أن يُطْعَم ويُحْسَنَ إِلَيْهِ، حَتَّى يُحْكَمَ فِيهِ)[2].

واتە: هەرکام لەدیلەکانی هاوبەش دانەران (کافران) پێویستە خۆراکی پێ بدرێو، چاکەی لەگەڵ بکرێ، هەتا بڕیاری لەبارەوە دەدرێ.

١) أَخْرَجَهُ الطَّبَرَانِي في "الصغير" برقم: (٤٠٩)،

٢) بڕوانە: الخراج، ص ١٤٩.

## دوو: ئازادکردنی دیل بەچاکە لەگەڵ کردن، یان بەقەرەبوو:

وەك خوای کاربەجێ فەرموویەتی:﴿ فَإِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَضَرْبَ ٱلرِّقَابِ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَثْخَنتُمُوهُمْ فَشُدُّواْ ٱلْوَثَاقَ فَإِمَّا مَنًّۢا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَآءً حَتَّىٰ تَضَعَ ٱلْحَرْبُ أَوْزَارَهَا ﴿٤﴾ ﴾محمد.

کە پێشتریش مانامان کردوەو، خوای دادگەر، پاش فەرمانکردنی بە کەلەپچەکردنی کافرانی جەنگاوەرو، بەدیل گرتنیان: (فَشُدُّوا الْوَثَاقَ)، تەنها یەك ڕێگا دادەنێ بۆ چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ دیلەکاندا، ئەویش بریتیە لەئازادکردنو بەردانیان، چ بەهیممەت، چ بەقیمەت.

چونکە وشەی (مَنًّا) یان: چاکە لەگەڵ کردنو منەتبارکردنی بابای دیل، کە بەبەلاشو بێبەرانبەر بەربدرێو، هیچ شتێکی لەبەرانبەردا لێوەرنەگیرێ. وشەی: (فداءاً)یش یانی: بەقەرەبوو و بەرانبەر، جا ئەو قەرەبووە، چ:

أ/ دیل بەدیل بێ.

ب/ پارەو سامان بێ.

ج/ خزمەتێك بێ، کە بابای دیل پێشکەشی مسوڵمانانی بکات، وەك چۆن ئەو دیلانەی کافرەکان کە لەجەنگی بەدردا گیرابوونو پارەیان نەبوو، قەرەبووەکەیان ئەوەبوو کەیەکی ژمارەیەك لە منداڵانی مسوڵمانان فێری نووسین بکەن:

**(عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: كَانَ نَاسٌ مِنَ الأَسْرَى يَوْمَ بَدْرٍ لَمْ يَكُنْ لَهُمْ فِدَاءٌ، فَجَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِدَاءَهُمْ أَنْ يُعَلِّمُوا أَوْلادَ الأَنْصَارِ الْكِتَابَةَ)**[1]

---

١) رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (٢٢١٦)، تعليق شعيب الأرنؤوط: حَسَن.

شایانی باسیشە هەندێك لەزانایان گوتوویانە: ئەو ئایەتە – ئایەتی (٤)ی(محمد)- بەئایەتی ژمارە (٥)ی (التوبة) نەسخ کراوەتەوە، کە هەندێکیان بە ئایەتی شمشێر (أية السّيف) ناوزەدیان کردوەو، ئەمە سەرەتایەکەیەتی: ﴿ فَإِذَا ٱنسَلَخَ ٱلْأَشْهُرُ ٱلْحُرُمُ فَٱقْتُلُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ ﴿٥﴾ ﴾التوبة.

واتە: ئنجا هەرکات مانگە (جەنگ تێدا) قەدەغەکراوەکان بەسەرچوون، هاوبەشدانەرەکان لەهەرجێیەکی بەرپەلتان کەوتن بیانکوژن..

بەڵام بێگومان ئەو ڕایە هەڵەیە، چونکە ئایەتەکەی (التوبة) بەتایبەت لەبارەی عەرەبە هاوبەشدانەرەکانەوە، هاتۆتە خوار، کە پەیمانیان لەگەڵ مسوڵماناندا هەبوو، بەڵام هەر دەرفەتیان لێ هەڵکەوتبایە، زەبریان لە مسوڵمانان دەوەشاند، بۆیە بۆ ماوەی چوار مانگان مۆڵەت دران، کە بیرێك بکەنەوەو پاش ئەو چوار مانگە، مسوڵمانان دەستکراوە دەبن بەرانبەریان، نەك لەبەر بێ ئیمانییان، بەڵکو لەبەر بێ پەیمانییان! کەواتە: هیچ تێکگیرانێك لەنێوان ئەو دوو ئایەتەدا نیە، تاکو ناچاربین باسی نەسخ بکەین، بەڵکو ئایەتەکەی (التوبة) باسی جەنگو کوشتنەو، ئەوەی (محمد)یش باسی دوای جەنگو کوشتارو بەدیل گیرانی کافرانە!

هەروەها هەندێك لەزانایان پێیان وابووە کە لەنێوان ئایەتی (٤)ی (محمد)و ئایەتی (٦٧)ی (الأنفال)دا تێکگیران (تعارض)هەیە، بەڵام ئەوەش ڕاست نیە، چونکە ئایەتەکەی (الأنفال)، ئەمە سەرەتایەکەیەتی: ﴿ مَا كَانَ لِنَبِىٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِى ٱلْأَرْضِ ﴿٦٧﴾ ﴾الأنفال.

واتە: هیچ پێغەمبەرێك بۆی نیە دیلان بگرێ، هەتا دوژمن لەپەلو پۆ نەخات لەزەویدا.

مەبەست لەم ئایەتەش ئەوەیە کە نابێ دیل لەدوژمنی جەنگاوەر بگیرێن، هەتا دڕکیان نەشکێندرێو بێهێز نەکرێن، واتە: ئەم ئایەتە باسی حوکمی مامەڵە لەگەڵ

دیلان (حكم المعاملة مع الأسرى)دا ناكات، وەك ئایەتەكەی (محمد)، بەڵكو باسی حوكمی بەدیل گرتنی كافرانیی شەڕكەرو، كاتی بەدیل گرتنیان دەكات، كەواتە: هیچ جۆرە تێكگیرانێكیان لەنێواندا نیە، چونكە باسی دوو بابەتی جیاواز دەكەن:

یەكەم: كاتو حوكمی بەدیل گرتنی كافرانی شەڕكەر.

دووەم: چۆنیەتی مامەڵەكردن لەگەڵ دیلدا.

بەڵكو دەتوانین بڵێین:

لەنێوان ئەو دوو ئایەتەدا {"ئایەتی (٦٧)ی (الأنفال)و ئایەتی (٤)ی (محمد)} پەیوەندییەكی یەكدی تەواوكردن (علاقة تكاملية) هەیە، ئایەتی (٦٧)ی (الأنفال) دەفەرموێ: بۆتان نیە لەكاتی جەنگدا دیلان لەدوژمنان بگرن، بەتەماعی قەرەبوو لێوەرگرتنیان، لەحاڵێكدا كە جارێ دوژمنتان بێ دڕكو بێ دەستەڵات نەكردون: ﴿ مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِي ٱلْأَرْضِ ﴿٦٧﴾ ﴾الأنفال.

بەلام لەئایەتی: (٤) (محمد)دا دەفەرموێ:

هەركات بەرەنگاری دوژمنتان بوونەوەو، كوشتارتان لێیان كردو، لەپەلوپۆتان خستنو، بێ دەستەڵاتتان كردن، ئنجا بەدیلیان بگرنو، پاشانیش یان بە چاكە یان بەبەرانبەر بەریان بدەن: ﴿ فَإِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَضَرْبَ ٱلرِّقَابِ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَثْخَنتُمُوهُمْ فَشُدُّوا۟ ٱلْوَثَاقَ فَإِمَّا مَنًّۢا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَآءً ﴿٤﴾ ﴾محمد.

## سێ: ڕەوابوونی كوشتنی تاوانبارانی جەنگ (مجرمی الحرب):

دیارە هەر لەسەر ئەم بناغەیەش بووە، كە پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) چەند كەسێك لەكافرەكانی هەڵاواردوە لەبەخشینی گشتییو، سزای كوشتنی بۆ دەركردوون، هەروەها هەر لەسەر ئەم بناغەیەش بووە، كە جەنگاوەرەكانی هۆزی (بنوقریظە) پاش ڕازی بوونیان بەدادوەریی (سعدبن معاذ) بڕیاری كوژرانیان بۆ

دەرکرا، چونکە پەیمانیان شکاندبووو، لەپشتەوەڕا خەنجەری غەدریان لەمسوڵمانان دابوو، وەك (بخاري:٣٠٤٣) و (مسلم:١٧٦٨) هێناویانە.

## چوار: ڕاجیایی زانایان لەبارەی چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ دیلەکانی جەنگدا، بەلگەیە لەسەر نەبوونی حوکمێکی دیارییکراوی شەریعەت لەوبارەوە:

هەرچەندە زۆربەی زانایان ڕایان وابووە، کە پێشەواو حوکمڕانی مسوڵمانان بۆی هەیە یەکێك لەچوار بژاردە (خیار) دیاریی بکات، بۆ مامەڵە لەگەڵ دیلەکاندا، کە بریتین لە:

١- بەردان بەچاکەو بەهیممەت (المَنُّ).

٢- بەردان بەقەرەبوو (المفاداة).

٣- بەکۆیلەکردن (الإسترقاق).

٤- کوشتن (القتل).

بەڵام بێگومان ژمارەیەك لەزانایانیش بەبەڵگەی ئایەتی: **(فإما مَنّاً بعد وإمّا فِدآءاً)**، گوتوویانە: دروست نیە دیلی جەنگ: نەبکوژرێ نەبەکۆیلە بکرێ، بەڵکو دەبێ ئازاد بکرێ، چ بەهیممەت چ بەقیمەت، کەناوی هەرکام لە: (عبدالله بن عمر، عبدالله بن عباس، الحسن البصري، عطاء، الضحّاك، السُّدّي، سعيد بن جُبَير، إبن سيرين، الشّعْبي، عمر بن عبدالعزيز)، لەنێوانیاندا هەنو، هەمووشیان زاناو پێشەوای بەرجەستە بەرجەستەن.[1]

---

١) بڕوانە: "المصنَّف" لعبدالرزاق: ٩٣٩٢، هەروەها (المغني، لابن قدامة. ج١٣ ص ٤٦، ٤٧)، هەروەها (فقه الجهاد) للدكتور يوسف القرضاوي، ج٢ص٩٧٧. ٩٧٨.

ئنجا ئەوەی ئەو ڕاجیاییە یەکلایی دەکاتەوە، ئەوەیە کە ئایا کام لەو ڕایانە بەرژەوەندیی (مصلحة)ی تێدایەو، لەگەڵ باو (عرف)ی سیاسیی و نێودەوڵەتیی ئەم ڕۆژگارەدا دەگونجێ، یان گونجاوترە؟

چونکە وەك لە ئاڵقەی دووەمی ئەم زنجیرە باسەدا گوتمانو، لەهەرکام لە (ابن قيم الجوزية)و (القرافِي)یەوە نەقڵمان کرد: حوکمە شەرعییەکان بەگشتی دوو جۆرن:

أ/ جۆرێکیان گشتیی و چەسپاوو نەگۆڕنو، هەروەك خۆیان دەمێننەوە.

ب/ جۆرێکی دیکەشیان بەگوێرەی عادەتو نەریتو باوی کۆمەڵگایەکان، گۆڕانیان بەسەردا دێ.

ئنجا ئەوجۆرەی دووەمیان کە پەیوەستن بەکاتو شوێنو باوونەریتەکانەوە، هەرکات کاتوشوێنو باوونەریتەکان گۆڕان، دەبێ ئەوانیش بگۆڕێن، دیارە بەوبارەدا کە بەرژەوەندیی و دادگەریی باشتر دێتەدی.

هەڵبەتە لەم ڕۆژگارەشدا، لەڕێککەوتننامە نێودەوڵەتییەکان (الإتفاقيات الدولية)دا بەتایبەت ڕێککەوتننامەی (جنيف) کە لە: ١٢ی ئابی ١٩٤٩ز دا ئیمزاکراوە، هەموو جۆرە دەستدرێژیی کردنە سەر دیل، قەدەغەکراوە، هەر لەجنێوپێدانەوە بگرە هەتا کوشتن[1].

ئنجا هەرچەندە ئێستاش لەگەڵ بێ، ئەو ڕێککەوتننامەیە، وەك پێویست جێبەجێ نەکراوە، بەڵام:

١- لەسۆنگەی ئەوەوە کە ڕێز لەمرۆڤ گرتن، یەکێکە لەپایەو بنەماسەرەکییەکانی شەریعەت: ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ ﴿٧٠﴾﴾الإسراء.

ئنجا بەکوشتنو بەکۆیلەکردنو هەرجۆرە مامەڵەیەکی دیکە ناشایست، پێچەوانەی ڕێزو حورمەتی مرۆڤە.

---

١)بڕوانە: آثار الحرب ص٤٠٨.

٢- مەسەلەی مامەڵەکردن لەگەڵ دیلدا، لەبواری هەڵس و کەوتەکان (المعاملات)دایەو، لەو بوارەشدا بناغەی ڕەواییەو، سەنگی مەحەك و پێوەریش، هێنانەدی بەرژەوەندیی (تحقيق المصلحة)یە[1].

ئنجا بەرژەوەندییش لەوەدایە کە مرۆڤەکان دەستدرێژییان نەکرێتەسەرو، مسوڵمانانیش لەگەڵ هەر هەوڵ و هەنگاوێکدابن، کە خێروخۆشی مرۆڤایەتیی تێدابێ.

٣- لەقورئاندا تەنیا باسی بەردان و ئازادکردنی دیلان کراوە، چ بێ بەرانبەر،چ بە بەرانبەر **(فَإِمَّا مَنّاً بَعْدُ وإِمَّا فِدَآءً)**.

ئێستاش کەم و زۆر ئەگەر بەتیۆریی (نظري)یش بێ، عورف و باوی دنیا بەرەو ڕێزلێگرتنی دیلی جەنگ و، ئازار نەدانیان گۆڕاوە.

بۆیە دەبێ: ئەو شێوە مامەڵەیەش لەگەڵ دیلدا کە کاتی خۆی لەسەر ئەو عورف و باوە بنیات نراوە، بگۆڕرێ، تاکو بەتەعبیری (القرافي) شتێك نەکەین، کە پێچەوانەی کۆڕاو مایەی نەزانیی بەدین (خِلافُ الإجْمَاعِ وَجَهَالَةٌ فِي الدِّينِ) بێ!![2].

بەڵێ، بەڵام لەبەر ئەو هۆکارانەی گوتران، لەسەر مسوڵمانان پێویستە: نەك هەر پابەند، بگرە دەستپێشخەر (مُبادِر)ی هەر هەوڵ و هەنگاوێك بن، کە ئازادیی و ڕێزو ماف و بەختەوەریی زیاتر بۆ مرۆڤەکان دەستەبەریەکان.

---

١)بڕوانە: القواعد النورانية الفقهية، لابن تيمية، ص١١٢.

٢)بڕوانە: الإحكام، للقرافي ص ٢١٨.

## پێنج: لەحاڵێكدا كە دوژمنان دیلەكانی مسوڵمانان بكەنە كۆیلە، یان بكوژن، هەڵوێستی مسوڵمانان چی دەبێ؟!

وەك پێشتریش باسمان كرد، لەحاڵێكی وادا، وەك چۆن پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) وەك مامەڵەكردن لەگەڵ واقیعێكی سەپێنراوداو، وەك كاردانەوەو، مامەڵەی هاوشێوە (رد الفعل والمعاملة بالمثل) هەندێك مامەڵەی لەگەڵ كافرە شەڕكەرەكاندا دەكرد، كە لەحاڵەتی ئاسایی دا نەیدەكردن، ئێمەش لەحاڵێكی وادا، لەسەر بنەمای مامەڵەی هاوشێوە، بۆمان هەیە ئەوجۆرە مامەڵانە لەگەڵ دیلەكانی دوژمنانماندا بكەین، كە دەقێكی شەریعەت قەدەغەی نەكردبن، بەبەڵگەی: ﴿ فَمَنِ ٱعۡتَدَىٰ عَلَيۡكُمۡ فَٱعۡتَدُواْ عَلَيۡهِ بِمِثۡلِ مَا ٱعۡتَدَىٰ عَلَيۡكُمۡ ﴿١٩٤﴾ ﴾البقرة.

بەڵام بێگومان ئەویش بەمەرجی چەسپێنرانی بەرژەوەندیی (تحقيق المصلحة) ئەگەرنا، ئەگەر زیانو خراپەی زیاتربێ، دروست نیە.

**بڕگەی چوارەم: ناچارکردنی نامسوڵمانانی هاوڵاتیی لاشەڕ، لەم ڕۆژگارەدا کە: یان سەرانە (جزیە) بدەن، یان ماڵوحاڵیان بەجێ بهێڵن، تاوانو ستەمەو، ماڵو سامانیشیان حەڕامە دەستکاریی بکرێ:**

نامسوڵمانانێك کە کاتی خۆی بوونەتە هاووڵاتیی (مواطن)و ئەهلی مەنزڵگا (أهل الدار) لەدەوڵەتی ئیسلامییدا، لەڕۆژگاری خەلیفە ڕاشیدەکاندا "خوا لێیان ڕازی بێ"، چ خاوەن کتێبەکان (أهل الکتاب) کە جوولەکەو نەصڕانییەکانن بە مسۆگەرییو، بەڕای بەشێك لەزانایانیش (صائبة)ش دەگرێتەوەو، چ ئەوانەی کە خاوەنی کتێبێکی ئاسمانیی ڕوون نین، وەك (المجوس) کە پێغەمبەری خوا (صَلّی اللّهُ عَلَیْهِ وَسَلّمَ) فەرموویەتی: وەك خاوەن کتێبەکان مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن، بەڵام سەربڕاوەکانیان مەخۆنو ئافرەتەکانیشیان مارە مەکەنو بەهاوسەر مەگرن:

(عَنْ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ رضي الله عنه أَشْهَدُ لَسَمِعْتُ رَسُولَ اللّهِ (صَلّی اللّهُ عَلَیْهِ وَسَلّمَ) يَقُولُ: سُنُّوا بِهِمْ سُنَّةَ أَهْلِ الْكِتَابِ، غَيْرَ آكِلِي ذَبَائِحِهِمْ ولا نَاكِحِي نِسَائِهِمْ)[1]

بەڵێ نامسوڵمانانێکی ئاوا، مادام زیانی دینو ژینیان بەمسوڵمانان نەگەیاندبێو، لەدژیان نەجەنگابن، پێویستە هەر لەسەر بناغەی پەیمانو ئەمانی یەکەم (العهد و الأمان الأول) مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێ، چونکە خوای دادگەر لەبارەی بێبڕوایانێکی خاوەن پەیمان (أصحاب العهد)ەوە، فەرموویەتی:﴿ إِلَّا

---

١) أَخْرَجَهُ مَالِك «المُوَطأ» (٤٢) مُرْسَلاً،وَابْنُ أَبِي شَيْبَة في (المُصَنَّف): برقم: (١٠٧٦٥) و(٤٢٦٤٠)، وَالبَيْهَقِيّ فِي "السنن الكبرى": برقم: (١٩١٦٧).

﴿ٱلَّذِينَ عَـٰهَدتُّم مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ثُمَّ لَمۡ يَنقُصُوكُمۡ شَيۡـًٔا وَلَمۡ يُظَـٰهِرُواْ عَلَيۡكُمۡ أَحَدًا فَأَتِمُّوٓاْ إِلَيۡهِمۡ عَهۡدَهُمۡ إِلَىٰ مُدَّتِهِمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُتَّقِينَ ﴿٤﴾﴾التوبة.

واتە: بێجگە لەو هاوبەشدانەرانەی کە پەیمانتان لەگەڵ بەستوون، پاشان هیچ کەمو کورتییان لەبارەتانەوە نەبووەو، دژی ئێوە پشتگیریی کەسیان نەکردوە، ئەوانە پەیمانەکەیان هەتا کاتی دیارییکراویان، بەتەواویی لەگەڵ بەرنەسەر، بێگومان خوا پارێزکارانی خۆشدەوێن.

بەڵێ لەڕاستییدا: هەرجۆرە ستەمو دەستدرێژییەك، بۆسەر ئەو هاوولاتییە نامسوڵمانانە: خوێنیان، ناموسیان، سامانیان، هێمنییو ئاسایشیان، تاوانێکی زلەو سزای توندی خوای دادگەری لەسەرە، لەدنیاو دوارۆژدا.

ئەگەر گریمان چەند کەسێکیان، یان کۆمەڵێکیان، پەیمانیان شکاندو زیانیان بەمسوڵمانان گەیاند، ئەوە ئەو چەند کەسە، یان ئەو کۆمەڵە، تەنیا خۆیان بەرپرسیارنو دووچاری سزاو تۆڵەدەبنەوە، نەك هەموویان، چونکە:﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزۡرَ أُخۡرَىٰۚ ﴿١٨﴾﴾فاطر.

واتە: هیچ تاوانبارێك تاوانی یەکێکی دیکە هەڵناگرێ.

بۆ مەسەلەی سەرانە (جزية) وەرگرتنیش لە نەصرانییەکان، لەم ڕۆژگارەدا، دەڵێین:

**یەکەم**: قەوارە سیاسییەکەی (داعش) چونکە بەخۆسەپاندن دروست بووە، ڕەوایەتیی (شرعيِة) نیەو، مادام ڕەوایەتیشی نەبێ، بڕیارەکانیشی نا ڕەواو بێ ئیعتیبارن.

**دووەم**: ڕای ڕاستو بەڵگەدار {(وەك لەبەرگی چوارەمی مەوسوعەی: (ئیسلامو دەوڵەتداریی)دا هێناومە} ئەوەیە کە سەرانە ئەگەر وەریش بگیرێ، تەنیا لەوانە دەردەگیرێ، کە لەجەنگی دژی دەوڵەتی ئیسلامییدا دەشکێن، یان واز لەجەنگ

دێنن‌و، ئامادە دەبن ببنە هاووڵاتیی لە دەوڵەتی ئیسلامییدا، نەك لەهەر نامسوڵمانێك: وەربگیرێ! بە بەڵگەی ئەوە، كە سێ هۆزە جوولەكەكەی مەدینە: (بنو قینقاع و بنو النَّضیر و بنو قریظة) سەرانەیان لێ داوانەكراوە!

**سێیەم**: لەسەر ڕای زۆرێك لەزاناو شەرعزانانی هاوچەرخ "كە منیش ڕایەكەیانم پێ ڕاستە" لەم ڕۆژگارەدا، نامسوڵمانانی ژێر سایەی دەوڵەتەكانی جیهانی ئیسلامیی، هەركات بەشداریی سەربازییان كردو، وەك مسوڵمانان بەشدارییان كرد لە بەرگریی كردن لەوڵاتدا، ئەوە سەرانە (جزیة)یان لەسەر لادەچێ، چونكە سەرانە ڕەمزو هێمای هاووڵاتیی بوون‌و تەباییانە لەگەڵ دەوڵەتداو، بەسەربازیی كردنیشیان، ئەو ئامانجە دێتەدی‌و، كاتی خۆی لەدەوڵەتی ئیسلامییدا، ڕێككەوتنی لەوبابەتە چەند جارێك لەگەڵ نامسوڵمانانی ژێرسایەی دەوڵەتدا كراوە، بۆ وێنە:

١- (جماعة الجراجمة) كە نەصرانیی بوون، ڕێككەوتنێكی ئاوایان لەگەڵ نوێنەری (أبوعبیدة بن الجراح)دا كردوە.

٢- هەروەها (سوید بن مُقَرَّن) یەكێك لەفەرماندەكانی (عمر بن الخطّاب) ڕێككەوتنێكی وای لەگەڵ (مرزبان وأهل دهستان وسائر أهل جرجان)دا كردوە.

٣- هەروەها (عُتبة بن فرقد)یش لەگەڵ (أهل أذربیجان)دا هەمان ڕێككەوتنی كردوە، كە هەركات هاوكاریی سەربازیی مسوڵمانانیان كرد، سەرانە نەدەن[1].

---

١) بڕوانە: (فتوح البلدان)، للبلاذری، ص٢١٧، (تأریخ الطبري) ج٢ص٥٣٨، ٥٣٩، (فقه الجهاد) للدكتور یوسف القرضاوي، ج٢ص٨٥٠، ٨٥١.

کۆتایی ئەو مەسەلەیەش بەفەرموودەیەکی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دێنین، کە زۆر بەسامناکیی باسی هەرکام لەپەیمان شکێنیی و، فرۆشتنی مرۆڤی ئازاد وەك كۆیلەو، خواردنی مافی خەڵك دەكات :

**(عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): قَالَ اَللهُ: ثَلاثَةٌ أَنَا خَصْمُهُمْ يَوْمَ اَلْقِيَامَةِ: رَجُلٌ أَعْطَى بِي ثُمَّ غَدَرَ، وَرَجُلٌ بَاعَ حُرًّا، فَأَكَلَ ثَمَنَهُ، وَرَجُلٌ اِسْتَأْجَرَ أَجِيراً ، فَاسْتَوْفَى مِنْهُ، وَلَمْ يُعْطِهِ أَجْرَهُ)**[1].

واته: خوا فەرموویەتی: سێ کەس خۆم لەسەریان دەبمە داواکار (مُدَّعي) لە ڕۆژی قیامەتدا: {هەر کەسێکیش من داواکار (مُدَّعي) بم لەسەری، لێی دەبەمەوە} پیاوێك بە ناوی منەوە پەیمان بدات و دوایی بیشکێنێ و، پیاوێك مرۆڤێکی ئازاد بفرۆشێ و پارەکەی بخوات و، پیاوێك کرێکارێك بە کرێ بگرێ و ئیشەکەی خۆی پێ تەواو بکات و کرێیەکەی نەداتێ.

کەواتە: پەیمان شکاندن "وەك داعش کردی" بەدەستدرێژیی کردنە سەر هاوولاتییانی نامسوڵمان، چ خاوەن کتێب بن، وەك نەصرانییەکان، چ کتێبێکی ئاسمانیی سەلمێنراویان نەبێ، وەك یەزیدییەکان، هەروەها خەڵکی ئازاد (حُرّ) کردنە کۆیلەو کەنیزەك و فرۆشتنیان بەناوی دین و شەریعەتەوە، دوو تاوانی زلن و، خوای بەرزو مەزن بۆخۆی دەبێتە داواکار (مُدَّعي) لەسەر ئەنجامدەرانی ئەو جۆرە تاوانانە!

---

١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٨٦٧٧)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٢١٥٠).

## بڕگەی پێنجەم: قەوارەی سیاسیی لە ئیسلامدا، دەبێ مایەی بەختەوەریی سەرجەم کۆمەڵگاو ڕەحمەت بێ بۆیان، نەك بەڵاو گرفتاریی و زەحمەت:

بەڵێ بەڕێزان!

قەوارەیەکی سیاسیی کە بەناوی ئیسلامو مسوڵمانانەوە بنیات دەنرێ، دەبێ هەموو هەوڵو تەقەللای خۆی لەسەر ئەوە چڕبکاتەوە، کە هەرچی زیاترو باشتر هاووڵاتییانی ژێر سایەی، بەمسوڵمانو نامسوڵمانەوە، ئاسوودەو بەختەوەر بکاتو، کێشەو گیروگرفتەکانیان چارەسەر بکات، تاکو بەرجەستەکەری ناوونیشانی پێغەمبەرەکەیان (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ): ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٠٧﴾ ﴾الأنبياء، بنو، دەبێ دەوڵەتی ئیسلامیی بەشێوەیەك بێ، کە خەڵكو جەماوەری ژێر سایەی، هەمیشە بۆ سەلامەتییو بەردەوامیی، سەرگەرمی پاڕانەوەو نزابن، نەك بەپێچەوانەوە: خەڵكو جەماوەر لەپەنایدا ترسو بیمیان هەبێو، لەدڵەڕاوکێ دابنو، خوا خوایان بێ ڕۆژێك زووتر سێبەری شوومی لەسەریان لابچێ!!

پێغەمبەری خاتەم (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) لەوبارەوە فەرموویەتی: (**خِيَارُ أَئِمَّتِكُمْ: الَّذِينَ تُحِبُّونَهُمْ وَيُحِبُّونَكُمْ، وَتُصَلُّونَ عَلَيْهِمْ وَيُصَلُّونَ عَلَيْكُمْ، وَشِرَارُ أَئِمَّتِكُمْ: الَّذِينَ تُبْغِضُونَهُمْ وَيُبْغِضُونَكُمْ، وَتَلْعَنُونَهُمْ وَيَلْعَنُونَكُمْ..**)[1].

واتە: باشترین پێشەوا (حوکمڕان)ەکانتان، ئەوانەن: کە خۆشتان دەوێنو خۆشیان دەوێنو، نزایان بۆ دەکەنو نزاتان بۆ دەکەنو، خراپترین پێشەوا (حوکمڕان)ەکانتان،

١) أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (١٨٥٥).

ئەوانەن: کە ڕقتان لێیانە، ڕقیان لێتانەو، نەفرینیان لێدەکەنو، نەفرینتان لێ دەکەن..

هەڵبەتە ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەری خواش (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) باشترین تەرازوو و پێوەرە بۆ هەڵسەنگاندنو کێشانو پێوانی، هەر قەوارەیەکی سیاسیی بەناوی ئیسلامەوەبێ، یان بەناوی غەیری ئیسلامەوەو، (داعش) دروستی کردبێ، یان غەیری داعش.

ئنجا پێموایە بەگوێرەی ئەو پێوەرە ڕاستو دروستەی پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ)، قەوارە سیاسییەکەی (داعش)، ئیسلامو مسوڵمانان زۆری لەسەر قەرزدارنو، خۆیشیان زۆری لەسەر عەیبدارو گوناهبارن!



# ئاڵقەی چوارەم:
# بەرگریی کردنی هەر گەلێك لە کۆمەڵگاو نیشتیمانەکەی: ئەرکێکی شەرعییە

# دەستپێک

بەڕێزان!

یەکێك لە هەڵوێستو ڕەفتارە چەوتەکانی (داعش) بریتی بوو لە: پەلاماردانی هەرێمی کوردستان، لە حاڵێکدا کە هیچ گرفتو کێشەیەك لە نێواندا نەبووو، سەرەنجام شەڕو کوشتارێك لە نێواندا بەرپابوو "کە هەتا ئێستاش بەردەوامەو، ناشزانرێ کەی کۆتایی دێ[1]" هەڵبەتە ئەو شەڕەش بە گران تەواو بوو، هەم بۆ هەرێمی کوردستان، کە چاوەڕوانی شەڕێکی وای نەدەکردو، هەم بۆ ڕێکخراوی (داعش)یش!

ئنجا ئێمە لەم ئاڵقەیەدا بۆ بەرچاو ڕوونکردنەوەی هەموو لایەكو، لابردنی هەر تەمومژێك لەبەر چاوان، لەبارەی هەڵوێستی تەوژمی ئیسلامییەوە، دەربارەی حوکمی بەرگریی کردن لە وڵاتو نشتیمانو خەڵكو کۆمەڵگا، لە کاتێکدا کە پەلامار دەدرێنو دەستدرێژییان دەکرێتە سەر، لەبەر تیشکی ئایەتەکانی قورئانی بەپێزو فەرموودەکانی پێغەمبەری بەڕێز (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) داو، لە پێنج برگەدا، چەند ڕاستییەك دەخەینەڕوو، بەم ناوونیشانانەی خوارێ:

١/ بەرگریی لە خۆکردن، شتێکی خوارِسك (فطري)ە، لە هەموو ژیاندارێکدا.

٢/ خوا "سبحانه وتعالى" بەرپەرچدانەوەی ستەمکارانی، بە چاکەو بەخششی خۆی لەسەر جیهانییان داناوە.

---

١) واتە: کاتی نووسینی ئەم زنجیرە باسە، لە چاپی یەکەمیدا.

٣/ خوا ستایشی خۆی کردوە، لەسەر نەهێشتنو دوابڕینیی ستەمکاران.

٤/ خوا فەرمانی کردوە: لە دژی کەسانێك بجەنگین، کە لە دژمان دەجەنگن، هەروەها کە بەرپەرچی دەستدرێژییو ستەمی دەستدرێژکارانو ستەمکاران بدەینەوە.

٥/ پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) بابای کوژراوی بەرگرییکار لە دینو ژینو سامانو نشتیمانو کەسو کاری، بە شەهید داناوە.

## بڕگەی یەکەم: بەرگریی لە خۆکردن، شتێکی خوازسك (فطري)ە، لە هەموو ژیانداریێکدا:

بەڵێ خوای کاربەجێ هیچ ژیاندار (حيّ)ێکی دروست نەکردوە، کە هەستی بەرگریی لە خۆکردن (شعور الدفاع عن الذات)و خۆپاراستنی تێدا دانەنابێو، فێری نەکردبێ، چۆن بوونی خۆی درێژە پێبداتو بپارێزێ، لەو مەترسییانەی کە هەڕەشەی لێدەکەن.

وە ئەوە یاسا (سنة)یەکی گشتیی خوایە، لە هەموو ژیانداران (أحياء)دا، هەر لە (ئەمیبا)وە بگرە، کە ژیانداریێکی یەك خانەییە، هەتا نەهەنگو فیل.

فەرمایشتی خواش لەسەر زمانی مووسا "سەلامی خوای لێبێ" لە وەڵامی فیرعەوندا کە دەپرسێ:﴿ قَالَ فَمَن رَّبُّكُمَا يَٰمُوسَىٰ ﴿٤٩﴾ ﴾طه.

واتە: ئنجا ئایا پەروەردگارتان کێیە، ئەی مووسا؟!!

کە دەفەرموێ: ﴿ قَالَ رَبُّنَا ٱلَّذِيٓ أَعۡطَىٰ كُلَّ شَيۡءٍ خَلۡقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ﴿٥٠﴾ ﴾طە، واتە: پەروەردگارمان ئەو کەسەیە کە بوونی بە هەموو شتێك داوە، پاشان ڕێنمایی کردوە "چۆن بژیو بەڕێوە بچێ"!

بەڵگەیە لەسەر ئەوەی گوتمان، چونکە بێگومان ئەو ڕێنمایی (هداية)یەی خوا، کە بە هەموو دروستکراوەکانی خۆیداوە، بەبێ هەڵاواردن، چۆنیەتی خۆپاراستنو بەرگریی لە خۆکردنیشیان دەگرێتەوە.

## بڕگەی دووەم: خوا "سبحانه وتعالى" بەرپەرچدانەوەی ستەمکارانی، بە چاکەو بەخششی خۆی لەسەر جیهانییان داناوە:

وەك خوا عز وجل لە کۆتایی بەسەرهاتی (طالوت وجالوت)داو، پاش کوژرانی (جالوت) بە دەستی (داود) "سەلامی خوای لێ بێ"، فەرموویەتی:﴿ وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّفَسَدَتِ ٱلْأَرْضُ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ ذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٥١﴾ ﴾البقرة.

واتە: ئەگەر خوا هەندێك لە خەڵکی (خراپەکارو ستەمکار)ی بە هەندێك خەڵکی (بەرگرییکار) بەرپەرچ نەدابایەوە، سەر زەمین تێکدەچوو، بەڵام خوا خاوەن چاکەو بەخششە بەسەر جیهانییانەوە.

کەواتە: بەرپەرچدانەوەی ستەمکارو دەستدرێژییکەران بۆ سەر خەڵكو کۆمەڵگایەکان، لەلایەن کەسانێکەوە، کە فیداکاریی دەکەنو، ئامادەنین مل بۆ ستەمکارانو ملهوڕان نەوی بکەن، یەکێکە لە نیعمەتو چاکەکانی خوای دادگەرو کاربەجێ لە ژیانی مرۆڤدا، چونکە بە هۆی پەرەستاندنی ستەمو دەستدرێژییەوە، لەلایەن ستەمکارانەوە، لە سۆنگەی نەبوونی بەرەنگاریی‌و فیداکارییدا، ژیانی مرۆڤ لەسەر زەمین تێکدەچێو خێری پێوەنامێنێ.

ئنجا شایانی باسیشە کە خوای بەرزومەزن، بە گشتیی باسی بەرخۆدانو بەرهەڵستیی کردنی ستەمو دەستدرێژیی کردوەو، تایبەتی نەکردوە بە ئەهلی ئیمانەوە، کەواتە: بەرەنگاریی‌و فیداکاریی‌و مل نەدان بۆ ستەمو دەستدرێژیی، بە ڕەهایی شتێکی باشەو، نیعمەتو بەخشێکی خوایە، لە هەر کەسێکەوەبێو، دژی هەر ستەمکارێك بێ.

## بڕگەی سێیەم: خوا ستایشی خۆی کردوە، لەسەر نەهێشتن‌و دوابڕینیی ستەمکاران:

وەك خوای دادگەر دەفەرموێ:﴿ فَقُطِعَ دَابِرُ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ ۚ وَٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٥﴾ ﴾الأنعام.

واتە: ئنجا ئەو کۆمەڵەی ستەمیان کردبوو، دوابڕاو (قڕە بڕ) بوون‌و، ستایش بۆ خوای پەروەردگاری جیهانەکان.

کەواتە: نەهێشتنی ستەمکاران‌و سنوورشکێنان، چاکەو نیعمەتێکی خوای بەرزو بێ وێنەیە، بۆیە بە لەبەین چوون‌و کۆتایی پێ هاتنیان، دەبێ سوپاس‌و ستایشی خوای بەخشندەو بەخشەر بکرێ، چونکە بێگومان هەر خوا سەرچاوەی هەموو چاکەو خێرو خۆشییەکە، وەك فەرموویەتی:﴿ وَمَا بِكُم مِّن نِّعْمَةٍ فَمِنَ ٱللَّهِ ۖ ثُمَّ إِذَا مَسَّكُمُ ٱلضُّرُّ فَإِلَيْهِ تَجْـَٔرُونَ ﴿٥٣﴾ ﴾النحل.

واتە: هەر خۆشیی‌و چاکەیەکتان هەبێ، بەس لە خواوەیە، ئنجا هەر کات زیانێکیشتان تووش بوو، تەنیا هاواری وی دەکەن‌و، لێی دەپاڕێنەوە (کە لێتان لابەرێ).

**بڕگەی چوارەم: خوا فەرمانی کردوە: لە دژی کەسانێك بجەنگین، کە لە دژمان دەجەنگن، هەروەها کە بەرپەرچی دەستدرێژیی و ستەمی دەستدرێژکاران و ستەمکاران بدەینەوە**

وەك خوای زاڵ و مەزن فەرمووییەتی:

١)- ﴿ وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴿١٩٠﴾ ﴾البقرة.

واتە: لەڕێی خوادا لە دژی ئەوانە بجەنگن، کە جەنگتان لەدژ دەکەن، بەڵام دەستدرێژیی مەکەن، بێگومان خوا دەستدرێژکارانی خۆشناوێن {دیارە مەبەست لە دەستدرێژیی لێرەدا: جەنگ کردنە دژی کەسانێکی لاشەڕو ئاشتییخوازو، لەکاتی جەنگدا: کوشتنی خەڵکی لاشەڕو بێ زیانە، وەك ژن و منداڵ}.

٢)- ﴿ ٱلشَّهْرُ ٱلْحَرَامُ بِٱلشَّهْرِ ٱلْحَرَامِ وَٱلْحُرُمَٰتُ قِصَاصٌۚ فَمَنِ ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ فَٱعْتَدُواْ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿١٩٤﴾ ﴾البقرة.

واتە: ئنجا هەرکەس دەستدرێژیی کردە سەرتان، وەك دەستدرێژییەکەی خۆی، دەستدرێژیی بکەنەوە سەرو، پارێز لە خوا بکەن و، بزانن کە خوا لەگەڵ پارێزکاراندایە.

مەبەست لە دەستدرێژیی کردنەوە سەر (فَاعْتَدُواعَلَيْهِ)یش بەرپەرچدانەوەی ستەم و دەستدرێژییەو، لەبەر پێکچوویتی (مشاكلة) وشەی دەستدرێژیی بۆ بەکارهاتوە.

ج/ ﴿لَا تَظۡلِمُونَ وَلَا تُظۡلَمُونَ ﴿٢٧٩﴾﴾ البقرة.

واتە: نە ستەم بکەنو نە ستەمتان لێ بکرێ.

دیارە جێبەجێکردنی فەرمانەکانی خوای پەروەردگاریش "مادام نیشانەیەك نەبێ، لەسەر ئەوە کە مەبەست پێیان: ڕەوابوونو پەسندبوون (الإباحةوالنَّدب)ە"، پێویستە، کەواتە: وەك چۆن مرۆڤ، هەروەها خەڵكو کۆمەڵگا، بە ستەمکردنو دەستدرێژیی کردنە سەر کەسانی دیکە، گوناهبارو تاوانبارە، بە هەمان شێوەش، بە بێدەنگییو بێ هەڵوێستیی لەبەرانبەر ستەمو دەستدرێژیی ستەمکارو دەستدرێژکارانیشدا، گوناهبارو تاوانبارە.

**بڕگەی پێنجەم: پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) بابای کوژراوی بەرگرییکار لە دین و ژین و سامان و نشتیمان و کەس و کاری، بە شەهید داناوە.**

وەك پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فەرموویەتی:

أ/ (**مَنْ قُتِلَ دُونَ مَالِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ، وَمَنْ قُتِلَ دُونَ عِرْضِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ**)(١).

واتە: هەر کەس لەسەر سامانی بکوژرێ، شەهیدەو، هەر کەس لەسەر ناموسی بکوژرێ، شەهیدە.

ب/ (**مَنْ قُتِلَ دُونَ مَالِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ، وَمَنْ قُتِلَ دُونَ أَهْلِهِ، أَو دون دَمِهِ، أَو دُونَ دِينِهِ، فَهُوَ شَهِيدٌ**)(٢).

واتە: هەر کەس لەسەر ماڵو سامانی بکوژرێ، ئەوە شەهیدەو، هەر کەس لەسەر خێزانی، یان لەسەر خوێنی، یان لەسەر ئایینی بکوژرێ، ئەوە شەهیدە.

ج/ (**عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! أَرَأَيْتَ إِنْ جَاءَ رَجُلٌ يُرِيدُ أَخْذَ مَالِي؟ قَالَ: «فَلاَ تُعْطِهِ مَالَكَ»، قَالَ: أَرَأَيْتَ إِنْ قَاتَلَنِي؟ قَالَ: «قَاتِلْهُ»، قَالَ: أَرَأَيْتَ إِنْ قَتَلَنِي؟ قَالَ: «فَأَنْتَ شَهِيدٌ»، قَالَ: أَرَأَيْتَ إِنْ قَتَلْتُهُ؟ قَالَ: «هُوَ فِي النَّارِ»**)(٣).

واتە: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ڕات چییە، ئەگەر پیاوێك هات ویستی ماڵەکەم لێ بستێنێ؟

---

١) رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٢٤٨٠)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٤١) الفقرة الأولى مِنْهُ.

٢) رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (١٦٥٢)، وَعَبْدُ بْنُ حُمَيد برقم: (١٠٦)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٧٧٢)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٤٢١) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٤٠٩٥)، وَأَبُو يَعْلَى برقم: (٩٤٩)، واللَّفْظُ لأَبِي دَاوُد، قَالَ الشيخ الأَلْبَانِي: صَحِيح.

٣) رَوَاهُ مُسْلِمٌ برقم: (١٩١٥).

فەرمووی: سامانەکەتی مەدەیە، گوتی: ڕات چییە ئەگەر جەنگی لەدژ کردم؟ فەرمووی: لە دژی بجەنگە، گوتی: ئەدی ئەگەر کوشتمی؟ فەرمووی: تۆ شەهید دەبی، گوتی: ئەگەر من ئەوم کوشت؟ فەرمووی: ئەو لە ئاگر "ی دۆزەخ"دا دەبێ.

هەڵبەتە لەو پێنج بڕگەیەشەوە کە ڕابردن، زۆر باش ڕوون بۆوە، کە بەرگریی کردنی هەر گەلو نەتەوەیەك لە دینو ژینو خەڵكو خاكو سامانو ئاساییشی خۆی، نەك هەر دروستو ڕەوا (جائز، مباح)ە، بگرە پێویست (واجب)یشەو، ئەرکێکی گەورەی شەرعییە، کە مسوڵمانان لەسەر ئەنجامدانی پاداشتیان هەیەو، بە هۆی کەمتەرخەمیی تێدا کردنیشیەوە، بە گوناهبار دادەنرێنو، دووچاری سزای خوای دادگەر دەبن.

کەواتە: گەلی کورد کە تاکە گەلێکی ستەمدیدەی سەر زەمینە، لەم ڕۆژگارەدا لەسەر نەخشەی سیاسیی دنیا، بوونی نەبێ -واتە: لە شێوەی قەوارەیەکی سیاسیی یەکگرتووی دانپێداهێنراودا- نەك هەر ماف، بگرە ئەرکێکی شەرعیی گەورەی سەر شانیەتی، کە بەپێی تواناو بۆ لوانی، بەرگریی لە بوون (وجود)و دەستکەوتەکانی خۆی بکات، لە هەموو بەشەکانی وڵاتەکەی (کوردستان)دا: باکوورو باشوورو ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوای، ئنجا هەر کەسێك لەو پێناوەدا بکوژرێ، مادام مسوڵمان بێو، وەك ئەرکێکی شەرعیی پێی هەڵسێ، پلەی شەهیدی هەیە.

لە ئاڵقەی داهاتووشدا زیاتر تیشك دەخەینە سەر ئەم بابەتەو، ڕوونی دەکەینەوە: شەهیدیی چییەو شەهید کێیە؟!

هەڵبەتە وەك پێشتریش گوتمان:

خودی بەرگریی لەخۆکردن: خوێن،ئایین، سامان، نیشتیمان، ئابڕوو و کۆمەڵگا، لەلایەن هەرکەسێکەوە بێو بەهەر پاڵنەرێك بێ، بۆ ژیانی دنیا هەرباشەو، خوا بەرهەڵستییو بەرگرییو بەرخۆدانی ستەملێکراو و چەوساوانی لەبەرانبەر ستەمکارو دەستدرێژکاراندا، بەچاکەو نیعمەتی خۆی داناوە، بەسەر خەڵکەوەو،

فەرمووشیەتی: تێکۆشانو بەرخۆدانو فیداکاریی، مایەی پارێزرانی سەرزەمینە لە خراپەکاریی و تێکچوون وەك خوا فەرموویەتی: ﴿وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّفَسَدَتِ ٱلْأَرْضُ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ ذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٥١﴾﴾البقرة.

واتە: ئەگەر خوا هەندێك لە خەڵكی (ستەمكارو سنوور بەزێن)ی، بە هەندێك لە خەڵكی (فیداكارو خەباتگێڕ) بەرپەچ نەدایایەوە سەرزەمین تێك دەچوو، بەڵام خوا خاوەن چاكەو بەخششە بەسەر جیهانیانەوە.

## ئاڵقەی پێنجەم:

## هەرکەسێکی مسوڵمان لەبەرگریی لێکردنی: دین و ژین و خەڵك و نیشتمانیدا بکوژرێ، شەهیدە

# دەستپێک

بەڕێزان!

خوا پشتیوان بێ ئێمە لەچوار بڕگەدا ئەم بابەتە دەتوێژینەوە، کە ئەمانە ناوونیشانەکانیانن:

١)- وشەی (شَهید) لەچییەوە هاتوەو مانای چییە؟

٢)- شەهیدی پلە یەك، کەسێکە لەڕێی خواو بەرزکردنەوەی ناوی خوادا بکوژرێ.

٣)- هەرکەسێك بە ئیمانەوە لەبەرگریی لێکردنی خەڵكو خاكو ژیانو ساماندا بکوژرێ، شەهیدە.

٤)- هەر پێشمەرگەیەکی مسوڵمانی کوردستان، لەجەنگی بەرگریی کردن لەخەڵكو خاکیدا بکوژرێ، شەهیدە.

## بڕگەی یەکەم: وشەی (شهید) لەچییەوە هاتووەو مانای چییە؟!

وشەی (شهید) کە وشەیەکی عەرەبییەو، لە هەرکام لە قورئانی بەرزو بەپێزو سوننەتی پێغەمبەری سەروەرو بەڕێزیشماندا هاتوە، شارەزایانی زمانی عەرەبیی و وشەکانی قورئان، ئاوا باسیان کردوە:

("شَهِدَ" عَلَى كَذَا يَشْهَدُ شَهَادَةً: أَخْبَرَ بِهِ خَبَرًا قَاطِعًا، وَشَهِدَ لِفُلَانٍ عَلَى فُلَانٍ بِكَذَا: أَدّى مَاعِنْدَهُ مِنَ: الشَّهَادَةِ، وَشَهِدَ بِاللهِ: حَلَفَ، وشَهِدَ: أَقَرَّ بِمَا عَلِمَ، وَشَهِدَ المَجْلِسَ: حَضَرَهُ، وَشَهِدَ الشيءَ: عَايَنَهُ)[١].

وەك دەبینین وشەی (شَهِدَ) کە ڕیشەی وشە (شَهید)ە، بەشەش مانایان هاتوە:

١. شَهِدَ عَلَى كَذَا: هەواڵێکی مسۆگەری لەبارەی شتێکەوەدا.
٢. شَهِدَ لفلان عَلَى فلان بكَذا: شایەدیی بۆ فلانکەسدا لەسەر فلانکەس، بەوە کە فلان شتە ئاوایە.
٣. شهِدَ باللهِ: سوێندی بەخوا خوارد.
٤. شَهِدَ بِمَا عَلِمَ: دانی بەوە داهێنا کە دەیزانی.
٥. شَهِدَ المَجْلِسَ: ئامادەی کۆڕەکە بوو.
٦. شَهِدَ الشيءَ: شتەکەی بینی.

وشەی (شهید)یش لەئەسڵی زماندا سێ مانای هەن:

١- کوژراو لەڕێی خوادا ٢- شایەد ٣- ئامادە[٢].

ئەمە وەك ڕیشەی زمانەوانیی، وشەی (شهید).

---

١) المعجم الوسيط، ص ٤٩٧.

٢)مفردات ألفاظ القرآن، راغب الأصفهاني، ص ٤٦:

بەڵام لەزاراوەی شەرعدا، وشەی (شَهيد) بریتییە لەکەسێك کە لەڕێی خوادا بکوژرێ: (مَنْ قُتِلَ فِي سَبيلِ الله)[1].

هەندێکیش ئاوا پێناسەیان کردوە: (من مات من المسلمين في قتال الكفار وبِسَبَبِه)[2]. واتە: کەسێکە کە لەمسوڵمانان بەهۆی جەنگکردن لەگەڵ کافراندا مردوە.

هەندێکیش ئاوا پێناسەی شەهیدیان کردوە:

(الشهيد:هو كل مسلم طاهرٍ بالغٍ قُتِلَ ظُلْماً،ولَمْ يجِبْ بِقَتْلِه مالٌ ولم يرتثّ)[3].

واتە: شەهید هەر مسوڵمانێکی پاکی باڵغە، کە بەستەملێکراویی کوژراوەو، بەهۆی کوژرانیەوە سامان (خوێن) پێویست نەبووەو، بەبریندارییی نەمردوە، (واتە: وانەبووە کە برینداربێ و پاش ماوەیەك بمرێ.)

## ئایا هۆی ناونرانی کوژراوی ڕێی خوا بە (شهيد) چییە؟!

(راغب الأصفهاني) گوتوویەتی:

{والشَّهِيد هُوَ المُحْتَضَرُ فتسميته بذَلِكَ لحضُورِ الملائكَة إيّاه، إِشَارَةً إلى مَا قَالَ: ﴿ تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُواْ وَلَا تَحْزَنُواْ وَأَبْشِرُواْ بِٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى كُنتُمْ تُوعَدُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾فصلت، وَقَالَ:﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦٓ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصِّدِّيقُونَ وَٱلشُّهَدَآءُ عِندَ رَبِّهِمْ لَهُمْ أَجْرُهُمْ وَنُورُهُمْ ﴿١٩﴾ ﴾الحديد، أَوْ لأَنَّهُم يَشْهَدُونَ فِي تِلْكَ الحَالَة مَا أُعِدَّلَهُمْ، أَوْ لأَنَّهم تَشْهَد أَرْوَاحُهُم عِنْدَالله، كَمَا قَالَ:﴿

---

١) المعجم الوسيط، ص٤٩٧، المنجد ص٤٠٦، معجم المصطلحات والألفاظ الفقهية، ج٢ ص٣٤٦، د.محمود عبدالرحمن المنعم.

٢) مغني المحتاج، ج١ ص٣٥٠.

٣) التعريفات، للجرجاني، ص ١٣١.

﴿وَلَا تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَمْوَاتًا بَلْ أَحْيَاءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ (١٦٩) فَرِحِينَ بِمَا آتَاهُمُ اللَّهُ مِن فَضْلِهِ (١٧٠)﴾آل عمران، وَعَلَى هَذَا دَلَّ قَوله: ﴿وَالشُّهَدَاءُ عِندَ رَبِّهِمْ لَهُمْ أَجْرُهُمْ وَنُورُهُمْ (١٩)﴾الحديد}[١].

وەك دەبینین (راغب الأصفهاني) ناونرانی كوژراوی ڕێی خوا، بە شەهید، بۆ سێ ئیعتیبار دەگێڕێتەوە:

١)- چونكە لەكاتی گیانەلاّ (إحتضار)دا، فریشتەكان لەلای ئامادە دەبن، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ الْمَلَائِكَةُ أَلَّا تَخَافُوا... (٣٠)﴾فصلت، واتە: فریشتەكان دادەبەزنە سەریان پێیان دەڵێن: مەترسن..

٢- چونكە لەوكاتەدا (كاتی گیان سپاردن) ئەو نازو نیعمەتە دەبینن، كە بۆیان ئامادەكراوە.

٣- چونكە ڕووحەكانیان لەلای خوا ئامادە دەبن، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿وَلَا تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَمْوَاتًا بَلْ أَحْيَاءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ (١٦٩) فَرِحِينَ بِمَا آتَاهُمُ اللَّهُ مِن فَضْلِهِ (١٧٠)﴾آل عمران.

واتە: پێتان وانەبێ كە ئەوانەی لەپێناوی خوادا كوژراون، مردوون، بەڵكو زیندوون لەلای پەروەردگاریان ڕۆزییان پێ دەدرێ، دڵخۆش و شادمانن بەوەی خوا لە بەخششی خۆی پێیداون...

٤- خاوەنی (المنجد)یش ئیعتیبارێكی دیكەی چوارەم باس دەكات و دەڵێ: (قيلَ سُمِّي بذَلِكَ لقيامه بشَهادَة الحَقّ فِي أمْرِ الله)[٢]، واتە: گوتراوە: بۆیە

---

١) مفردات ألفاظ القرآن، ص ٤٦٨.

٢) ص٤٠٦.

بەوە ناونراوە، چونکە هەڵساوە بەشایەدیی دانی هەق و ڕاست، لەبارەی ئایینی خواوە.

١) کەواتە: ئەگەر ئیعتیباری یەکەم بگرین (شەهید: کەسێکە کە فریشتەکان ئامادەی گیان کێشرانی دەبن)، مانای وایە شەهید (فعیل)ە، بەمانای (مفعول).

٢) بەڵام ئەگەر ئیعتیباری دووەم بگرین، (شەهید: کەسێکە کە نازو نیعمەتی ئامادەکراوی خوا دەبینێ) مانای وایە (شهید) بەمانای بینەر (شاهد) دێ، یانی: (فعیل بمعنی فاعل).

٣) هەروەها ئەگەر ئیعتیباری سێیەم بگرین، ( شەهید: کەسێکە کە ڕووحی لەلای خوا ئامادە دەبێ) مانای وایە (شهید)، بەمانای (حاضر) دێ، یانی: (فعیل بمعنی فاعل).

٤) هەروەها ئەگەر ئیعتیباری چوارەمیش بگرین، (شەهید: کەسێکە کە شایەدیی دەدات کە ئایینو فەرمانی خوا ڕاستو تەواوە) ئەوە دیسان (شهید) بەمانای (شاهد)دێ، بەڵام (شاهد) لێرەدا بەمانای شایەدە، نەك بینەر.

## جۆرەکانی شەهید:

زاناو شەرعزانان، شەهیدانیان بۆسێ جۆر دابەش کردوون:

١. شەهیدی دنیاو دوارۆژ: کە بریتیە لەکەسێك لەجەنگی کافراندا بکوژرێو، مەبەستی بەرزکرنەوەی ناوی خواو بەرنامەی خوا بێو، هیچ نیازو مەبەستی دیکەی لەدڵدا نەبێ.

٢. شەهیدی دنیا: کە بریتیە لە کەسێك لەجەنگی کافراندا بکوژرێ، بەڵام نیازو مەبەستێکی دنیایی، هاندەری بێ.

٣. شەهیدی دوارِۆژ: کە بریتیە لە کەسێك بەستەملێکراویی بکوژرێ، بەڵام لەجەنگی کافراندا نا، هەروەها هەرکەسێك بەکارەساتێکی کتو پڕ بمرێ، وەك: خنکان، سووتان، طاعوون، هەڵدێران، ژنی زەیستان...[1]



١) بڕوانە: (المصباح المنير)، ص١٢٤و (مغني المحتاج) ج١ ص٣٥٠و (الموسوعة الفقهية) ج٢٦ ص ٢٧٣و (معجم المصطلحات والألفاظ الفقهية) ج٢ ص٣٤٧.

## بڕگەی دووەم: شەهیدی پلەیەك، كەسێكە لەڕێی خواو بەرزكردنەوەی ناوی خوادا، بكوژرێ

دیارە پاش بڕگەی یەكەم ڕاستیی ئەم ناوونیشانە، ڕوون و بێچەندوچوونەو، لەزۆربەی هەرەزۆری ئەو ئایەت و فەرموودانەشدا كە وشەكانی: (جهَاد وَقِتَال وَقَتْل وإِنفاق)یان تێداهاتوون، هەمیشە وشەی: (فِي سَبيلِ الله)شیان لەگەڵ هاتوە، بۆ نموونە:

١. ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴿٢١٨﴾ ﴾البقرة.

٢. ﴿ وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٤٤﴾ ﴾البقرة.

٣. ﴿ مَّثَلُ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴿٢٦١﴾ ﴾البقرة.

٤. ﴿ ..وَقِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْاْ قَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَوِ ٱدْفَعُواْ ﴿١٦٧﴾ ﴾آل عمران.

٥. ﴿ فَلْيُقَٰتِلْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يَشْرُونَ ٱلْحَيَوٰةَ ﴿٧٤﴾ ﴾النساء.

٦. ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴿٧٦﴾ ﴾النساء.

٧. ﴿ فَقَٰتِلْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ لَا تُكَلَّفُ إِلَّا نَفْسَكَ ۚ وَحَرِّضِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٨٤﴾ ﴾النساء.

٨. ﴿ وَٱلْمُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ ﴿٩٥﴾ ﴾النساء.

٩. ﴿ يُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴿٥٤﴾ ﴾المائدة.

١٠.﴿ وَجَٰهَدُواْ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴿١٥﴾ ﴾الحجرات.

١١.﴿ وَتُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ تَعْلَمُونَ ﴿١١﴾ ﴾الصف.

١٢- ﴿ وَٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَلَن يُضِلَّ أَعْمَٰلَهُمْ ﴿٤﴾ ﴾محمد.

١٣.﴿ تُدْعَوْنَ لِتُنفِقُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴿٣٨﴾ ﴾محمد.

١٤- ﴿ وَلَا تَقُولُواْ لِمَن يُقْتَلُ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتٌۢ بَلْ أَحْيَآءٌ وَلَٰكِن لَّا تَشْعُرُونَ ﴿١٥٤﴾ ﴾البقرة.

١٥- پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّم) فەرموویەتی: (**مَنْ قَاتَلَ لِتَكُونَ كَلِمَةُ اللَّهِ هِيَ الْعُلْيَا فَهُوَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ**)[1]

واتە: هەرکەسێك بۆ ئەوە بجەنگێ، کە وشەی خوا بەرزترین بێ، ئائەوە لەڕێی خوادایە.

دیارە ئەویش لەوەڵامی پرسیارێکدا وایفەرمووە، وەك لە فەرموودەکەدا هاتوە: (**سُئِلَ رَسُولُ اللهِ (صلى الله عليه وسلم) عَنِ الرَّجُلِ يُقَاتِلُ شَجَاعَةً، وَيُقَاتِلُ حَمِيَّةً، وَيُقَاتِلُ رِيَاءً، أَيُّ ذَلِكَ فِي سَبِيلِ اللهِ؟**) واتە: پرسیار لە پێغەمبەری خوا(صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّم) کرا دەربارەی پیاوێك کە بۆ دەرخستنی ئازایەتیی دەجەنگێ، یان بۆ دەرخستنی جوامێریی‌و ستەم قبووڵ نەکردن دەجەنگێ، یان بۆ ڕووپامایی دەجەنگێ، کام لەوانە لەڕێی خوادایە؟!

دیارە مەبەستیش لە: {لەڕێی خوادا}(في سبيل الله) ئەوەیە کە ئەو جەنگ کردنە هەم لەسەر ڕێبازی خوابێ‌و، هەم مەبەستیش پێی ڕازیکردنی خوا بێ‌و،

---

١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٩٥١١)، وَالْبُخَارِيُّ برقم: (٧٠٢٠)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٩٠٤)، وَأَبُو دَاوُدَبرقم: (٢٥١٧)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٦٤٦)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٣١٣٦)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢٧٨٣).

مەبەست لەبەرزترین بوونی وشەی خوا (كلمة الله هي العليـا)ش ئەوەیـە كـە نـاوی خواو بەیداغی ئایینی خوا، بەرزترین بێو، بەرنامەی خوا باڵادەست بێ.

كەواتە:

**شەهید بەپلەی یەکەم کەسێکە:**

١- لەسەر ڕێبازی خوا كوژرابێ.

٢- نیازی ڕازیكردنی خوا بووبێ، بەجەنگ كردنەكەی.

٣- مەبەستی بەرزتربوونی ناوی خواو بەیداغی ئایینی خوا بووبێ.

## بڕگەی سێیەم: هەرکەسێك بەئیمانەوە لەبەرگریی لێکردنی خەڵك و خاك و ژیان و سامانیدا، بکوژرێ، ئەویش شەهیدە

وەك لەبڕگەی دووەمدا باسمان کرد: شەهیدی پلەیەك "کەزانایان بەشەهیدی دنیاو دوارِۆژ (شهید الدنیا والآخرة) پێناسیان کردوە" بریتیە لە کەسێك کە لەرێی خواداو، لەپێناو بەرزڕاگرتنی ناوی خوادا دەکوژرێ.

بەڵام شەهید "بەماناو چەمکی گشتی" تەنیا ئەو جۆرە نیە، بەڵکو جۆرێکی دیکەی شەهیدیش هەیە، کە دەتوانین بڵێین: شەهیدی پلە دوویەو، زانایان بەشەهیدی دوارۆژ (شهید الآخرة) ناویان بردوە، ئەویش هەرکەسێکە کە مسوڵمانەو بەستەملێکراویی و، لەحاڵەتی بەرگریی لێکردنی خەڵك و خاك، یان ژیان و سامانیدا، دەکوژرێ، هەروەها هەرکەسێك بەکارەسات و پێشهاتێکی کت و پڕی وەك: ژانە سك، طاعوون، سووتان، خنکان، ژێرخانووکەوتن، ئافرەت لەسەر منداڵبوون، ... هتد، دەمرێ.

دیارە جیاوازیی نێوان ئەو دووانەش: شەهیدی پلە یەك و شەهیدی پلەدوو، یان: شەهیدی دنیاو دوارۆژو، شەهیدی دوارۆژ، وێڕای پلەبەرزیی و پاداشتی زیاتر بۆیەکەمیان، ئەوەیە کە جۆری یەکەم لەمامەڵەی دنیاییدا، مامەڵەی مردووی ئاسایی لەگەڵ ناکرێ: ناشورێ و، کفن ناکرێ و، نوێژی لەسەر ناکرێ.

وەك (النووي) لە (رياض الصالحين) ص(٤٤٥)دا، ئەو مەسەلەیەی کردۆتە (باب)ی ژمارە (٢٣٥)، بەم ناوونیشانە:

(باب بَيَان: جَمَاعَة من الشهَداء في ثواب الآخرة، يُغَسِّلون ويُصَلِّى عليهم، بخلاف القتيل في حرب الكفار)، واتە: {دەرگای ڕوونکردنەوەی: کۆمەڵێك لەشەهیدان کە

پاداشتی دوارۆژیان هەیەو، دەشۆرێنو، نوێژیشیان لەسەر دەكرێ، بەپێچەوانەی كوژراوی جەنگی كافرانەوە}، پاشان (النووي) ئەم چوار فەرمایشتە بەڕیز دێنێ:

١- (**الشُّهَدَاءُ خَمْسَةٌ: الْمَطْعُونُ، وَالْمَبْطُونُ، وَالْغَرِيقُ، وَصَاحِبُ الْهَدْمِ، وَالشَّهِيدُ فِي سَبِيلِ اللهِ**)[1].

واتە: شەهیدان پێنج جۆرن: تاعوون لێدراو و، بەزگ ئێشەمردوو و، خنكاو و، شت بەسەردا ڕووخاوو، شەهیدكراو لەڕێی خوادا.

٢- (**عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَا تَعُدُّونَ الشَّهِيدَ فِيكُمْ»؟ قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ! مَنْ قُتِلَ فِي سَبِيلِ اللهِ فَهُوَ شَهِيدٌ، قَالَ: «إِنَّ شُهَدَاءَ أُمَّتِي إِذًا لَقَلِيلٌ»، قَالُوا: فَمَنْ هُمْ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: «مَنْ قُتِلَ فِي سَبِيلِ اللهِ فَهُوَ شَهِيدٌ، وَمَنْ مَاتَ فِي سَبِيلِ اللهِ فَهُوَ شَهِيدٌ، وَمَنْ مَاتَ فِي الطَّاعُونِ فَهُوَ شَهِيدٌ، وَمَنْ مَاتَ فِي الْبَطْنِ فَهُوَ شَهِيدٌ»، وَالْغَرِيقُ شَهِيدٌ»**)[2]

واتە: پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فەرمووی: لەنێو خۆتاندا پێتانوایە شەهیدەكانتان كێن؟ گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ! هەركەس لەڕێی خوادا بكوژرێ ئەوە شەهیدە، فەرمووی: ئەگەر وابێ شەهیدەكانی ئۆممەتم كەمن، گوتیان: ئەدی شەهیدان كێن ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: ئەوەی لەڕێی خوادا بكوژرێ شەهیدەو، هەركەس لەڕێی خوادا بمرێ، شەهیدەو، هەركەس لەتاعووندا بمرێ، شەهیدەو، هەركەس بەژانە سك بمرێ، شەهیدەو، خنكاویش (لەئاودا) شەهیدە.

١) أَخْرَجَهُ مَالِك برقم: (٢٩٣)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٦٢٤)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٩١٤)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٠٦٣) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيح.

٢) أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (١٩١٥)،وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٣١٨٦).

٣- (**مَنْ قُتِلَ دُونَ مَالِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ**)[1] واتە: هەرکەس لەسەر ماڵو سامانی بکوژرێ، شەهیدە.

٤- (**مَنْ قُتِلَ دُونَ مَالِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ، وَمَنْ قُتِلَ دُونَ أَهْلِهِ، أَو دون دَمِهِ، أَو دُونَ دِينِهِ، فَهُوَ شَهِيدٌ**)[2].

واتە: هەر کەس لەسەر سامانی بکوژرێ، شەهیدە، هەر کەس لەسەر خێزانی بکوژرێ، یان لەسەر خوێنی، یان لەسەر ئایینی، ئەوە شەهیدە.

دیارە لەم فەرمایشتانەشەوە زۆر ڕوونە، کە وێڕای کوژراوانی ڕێی خوا "کە شەهیدی پلەیەکن" چەند جۆرێکی دیکەش شەهید هەن، کە شەهیدی پلەدوون، کە جۆرێکیان ئەوکەسانەن کە مل بۆ ستەمو دەستدرێژیی نەوی ناکەن، لەهەرکەسێکەوە بێ، بەڵکو بەرەنگاری دەبنەوەو، لەگەڵی دەجەنگنو سەرەنجام دەکوژرێن.

جۆرێکیشیان ئەو کەسانەن، کە بەهەندێك نەخۆشیيو کارەساتی تایبەت دەمرن، کە سیفەتی کۆکەرەوە (الصِّفة الجامعة)یان، بریتییە لە ڕووداوی کتو پڕو چاوەڕواننەکراو، کە بەپێی چاخو ڕۆژگارەکانیش دەگۆڕێن، بۆ وێنە:

لەم ڕۆژگارەماندا قوربانییەکانی هۆیەکانی هاتو چۆ (وسائط النقل) زۆرن، کە ئەو جۆرە قوربانییانە لەڕۆژگاری زوودا نەبوون، یان زۆر کەم بوون.

---

١) رواه البخاري: ٢٤٨٠، ومسلم: ١٤١٠.

٢) رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (١٦٥٢)، وَعَبْدُ بْنُ حُمَيد برقم: (١٠٦)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٧٧٢)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٤٢١) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٤٠٩٥)، وَأَبُو يَعْلَى برقم: (٩٤٩)، واللَّفْظُ لأَبِي دَاوُد، قَالَ الشيخ الألباني: صَحِيح.

## بڕگەی چوارەم: هەر پێشمەرگەیەکی مسوڵمانی کوردستان، لەجەنگی بەرگریی کردن لەخەڵك و خاکیدا بکوژرێ، شەهیدە

هەڵبەتە پاش سەرەنجدان و لێتێگەیشتنی سێ بڕگەکەی پێشووی ئەم باسە، ڕاستیی ناوونیشانی ئەم بڕگەی چوارەمە، دەبێتە شتێکی ڕوون و سەلمێنراو.

ئنجا دیارە ئەوەش "واتە: بەشەهید دانرانی کەسانێکی مسوڵمان کە لەجەنگی دژی داگیرکارو دەستدرێژکارو، بەرگریی کردن لەخەڵك و خاك و دین و ژینیاندا، دەکوژرێن" تایبەت نیە بەهێزی پارێزگارییکاری کوردستانەوە، بەهەموو ناوونیشانەکانیانەوە، بەڵکو گشتییە بۆسەرجەم بەرگرییکارانی مسوڵمان، لەدین و ژین و خەڵك و خاکی وڵاتەکانیان.

هەروەها هەرکەس لەو سێ بڕگەیەی پێشوو حاڵی ببێ، دڵنیا دەبێ کە وشەی (شەهید) بەهەرسێك مانایەکانی: ١- شەهیدی دنیاو دوا ڕۆژ، ٢- شەهیدی دوارۆژ، ٣- شەهیدی دنیا، وشەو زاراوەیەکی ئیسلامییەو، تایبەتە بەمسوڵمانانی لەڕێی خوادا کوژراوی شوێنکەوتووی ئیسلامەوەو، هیچ پەیوەندیی بەخەڵکی نامسوڵمانانەوە نیە "بەهەموو جۆرەکانی نامسوڵمانانەوە"، چونکە وەك لەبڕگەی دووەمدا باسمان کرد، کوژراوانی ڕێی خوا "عز وجل"، بەهەرکام لەو چوار ئیعتیبارەی خستماننەڕوو، ناونراون شەهید:

١- کە فریشتەکان لەکاتی گیان کێشانیاندا ئامادەبن و موژدەیان پێدەدەن.

٢- یان خۆیان پاداشت و نازونیعمەتی خوا دەبینن.

٣- یان ڕووحەکانیان لەلای خوای بەرزومەزن ئامادە دەبن.

٤- یان بەخوێنی خۆیان شایەدیی بۆ ڕاستیی خواو بەرنامەکەی دەدەن.

سەرەنجام شەهیدان کەسانێکی بڕوادارو فیداکاری ئیسلامن، کە ئامادەبوونە لەپێناوی پاراستنی دینو ژینیی کۆمەڵگاکەیانداو، بەمەبەستی وەدەستهێنانی ڕەزامەندیی خواو بەهەشتەکەی، گیانی خۆیان فیدابکەن.

هەربۆیەش گلەیی کردنی هەندێك لە (یەزیدییەکان) لەبەندە کە بۆچی نەمگوتوە کوژراوانی یەزیدییەکانیش شەهیدن؟! وەك لەو نووسراوەدا هاتوە کە لە: (٢٠١٤/١١/٢ز) بەناوی: {بەرپرسی ڕاگەیاندنی دەستەی باڵای بنکەی (لالش) لە دهۆك} بلاوکراوەتەوە، شتێکی سەیرو بێ جێیە، چونکە (شەهید) یانی: بەهەشتییو، بەبڕوای مسوڵمانانیش، هەبوونی ئیمان بەهەر شەش پایە سەرەکییەکەیەوە: ١- ئیمان بەخواو ٢- بەفریشتەکانیو ٣- بەکتێبەکانیو ٤- بەپێغەمبەرەکانیو ٥- بەڕۆژی دوایی ٦- بەقەزاو قەدەر، مەرجی چوونە بەهەشتە، مەگەر بۆ کەسانێك کە ڕاگەیاندنی ڕوون (البلاغ المبین)یان پێنەگەیشتبێو، هیچ لەئیسلام نەزانن "بێ ئەوەی کەمتەرخەم بووبن لەنەزانینیاندا" یان ئیسلامیان بەشێوەیەکی ناڕاستو شێوێنراو پێگەیشتبێو، خاوەن بەڵگەو عوزریش بن، کە دیارە ئەو کاتە حوکمی فەرمایشتی خوا دەیانگرێتەوە، کە دەفەرموێ:﴿ وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا ﴿١٥﴾ ﴾الإسراء، واتە: ئێمە عادەتمان وانیە خەڵك سزا بدەین (لەدنیاو دوا ڕۆژدا) هەتا پێغەمبەریان بۆ نەنێرین.

ئنجا ئاشکرایە کە پێغەمبەری کۆتایی (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) هاتوەو، دوای وی هیچ پێغەمبەرێك نایەت، بەڵام بێگومان کەسانێك پەیامو بەرنامەی پێغەمبەری خاتەمیان بەڕوونیی پێ نەگەیشتبێ، وەك خوا فەرموویەتی:﴿ وَمَا عَلَى الرَّسُولِ إِلَّا الْبَلَاغُ الْمُبِينُ ﴿٥٤﴾ ﴾النور.

واتە: پێغەمبەر جگە لە گەیاندنی ڕوون چی دیکەی لەسەر نیە.

ئەوە وەك ئەوە وایە پێغەمبەریان بۆلا نەنێررابێ.

هەڵبەتە لەم ڕۆژگارەدا: وشەی (شهید)یش وەك گەلێك وشەو زاراوەی دیکەی ئیسلام بۆتە بەشێك لە کلتوورو فەرهەنگی زۆرێك لەنامسوڵمانانیش، کە لەگەڵ مسوڵماناندا دەژین‌و، مەرجیش نیە، ئەوان بەو چەمك‌و واتایانە بەکاریان بێنن، کە ئیسلام بۆی داناون، بۆ وێنە:

ئێستاکە کەسانێك کەرەنگە بێبڕوابن‌و هیچ ئاینێکیان نەبێ، وشەی (شەهید) بۆ کوژراوەکانیان بەکاردێنن، بێ ئەوەی بڕوایان وابێ کە دوارۆژو بەهەشت هەیە!

بەڵام بەهەرحاڵ پێویستە چەمك‌و واتای ڕاستەقینەی وشەو زاراوە ئیسلامییەکان، وەك خۆیان بزانین، باکەسانێکیش بەهەڵە یان بەئانقەست بۆ واتاو مەبەستێکی دیکەی نەگونجاو،یان لەجێی خۆیاندا دانەنراو، بەکاریان بێنن.

## کۆتایی ئەم بابەتەش بەدوو ڕوونکردنەوە دێنم:

**یەکەم:** بێگومان بەرگریی لەخۆکردن‌و ستەم‌و دەستدرێژیی بەرپەرچدانەوە، لەهەر کەس‌و لایەنێکەوە بێ، شتێکی باشەو کارێکی پەسندو جوامێرانەیەو، سیفەت‌و ئاکاری پەسندیش لەهەر کەسێکەوە بێ، ئەگەر نامسوڵمانانیش بێ، هەرباشەو خاوەنەکەی شایستەی سوپاس‌و پێزانینەو، بەپێچەوانەشەوە: سیفەت‌و ئاکاری خراپیش، لەهەرکەسێکەوە بێ، ئەگەر مسوڵمانیش بێ، هەرناپەسندەو پێویستە سەرکۆنەو سەرزەنشت بکرێ.

**دووەم:** پێویستە مسوڵمانان وریابن‌و دڵنیابن کە خوای دادگەر "تبارك وتعالى" مافی ڤیتۆی (Veto)ی بەهیچکەس نەداوە، لەبەرانبەر بەرنامەکەیداو، ناوی (ئیسلام)و (مسوڵمان) ئەگەر هەرناوی بێ نێوەرۆك‌و شیعاری بێ کردار بن، نەك هەر دادیان نادەن‌و شەفاعەتیان بۆناکەن، بەڵکو ئەوە دەبێتە مایەی گوناهباریی دوارۆژو عەیبداریی دنیاشیان،

خـوای کاربـەجێ لـەوبارەوە فەرموویـەتی:﴿ لَّيْسَ بِأَمَانِيِّكُمْ وَلَآ أَمَانِيِّ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ ۗ مَن يَعْمَلْ سُوٓءًا يُجْزَ بِهِۦ وَلَا يَجِدْ لَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿١٢٣﴾ وَمَن يَعْمَلْ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُو۟لَٰٓئِكَ يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ وَلَا يُظْلَمُونَ نَقِيرًا ﴿١٢٤﴾ ﴾النساء.

واتە: نە بەخۆزگەکانی ئێوەو نە بەخۆزگەکانی خاوەن کتێبەکانە: هەرکـەس خراپە بکات پێـی سزادەدرێو، لەبەرانبـەر (سزای) خـوادا هـیچ دۆسـتو پشتیوانێکی چنگ ناکەوێو، هەرکەس لـەکردەوە باشـەکان ئـەنجام بـدات، لـەنێر یـان مـێو، ئـەو بـڕواداریش بـێ، ئـەوە بـەدڵنیاییی ئەوانـە دەچـنە بەهەشتەوەو، هێندەی درزی سەرنێوکە خورماش ستەمیان لێ ناکرێ.

کەواتە:

١)- بـا لەلایەکـەوە: بەناوونیشـانو دروشـمـە زەقو گـەورە بـەرزکراوەکانی ڕێکخراوی (داعش)و، هەر ڕێکخراوو گروپێکی دیکەی پەرگیر (متطرِّف)ی هاوشێوەی وەك: (دەوڵەتی ئیسلامیی، جێبەجێ کردنی شەریعەت، خەلیفـە، بەیداغی "لااله الا الله") چەواشە نـەبینو، نەکەوینـە گومـانو دوودڵییـەوە، چونکە ئەو ناوونیشانو دروشمە گەورانە، ئەگەر لـەڕێی شـەریعەتەوە نـەبنو، خـاوەنو بەرزکـەرەوەکانیان، بەشـێوازی شـەرعییانەو ڕەوشـتو ئـاکـاری بەرزوپەسـند، ڕازاوە نـەبن، مانـای وایـە ڕاسـتگۆییان لەگـەڵ نـەکراوەو، ناوونیشانێکی جوانو نێوەڕۆکێکی وێرانن!

٢)- وە لەلایەکی دیکەشەوە: با هێزە پارێزگارییکارو بەرگرییکارەکانی کوردستانیش، لەخۆیان وریابن‌و، لەکاردانەوەدا، گیرۆدەی سنوورشکێنیی نەبن‌و، خۆیان لەڕشتنی خوێنی ناهەق‌و، خواردنی ماڵی حەڕام‌و، هەر ڕەفتارو هەڵس‌وکەوتێکی دیکەی لەسنووری شەریعەت بەدەر، بپارێزن، چونکە خراپەو تاوان هەر خراپەو تاوانەو، جاری واش هەیە ڕەفتارو هەڵوێستی ناشیرین‌و دزێوی کەسێك یان چەند کەسێك، دەبێتە پەڵەیەکی ڕەش بەسەر خەڵکێکەوە، کە ڕەنگە ئاگاشیان لێ نەبووبێ، بەڵام بەهەرحاڵ مادام لەڕیزەکانی واندایە، هەر لەسەریان حیساب دەکرێ‌و، بەهەموویان باجەکەی دەدەن‌و، بگرە جاری وایە بەسەر کۆی خەڵك‌و وڵات‌و قەوارەکەشیاندا دەشکێتەوە! بۆیە پێویستە بەرپرسان زۆر وریای ئەو جۆرە کەسانەبن، کە ئەو ڕەفتارانەیان لێ دەپشکوێتەوەو دەستیان بگرن.

# دەستپێک

بەڕێزان!

جێی داخ و خەفەتە کە لەم ڕۆژگارەدا، گرووپە پەڕگیرەکان، گەلێك هەڵەو پەڵەو لادان و تاوان لەژێر پەردەی: {جیهاد لەڕێی خوا} (الجِهَاد فِي سَبيل الله)دا دەکەن و، سەرەنجام لەلای خەڵکێکی زۆری سادەو سەرکێڵ، یان نا ئاشنا بەئیسلام، خودی ئیسلام دەکەوێتە ژێر نیشانەی پرسیارەوە، چونکە وادەزانن کە ئەوەی ئەو گرووپ و ڕێکخراوە پەڕگیرو لادەرانە، بەناوی: (جیهاد لەڕێی خوادا) ئەنجامی دەدەن، لەشەریعەتدا ڕێی پێدراوەو ڕەوایە!

بۆیە بە پێویستم زانی لەم ئاڵقەیەدا تیشکێك بخەمە سەر جەنگ و جیهاد، لەئیسلامدا، وەك خوای کاربەجێ و پێغەمبەری داناوزانامان موحەممەد (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) باسیان کردوە، لەقورئان و سوننەتدا.

ئەویش لە حەوت بڕگەدا، کە ئەمانە ناوو نیشانەکانیانن:

١- چەمك و واتای (جهاد)و (قتال) لەئیسلامدا.

٢- هەر کام لە تێپەڕاندن (إفراط)و بەزایەدان (تفريط) لەبارەی جیهادو جەنگەوە، هەڵەن.

٣- پێگەی جیهادو جەنگ لە ئیسلامداو، پاداشتی موجاهیدان.

٤- ئامانجەکانی جیهادو جەنگ لەڕێی خوادا.

٥- حوکمی جیهادو جەنگ.

٦- جیهادو جەنگ ئامرازن، نەك ئامانج.

٧- ڕەوشتەکانی جیهادو جەنگ.

لەکۆتاییدا: وەڵامی پرسیارێکی فەقیرحاڵانە!

## بڕگەی یەکەم: چەمك و واتای (جهاد) و (قتال) لە ئیسلامدا[١]

زۆر کەس پێی وایە هەردووك وشەی (جهاد) و (قتال) یەك چەمكو واتایان هەیە، بەڵام بێگومان ئەوە ڕاست نیە، هەرچەندە هەندێك جاران، وەك زاراوەی شەرعیی لەجیاتی یەكدی بەكار هێنراون:

### ١/ (الجهاد):

وشەی (جهاد) وشەیەكی عەرەبییەو لەبنەڕەتدا لە (جَهَدَ يَجْهَدُ جَهْداً)ەوە هاتوە، كە بەمانای: (جَدَّ وبالغ) دێ، یانی: كارەكەی بە عەزمەوە كردو توانای خۆی تێدا بەكارهێناو، چاوگی (جَهَدَ)، (جَهْد) و (جُهد)ە، كەهەندێك لەزانایان گوتوویانە: یەك واتایان هەیە، بەڵام زۆربەیان گوتوویانە (جَهْد) بەمانای ئەوپەڕ (الغاية)ەو، (جُهْد)یش بەمانای وزەو توانا (الوُسْع والطاقة)یە، وشەی (جهاد)یش چاوگەو لە (جاهَدَ يُجاهِدُ جِهَاداً وَمُجَاهَدَة)ەوە هاتوە، ئنجا (جَاهَدَ) یانی: تواناو هێزی خۆی لەبەرگریی‌و زاڵبووندا بەكارهێنا (بَذَلَ وسْعَهُ في المدافعة والمغالبة)[٢].

(راغب الأصفهاني)یش گوتوویەتی: (الجِهَادُ والمُجَاهَدَةُ: إِسْتِفْرَاغ الوسع في مُدَافَعَةِ العَدو)[٣] یانی: (جِهَاد ومُجَاهَدَة) بەمانای بەكارهێنانی ئەو پەڕی توانایە، لەبەرگریی كردن لەبەرانبەر دوژمندا.

---

[١] - شایانی باسە كە بۆ نووسینی ئەم بابەتە، تاڕاددەیەك سوودم لە (فقه الجهاد)ی (د. يوسف القرضاوي) وەرگرتوە، كە كتێبێكی دوو بەرگییە، لە زیاتر لە هەزارو شەشسەد (١٦٠٠) لاپەڕەدا، خوا پاداشتی بداتەوە.

٢) بڕوانە: معجم ألفاظ القرآن الكريم، ج١ص٢٢٦.

[٣]) بڕوانە: مفردات ألفاظ القرآن، ص ٢٠٩.

## ٢/(القتال):

وشەی (قتال) کە لە (قاتَلَ يقاتِلُ قِتَالاً وَمُقاتَلة)ەوە هاتوەو، ئەویش لە (قَتَل يَقْتُل قَتلاً)ەوە هاتوە، یەك مانای ڕوونی هەیە، کە بریتیە لە یەکدی کوشتن، یان هەوڵدان بۆ یەکدی کوشتنی دوو لایەن یان زیاتر، کە بەکوردیی (جەنگ)و (شەڕ)ی پێدەگوترێ.

کەواتە: وشەی (جهاد) چەمكو واتایەکەی لە هی (قتال) فراوانترەو، ئەگەر سەرنجی قورئانو سوننەتیش بدەین، هەروای دەبینینو، وشەی (جهاد) بۆ هەر کام لە:

یەك: کار لەسەر نەفسی خۆکردن بۆ پاکسازییو چاکسازیی تێدا کردنی.

دوو: بانگەوازو خەباتی فیکرییو ڕاگەیاندن، بۆ گەیاندنی پەیامی ئیسلامو بەرپەرچ دانەوەی ناحەزانی.

سێ: سەرو ماڵ بەخشین لەڕێی خوادا.

بەکارهاتوە، باسەرنجی ئەو ئایەتو فەرموودانە بدەین:

١- ﴿ وَجَٰهِدُواْ فِي ٱللَّهِ حَقَّ جِهَادِهِۦۚ ﴿٧٨﴾ ﴾الحج.

٢-﴿ فَلَا تُطِعِ ٱلۡكَٰفِرِينَ وَجَٰهِدۡهُم بِهِۦ جِهَادٗا كَبِيرٗا ﴿٥٢﴾ ﴾الفرقان.

٣-﴿ ٱنفِرُواْ خِفَافٗا وَثِقَالٗا وَجَٰهِدُواْ بِأَمۡوَٰلِكُمۡ وَأَنفُسِكُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴿٤١﴾ ﴾التوبة

٤ - (**وَالْمُجَاهِدُ مَنْ جَاهَدَ نَفْسَهُ فِي طَاعَةِ اللَّهِ**)[1] واتە: تێکۆشەر کەسێکە لە فەرمانبەریی کردندا بۆ خوا، لەگەڵ خۆیدا تێدەکۆشێ.

---

١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٤٠٠٤)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٤٨٦٢)، وَالطَّبَرَانِيّ برقم: (٧٩٦)، وَالحَاكِمُ برقم: (٢٤)، وَالبَيْهَقِيُّ في "شعب الإيمان" برقم: (١١١٢٣).

٥- (جَاهِدُوا الْمُشْرِكِينَ بِأَمْوَالِكُمْ وَأَيْدِيكُمْ وَأَلْسِنَتِكُمْ)[1] واتە: لە دژی هاوبەشدانەرەکان تێبکۆشن بە: سامانتانو دەستتانو زمانتان.

وەك دەبینین چەمكو واتای وشەی (جهاد) لە هی (قتال) فراوانترە، بەلاّم بێگومان ئەوە لەکاتێکدایە کە وشەی (جهاد) لەئایەتە مەدینەییەکاندا هاتبێ، ئەو کاتە هەموو جۆرە خەباتو تێکۆشانێك دەگرێتەوە:

١)- جیهادی نەفسو ئارەزووەزکانیو شەیتان.

٢)- جیهادی بانگەوازو خەباتی فیکرییو ئیعلامیی.

٣)- جیهادی سەروماڵ فیداکردن.

ئەگەرنا وشەی (جهاد) لە ئایەتە مەککەییەکاندا، بەمانای جەنگو سەروماڵ فیداکردن "کە لەقۆناغی مەدینەدا فەرز بووە" نەهاتوە.

شایانی باسیشە کە دواتر لە قۆناغی مەدینەدا، وشەی (جهاد) بەمانای جەنگو بەخشینی سامانو گیان لەڕێی خوادا، بەکار هاتو، چەمكو واتا مەدینەییەکەی بەسەر چەمكو واتا مەککەییەکەیدا زاڵبوو و، داپۆشی، بۆیە ئێستا زۆر کەس هەردووك وشەی (جهاد)و (قتال) هەر بەمانای جەنگو فیداکاریی بە سەرو ماڵ لەڕێی خوادا، بەکار دێنێ، بۆیەش ئێمە زۆر جار هەردووك وشەکە بەکار دێنیین.

پێویستە بشزانرێ کە لە سوورەتە مەدینەییەکاندا، مەگەر چۆن، دەنا وشەی (جهاد) هەر بەمانای جەنگ (قتال)و بەخشینی گیانو سامان هاتوە.

ئنجا ئەگەر بمانەوێ پێناسەیەکی پوختی وشەی (جهاد) بکەین، دەبێ بڵێین:

---

١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٢٢٦٨)، وَالدَّارِمِيُّ برقم: (٢٤٣١)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٥٠٤)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٣٠٩٦)، وَأَبُو يَعْلَى برقم: (٣٨٧٥)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٤٧٠٨)، وَالحَاكِمُ برقم: (٢٤٢٧) وَقَالَ: صَحِيح عَلَى شَرْطِ مُسْلِم.

{جیهاد بریتیە لەبەکار هێنانی ئەو پەڕی وزەو توانا، لە نیازو مەبەستی دڵو، قسەو دەربڕینی زمانو، کردەوەی ئەندامەکانو، بەخشینی ماڵو سامانو، فیداکردنی گیان، لە پێناوی خواو بەرز ڕاگرتنی ناوی‌و، بەرجەستەکردنی ئایینو بەرنامەکەیدا لە واقیعی ژیاندا}.

## بڕگەی دووەم: هەرکام لە تێپەڕاندن ( إفراط )و بەزایەدان ( تفريط ) لەبارەی جیهادەوە هەڵەن

لەم ڕۆژگارەماندا لەنێو مسوڵمانانندا، لەبارەی جەنگو جیهادەوە، سێ جۆرە بیروڕا هەن:

١- ڕایەکی تێپەڕێنەر (مُفْرِط):

کە پێیوایە لەسەر مسوڵمانان فەڕزە، ئیعلانی جەنگو جیهاد بکەن بەرانبەر هەموو دنیا!

٢- ڕایەکی کورتهێنەر (مُفَرِّط):

کە پێیوایە کە جەنگو جیهاد لەئیسلامدا، بۆتە بەشێك لە کەلەپوورو مێژوو و، نابێ ئێستا هەر باسیش بکرێ، چ جای مومارەسە بکرێ!

کە بێگومان ئەو دوو ڕایە، تاڕاددەیەکی زۆر وەك کارو کاردانەوە (فعل و رد الفعل) لەژێر کاریگەریی یەکدی دان.

٣- ڕایەکی میانجیی (وسَطْ):

کە دەڵێ: پێویستە جەنگو جیهاد، دوور لەکاردانەوەو عاتیفە بۆی بڕوانینو، ئەوکاتەش دەزانین کە ئیسلام نەفەرمان بەمسوڵمانان دەکات، کە دژی هەموو دنیا جیهاد ڕابگەیەننو، نەپێشیان دەڵێ: لەم دنیایەدا پاساوی جەنگو جیهاد نەماوەو، نابێ جیهاد دژی هیچ کەس بکرێ، تەنانەت ڕژێمی زایۆنییو، ئەو ڕژێمانەش کە بەئاشکرا لەوڵاتانی مسوڵمانانندا، بانگەشەی کوفرو ئیلحاد دەکەنو، دژایەتیی ئیسلامو مسوڵمانان دەکەن!

بەڵکو بەسەرنجدانی قورئانو سوننەت، دڵنیا دەبین کە جەنگو جیهاد لەئیسلامدا "هەتا مسوڵمانان ستەمیان لەسەربێو، بشتوانن بەرگریی بکەن" هەر

بەردەوامەو، بەڵگەو نیشانەی زیندوێتیی مسوڵمانانیشە، بەڵام پێویستە لێزانانەو دووربینانەو وردبینانەو لەکاتو شوێنی خۆیداو، لەلایەن کەسانی پسپۆڕو شارەزا لەدینو ژینـدا، بڕیاری لەسەر بدرێو بکرێ، نەك بەهەڵەشەیی‌و بەبێ بەرچاو ڕوونیی‌و، بەشێوەیەکی سەرکێڵانەو دڵگەرمانەو کەس بەکەسیی، وەك بەداخەوە لەم ڕۆژگارەماندا، بەزۆریی هەروابووە، بۆیەش مەگەر چۆن، دەنا مسوڵمانان هەر لەسەری قەرزدار بوونەوەو، کارەکە بنەتۆوی خۆی نەکردۆتەوە.

لەبڕگەی سێیەمیشدا تیشکی زیاتر دەخەینە گرنگیی‌و پێویستیی جەنگو جیهاد.

## بڕگەی سێیەم: پێگەی جەنگ و جیهاد لەئیسلامدا و پاداشتی جەنگاوەران و موجاهیدان

ئایەت و فەرموودە لەبارەی پلەوپایەو پێگەی جیهادەوە زۆر زۆرن، بەڵام ئێمە تەنیا وەك نموونە، هەندێکیان لێ باس دەکەین:

١/ ﴿لَّا يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُولِي الضَّرَرِ وَالْمُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ ۚ فَضَّلَ اللَّهُ الْمُجَاهِدِينَ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ عَلَى الْقَاعِدِينَ دَرَجَةً ۚ وَكُلًّا وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَىٰ ۚ وَفَضَّلَ اللَّهُ الْمُجَاهِدِينَ عَلَى الْقَاعِدِينَ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٩٥﴾ دَرَجَاتٍ مِّنْهُ وَمَغْفِرَةً وَرَحْمَةً ۚ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٩٦﴾﴾النساء.

واتە: بڕوادارانی دانیشتووی بێ مەزەڕەت، لەگەڵ تێکۆشەران لەڕێی خوادا بەسامان و گیانیان، یەکسان نین، خوا تێکۆشەران بەسامان و گیانیانی بەسەر دانیشتوواندا، بەپلەیەك بەرز کردۆتەوەو، خوا گفتی باشی بەهەموویانداوە، بەڵام خوا بەپاداشتێکی مەزن موجاهیدانی بەسەر دانیشتوواندا، بەرز کردۆتەوە، چەندان پلە لەخواوەو، لێبوردن و بەزەییەکی تایبەت و، خوا لێبوردەی بەبەزەیی یە.

٢/ ﴿أَجَعَلْتُمْ سِقَايَةَ الْحَاجِّ وَعِمَارَةَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ كَمَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَجَاهَدَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ۚ لَا يَسْتَوُونَ عِندَ اللَّهِ ۗ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ ﴿١٩﴾ الَّذِينَ آمَنُوا وَهَاجَرُوا وَجَاهَدُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ أَعْظَمُ دَرَجَةً عِندَ اللَّهِ ۚ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْفَائِزُونَ ﴿٢٠﴾ يُبَشِّرُهُمْ رَبُّهُم بِرَحْمَةٍ مِّنْهُ وَرِضْوَانٍ وَجَنَّاتٍ

لَهُمۡ فِيهَا نَعِيمٌ مُّقِيمٌ ﴿٢١﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًاۚ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥٓ أَجۡرٌ عَظِيمٌ ﴿٢٢﴾ ﴾التوبة.

واتە: ئایا (هەڵسان بە) ئاودان بەحاجییانو خزمەتی مزگەوتی حەرامتان، وەك (کاری) ئەو کەسە دانا، کە بڕوای بەخواو بەڕۆژی دوایی هێناوەو، لەڕێی خوادا جیهادی کردوە؟ لەلای خوا یەکسان نین، خواش ڕێڕوونیی کۆمەڵی ستەمکاران ناکات، ئەوانەی بڕوایان هێناوەو، کۆچیان کردوەو جیهادیان لەڕێی خوا بەسامانو گیانیان کردوە، پلەیان لەلای خوا مەزنترە، هەر ئەوانەش سەرفرازن، پەروەردگاریان موژدەی بەزەییو ڕەزامەندیی خۆییان پێدەدا، هەروەها چەند بەهەشتێك کە نازو نیعمەتێکی بەردەوامیان تێیاندا هەیە، بەهەمیشەیی تێیاندا دەمێننەوە، بەڕاستی خوا پاداشتی مەزنی لەلایە.

٣/ (**أَلا أُخْبِرُكم بِرَأْسِ الأَمْرِ وَعَمُودِهِ وَذُرْوَةِ سَنَامِهِ؟ رَأْسُ الأَمْرِ الإِسلام، وَعَمُودُهُ الصَّلاةُ، وَذِرْوَةُ سَنَامِهِ الْجِهَادُ**)[١].

واتە: ئایە هەواڵتان پێبدەم بەسەری ئایینو، کۆڵەکەکەیو، لووتکەکەی؟ سەری ئایین ملکەچییە (بۆ خوا)و، کۆڵەکەکەی نوێژەو، لووتکە بەرزەکەی جیهاد لەڕێی خوادایە.

٤/ (**عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَيُّ الْعَمَلِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: «الصَّلاَةُ لِوَقْتِهَا»، قَالَ: قُلْتُ ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: «بِرُّ الْوَالِدَيْنِ»، قَالَ: قُلْتُ ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: «الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ»**)[٢].

---

١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٢٠٦٩)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٦١٦)، وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيح، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٩٧٣)، وَالحَاكِمُ برقم: (٣٥٤٨)، وَقَالَ: صَحِيح عَلَى شَرْطِ الشَّيْخَين، وَالبَيْهَقِي في "شعب الإيمان" برقم: (٤٢٢٥).
٢) أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٥٠٤)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٦٢) وغيرهما.

واتە: لە پێغەمبەری خوامﷺ پرسی: چ کردەوەیەك باشترە؟ فەرمووی: نوێژ لە کاتەکانی خۆیدا، گوتم: ئەدی دوای ئەوە کامە؟ فەرمووی: چاکە لەگەڵ باب‌و دایك دا، گوتم: ئەدی دوای ئەمە کامە؟ فەرمووی: جیهاد لە ڕێی خوادا.

**٥/ (عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ، قَالَ قِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَيُّ الْمُؤْمِنِينَ أَفْضَلُ؟ قَالَ: مُؤْمِنٌ مُجَاهِدٌ فِي سَبِيلِ اللهِ بِنَفْسِهِ وَمَالِهِ)**[1].

واتە: گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا! کام لە بڕواداران (لە هەموویان) باشترە؟ فەرمووی: بڕوادارێکی موجاهید بەگیان‌و سامانی لە پێناوی خوادا.

هەڵبەتە هەر لەبەر تیشکی ئەو ئایەت‌و فەرموودانەشدا بووە، کە زۆربەی هەرە زۆری زانایان گوتوویانە: پاش فەرزە تایبەتییەکان (الفرائض العينية) جەنگ‌و جیهاد لەڕێی خوادا، چاکترین‌و گەورەترین جۆری تاعەتە: بۆ نموونە: (أحمد بن حنبل) گوتوویەتی: (لاأعلم شيئاً من العَملِ بعد الفرائض أفضل من الجهاد)[2].

واتە: پێم شك نایەت پاش پێنج نوێژە فەرزەکان، هیچ کردەوەیەك لەجیهاد باشتر بێ.



١) أَخْرَجَهُ إِبْنُ أَبِي شَيْبَة برقم: (١٩٨٣٦)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٢٧٨٦)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٨٨٨).
٢) بڕوانە: المغني، ج١٣، ص١٠.

## بڕگەی چوارەم: ئامانجەکانی جیهادو جەنگ لەڕێی خوادا

ئیسلام پێنج ئامانجی سەرەکیی دیاریی کردوون بۆ ئەنجامدانی جەنگو جیهادو، جگە لەو پێنج ئامانجە، دروست نیە مسوڵمانان بۆ هیچ ئامانجو مەبەستێکی دیکە، پەنا بۆ چەكو هێز ببەن:

## یەك: بەرپەرچدانەوەی دەستدرێژیی:

هەرکات دەستدرێژیی کرایە سەر مسوڵمانان، لە ڕووی ئایین، یان لەڕووی ژیانیانەوە، نەك هەر بۆیان هەیە، بگرە لەسەریشیان پێویستە، بەرپەرچی بدەنەوەو لەبەرانبەریدا دەستەو ئەژنۆ دانەنیشن، وەك خوای دادگەر فەرموویەتی:

١/ ﴿ وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمۡ وَلَا تَعۡتَدُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ١٩٠ ﴾البقرة.

واتە: لەڕێی خوادا، دژی ئەوانە بجەنگن، کە لەدژتان دەجەنگنو، دەستدرێژیی مەکەن، بێگومان خوا دەستدرێژکارانی خۆشناوێن.

**٢/** ﴿ فَمَنِ ٱعۡتَدَىٰ عَلَيۡكُمۡ فَٱعۡتَدُواْ عَلَيۡهِ بِمِثۡلِ مَا ٱعۡتَدَىٰ عَلَيۡكُمۡۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلۡمُتَّقِينَ ١٩٤ ﴾البقرة.

واتە: ئنجا هەر کەس دەستدرێژیی کردنە سەر، وەك دەستدرێژییەکەی خۆی، دەستدرێژیی بکەنەوە سەر (بەرپەرچی بدەنەوە) پارێزیش لە خوا بکەنو، بزانن کە خوا لەگەڵ پارێزکاران دایە.

## دوو: دەستەبەر کردنی ئازادیی بانگەواز:

وەك خوای کاربەجێ فەرموویەتی: ﴿ وَقَٰتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ لِلَّهِ ۖ فَإِنِ ٱنتَهَوْا۟ فَلَا عُدْوَٰنَ إِلَّا عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٩٣﴾ ﴾البقرة.

واتە: لەدژیان بجەنگن، هەتا ئازارو ئەشکەنجەدان "ی کافران بۆ بڕواداران" نامێنێو، ملکەچیی تەنیا بۆ خوا دەبێ، ئنجا هەرکات وازیان هێنا (لەسزادانو ئازاردانی بڕواداران بۆ هەڵگێڕانەوەیان لە ئیسلام) ئەوە دەستدرێژیی (واتە: بەکار هێنانی هێز) تەنیا بۆ سەر ستەمکارانە.

یانی: ئیسلام ڕێ نادات بەبەکارهێنانی هێزو جەنگ کردن، مەگەر دژی ئەو ستەمکارانەی، کە ڕێی دینداریی ئازادانە لە خەڵك دەگرن.

کەواتە: قەوارەی ئیسلامیی "ئەگەر بتوانێ" دەبێ ڕێ نەدات هیچ قەوارەیەکی سیاسیی ڕێی بڕواهێنانو هاتنە نێو ئیسلام لە خەڵك بگرێ، کە ئەوە مانای (فتنة)[1]یە، بەڵام بەمەرجێك ئەو قەوارە سیاسییە، هاوپەیمان نەبێ لەگەڵ دەوڵەتی ئیسلامییدا، چونکە لەوحاڵەتەدا دروست نیە پەیمان بشکێنێو، پشتی ئەو بڕوادارە ئازار دراوو ڕێی دینداریی لێگیراونە بگرێ، وەك خوای دادگەر فەرموویەتی: ﴿ وَإِنِ ٱسْتَنصَرُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ فَعَلَيْكُمُ ٱلنَّصْرُ إِلَّا عَلَىٰ قَوْمٍۭ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَٰقٌ ۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٧٢﴾ ﴾الأنفال.

واتە: هەرکات بڕواداران داوای کۆمەکییان لێتان کرد، کە لەسەر ئایین ستەمیان لێدەکرا، ئەوە پێویستە پشتیان بگرن، مەگەر دژی کۆمەڵێك کە لەنێوان ئێوەو ئەواندا پەیمان هەبێ، خواش بینەری ئەوەیە کە دەیکەن.

---

١) واتە: لێرە لەم سیاقەدا، ئەگەرنا (فتنە) مانای دیکەشی هەن.

دیارە لەم ڕۆژگارەشدا بەهۆی بەرەو پێشچوونی تەکنۆلۆژیای ڕاگەیاندنەوە، تاڕاددەیەکی زۆر کێشەو گرفتی گەیاندنی پەیامی خوا بەجیهانییان، چارەسەرکراوەو، ئێستا بۆ خەڵك شارەزا کردن لەئیسلام، هیچ پەك لەسەر سوپای ئیسلام، نەکەوتوە، بۆ لابردنی کۆسپو لەمپەرەکانی سەر ڕێی بانگەواز (إزالة العقبات عن طريق الدعوة)، تەنیا مەسەلەی بەرگریی کردن لەبڕوادارانی چەوسێنراوە، لەلایەن ڕژێمە کافرو چەوسێنەرەکانەوە ماوەتەوە، ئەویش بەمەرجی نەبوونی پەیمان لەنێوان دەوڵەتی ئیسلامیی‌و ئەو قەوارە ستەمکارەدا، کەپێم وایە بەشداربوون لەڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان (منظمة الأمم المتحدة)دا، لەم ڕۆژگارەدا ئەو پەیمانە دەگەیەنێ!

## سێ: دەرباز کردنی چەوساوان لەچنگی ستەمکاران:

وەك خوای زاناوتوانا فەرموویەتی:﴿ وَمَا لَكُمْ لَا تُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ وَالْوِلْدَانِ الَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا أَخْرِجْنَا مِنْ هَٰذِهِ الْقَرْيَةِ الظَّالِمِ أَهْلُهَا وَاجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا وَاجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ نَصِيرًا ﴿٧٥﴾ ﴾النساء.

واتە: ئەوە چیتانە! لەپێناوی خواو (دەربازکردنی) چەوسێنراواندا ناجەنگن، لەپیاوان‌و ئافرەتان‌و منداڵان، ئەوانەی دەڵێن: پەروەردگارمان! لەم ئاوەدانییە قوتارمان بکە، کە خەڵکەکەی ستەمکارن‌و، لەلایەن خۆتەوە سەرپەرشتیارێکمان بۆ بڕەخسێنەو، لە لایەن خۆتەوە پشتیوانێکمان بۆبنێرە.

بەسەرنجدانی ئایەتەکەش بەڕوونیی دیارە کە ئەو چەوسێنراوەو بێچارەو دەرەتانانە، مسوڵمان بن یان نامسوڵمان، هەر پێویستە دەوڵەتی ئیسلامیی، هەوڵی ڕزگارکردن‌و دەرهێنانیان لەژێر نیری ستەمکاران بدات، بەڵام دیارە ئەگەر

لە توانایدا هەبێ‌و هیچ پەرچ (مانع)ێك لەبەر دەمیدا نەبێ، چونكە ئەو كاتە: ﴿لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَا ﴿٢٨٦﴾﴾البقرة.

واتە: خوا جگە لەوەی لەتوانای دایە، لە هیچكەس داوا ناكات.

## چوار: تەمبێ كردنی پەیمان شكێنان:

وەك خوای بالاً دەست‌و توانا فەرموویەتی:﴿ٱلَّذِينَ عَٰهَدتَّ مِنۡهُمۡ ثُمَّ يَنقُضُونَ عَهۡدَهُمۡ فِي كُلِّ مَرَّةٖ وَهُمۡ لَا يَتَّقُونَ ﴿٥٦﴾ فَإِمَّا تَثۡقَفَنَّهُمۡ فِي ٱلۡحَرۡبِ فَشَرِّدۡ بِهِم مَّنۡ خَلۡفَهُمۡ لَعَلَّهُمۡ يَذَّكَّرُونَ ﴿٥٧﴾﴾الأنفال.

واتە: ئەوانەی پەیمانت لەگەڵ بەستوون، دوایی هەموو جارێ پەیمانەكەیان هەڵدەوەشێننەوەو، پارێز ناكەن (لەشكاندنی پەیمان) ئنجا هەركات لەجەنگدا بەرپەلت كەوتن (زەبری وایان لێ بدە) ئەوانەی لە پشتیشیانەوەن، پرژو بلاویان بكە، بەڵكو پەند وەربگرن.

هەڵبەتە هەرلێرەشەوە لەو سزادانەی پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) بۆ هۆزی (بنو قريظة)ی جوولەكە تێدەگەین، وەك لەم دەقەی سوننەتەوە دیارە:

**(عَنِ ابْنِ عُمَرَ أَنَّ يَهُودَ بَنِى النَّضِيرِ وَقُرَيْظَةَ حَارَبُوا رَسُولَ اللهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فَأَجْلَى رَسُولُ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) بَنِي النَّضِيرِ، وَأَقَرَّ قُرَيْظَةَ وَمَنَّ عَلَيْهِمْ، حَتَّى حَارَبَتْ قُرَيْظَةُ بَعْدَ ذَلِكَ، فَقَتَلَ رِجَالَهُمْ وَقَسَمَ نِسَاءَهُمْ وَأَوْلاَدَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ بَيْنَ الْمُسْلِمِينَ، إِلاَّ بَعْضَهُمْ لَحِقُوا بِرَسُولِ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فَأَمَّنَهُمْ وَأَسْلَمُوا)**.

واتە: هەردووك هۆزی جوولەكەی (بني النَّضير وقريظة) جەنگیان لەدژی پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) كرد، ئنجا پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ

وَسَلَّمَ) (بني النَّضير)ی دەرکردو، چاکەی لەگەڵ (بني قريظة)دا کردو هێشتنیەوە، هەتا دوایی جارێکی دیکە (قريظة) جەنگیان (لەدژی ئیسلام) کرد، ئیدی ئەویش پیاوەکانیانی کوشتن‌و، ئافرەت‌و منداڵەکان‌و ماڵ‌و سامانیشیانی بەسەر مسوڵماناندا دابەشکرد، جگە لە هەندێکیان کە چوونە لای پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ)و ئەویش پەنایدان‌و، مسوڵمان بوون.

کەواتە: ئەو سزادانەی پێغەمبەر (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) بۆ هۆزی (بني قريظة)ی جوولەکە، لەسەر ئەوە بووە کە دووجاران پەیمانیان شکاندوەو، لەپشتەوەڕا خەنجەری غەدریان لە مسوڵمانان داناوەو، بەزاراوەی سیاسیی ئەمڕۆ خیانەتی مەزن (الخيانة العظمى)یان لێ دەرکەوتوەو، سزای ئەوەش مەرگە!

## پێنج: جێگیرکردنی ئاشتیی نێو خۆیی:

دیارە ئەمجۆرە جەنگە دژی نامسوڵمانان نیە، بەڵکو لەنێو بازنەی ئەهلی ئیسلامدایەو، ئامانج لێی کۆتایی پێهێنانی ناکۆکیی‌و شەڕی نێوانیانە، وەك خوا "عز وجل" فەرموویەتی:﴿ وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱقْتَتَلُوا۟ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَهُمَا ۖ فَإِنۢ بَغَتْ إِحْدَىٰهُمَا عَلَى ٱلْأُخْرَىٰ فَقَـٰتِلُوا۟ ٱلَّتِى تَبْغِى حَتَّىٰ تَفِىٓءَ إِلَىٰٓ أَمْرِ ٱللَّهِ ۚ فَإِن فَآءَتْ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَهُمَا بِٱلْعَدْلِ وَأَقْسِطُوٓا۟ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٩﴾ ﴾الحجرات.

واتە: هەرکات دوو کۆمەڵ لە بڕواداران دژی یەکدی جەنگیان کرد، ئێوە صوڵحیان لەنێوان دابکەن، ئنجا ئەگەر یەکیان ستەمی لەوی دیکە کرد، لەدژی ئەوەیان بجەنگن کە ستەم دەکات، هەتا دەگەڕێتەوە بۆ ژێر فەرمانی خوا، ئنجا هەر کات گەڕایەوە، دادگەرانە صوڵحیان لەنێوان بکەن‌و، دادگەربن، بێگومان خوا دادگەرانی خۆشدەوێ.

پێغەمبەری خواش (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّم) لەو بارەوە فەرموویەتی: (**«انْصُرْ أَخَاكَ ظَالِمًا؟! أَوْ مَظْلُومًا »، قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ نَصَرْتُهُ مَظْلُوماً؟ فَكَيْفَ أَنْصُرُهُ ظَالِمًا قَالَ: «تَمْنَعُهُ مِنَ الظُّلْمِ فَذَلِكَ نَصْرُكَ إِيَّاهُ»**)[١].

واتە: برایەکەت سەربخە ستەمکاربێ، یان ستەملێکراو، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر ستەملێکراوبێ سەری دەخەین، بەڵام ئەگەر ستەمکار بێ چۆن سەری بخەین؟! فەرمووی: مەهێڵە ستەم بکات، ئەوە سەرخستنیەتی.

بەڵێ: بەرێزان ئەوپێنجە ئامانجەکانی جەنگو جیهادن لەرێی خوادا لەشەریعەتی ئیسلامدا، کە بێگومان هیچ خاوەن عەقڵێکی بەویژدان (عاقل مُنْصِف) ناتوانێ رەخنە لە هیچ کامیان بگرێو، بڵێ: نەدەبووایە ببێ!

ماوەتەوە بڵێین:

جەنگو جیهاد لەئیسلامدا لە ئەسڵدا، ئەرکی قەوارەی سیاسییو دەوڵەتەو، دروست نیە هەرکەسو لایەنو گرووپێك راست بۆوە، بریاری لەسەر بداتو پێی هەڵسێ، بەڵام بێگومان کاتێك مسوڵمانان دەوڵەتو قەوارەی سیاسییان نابێ، مانای وانیە جەنگو جیهاد کۆتایی پێدێ، بەڵکو هەردەمێنێ، بەڵام بەدڵنیایی بۆ بریار لەسەردانیو نەخشە بۆکێشانیو ئەنجامدانی، پێویستە مشوور خۆرو چاوساغو قسەبەدەستانی مسوڵمانان "لەو شوێنەدا" پاش لێکۆڵینەوەی وردو قووڵو تێفکرینو راوێژ، ئەو جار دەست بەکار بن.

پێغەمبەری خواش (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّم) لەبارەی بەردەوامیی جەنگو جیهادەوە، لەنێو ئۆممەتدا، فەرموویەتی: (**لَنْ يَبْرَحَ هَذَا الدِّينُ قَائِماً، يُقَاتِلُ عَلَيْهِ عِصَابَةٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ، حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ**)[٢].

---

١) أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٢٥٨٤)، وغيره.

٢) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٠٩٨٥) وَمُسْلِمٌ برقم: (١٩٢٢)، عَنْ جَابِر بْن سَمُرة.

واتــە: بــەردەوام ئــەم ئايينــە ڕاوەســتاو دەبــێ هــەتا قيامــەت دێ، كۆمــەڵێك لەمسوڵمانان لەسەری دەجنگن (بەرگریی لە خەڵكەكەی دەكەن).

## بڕگەی پێنجەم: حوکمی جیهادو جەنگ‌و جۆرەکانی:

### أ-حوکمی جەنگ‌و جیهاد:

زۆربەو جەماوەری زانایان ڕایان وایە، کە جیهادو جەنگ فەڕزی کیفایە (فرض الكفاية)یە، واتە: ئەگەر ژمارەیەکی وا لەمسوڵمانان پێی هەڵسان کە پێیان ئەنجام بدرێ، گوناه لەسەر هەموویان لادەچێ، ئەگەرنا هەموویان گوناهبارن.

هەندێکیشیان ڕایان وایە کە فەڕزی عەین (فرض العين)ە، واتە لەسەر یەك یەکی مسوڵمانانی خاوەن توانا پێویستە پێی هەڵسن، ئەگەرنا گوناهبارن، بەلاّم بێگومان هەرکام لەئایەتی (٩٥)ی (النساء) کەپێشتریش هێنامانو، ماناشمان کردو ،ئەمەش دەقەکەیەتی:

﴿ لَّا يَسْتَوِي ٱلْقَٰعِدُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُوْلِي ٱلضَّرَرِ وَٱلْمُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْۚ فَضَّلَ ٱللَّهُ ٱلْمُجَٰهِدِينَ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ عَلَى ٱلْقَٰعِدِينَ دَرَجَةًۚ وَكُلًّا وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْحُسْنَىٰۚ وَفَضَّلَ ٱللَّهُ ٱلْمُجَٰهِدِينَ عَلَى ٱلْقَٰعِدِينَ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٩٥﴾ ﴾، وە ئایەتی ژمارە (١٢٢)ی (التوبة) کە ئەمە دەقەکەیەتی: ﴿ وَمَا كَانَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُواْ كَآفَّةًۚ فَلَوْلَا نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ طَآئِفَةٌ لِّيَتَفَقَّهُواْ فِي ٱلدِّينِ وَلِيُنذِرُواْ قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوٓاْ إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ ﴿١٢٢﴾ ﴾.

واتە: بڕواداران بۆیان نیە تێکڕاو هەموویان بچنە جەنگ، دەبووایە لەهەر کۆمەڵێکیان دەستەیەك بڕۆن، تاکو لەئاییندا شارەزابنو، هەرکات گەڕانەوە لای کۆمەڵەکەیان، ئاگاداریان بکەنەوە، بەڵکو وریابن.

بەڵێ، هەر کام لەم دوو ئایەتە بە تەنیا، چ جای هەردووکیان پێکەوە بەڵگەیە لەسەر ڕاستیی ڕای جەماوەرو زۆربەی زانایان.

ئنجا تێکڕای زانایانیش لەسەر ئەوە کۆکن، کە لەچوار حاڵاندا جیهاد دەبێتە فەرزی عەین:

## ١)- لەکاتی هێرشو پەلاماری دوژمندا بۆسەر وڵاتێکی مسوڵمان:

بەڵگەش لەوبارەوە زۆرن، یەکێکیان ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) لەجەنگی خەندق (غـزوة الخنـدق)دا، کە کافرەکان هێرشیان کردە سەر مەدینەو ئابڵووقەیاندا، مۆڵەتی کەسی نەدا، کە جیهاد نەکاتو، خواش سەرزەنشتی ئەوانەی کرد کە بەبیانووی جۆراوجۆر، دەیانویست مەیدان چۆڵ بکەن، وەك فەرموویەتی: ﴿ وَإِذْ قَالَت طَّآئِفَةٌ مِّنْهُمْ يَـٰٓأَهْلَ يَثْرِبَ لَا مُقَامَ لَكُمْ فَٱرْجِعُوا۟ ۚ وَيَسْتَـْٔذِنُ فَرِيقٌ مِّنْهُمُ ٱلنَّبِىَّ يَقُولُونَ إِنَّ بُيُوتَنَا عَوْرَةٌ وَمَا هِىَ بِعَوْرَةٍ ۖ إِن يُرِيدُونَ إِلَّا فِرَارًا ﴿١٣﴾ ﴾الأحزاب.

## ٢)- لەکاتی فەرمان کردنی حوکمڕاندا بەکەسێك یان کۆمەڵێك دیاریکراو:

وەك خوای "عز وجل" فەرموویەتی:﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَا لَكُمْ إِذَا قِيلَ لَكُمُ ٱنفِرُواْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱثَّاقَلْتُمْ إِلَى ٱلْأَرْضِ ۚ أَرَضِيتُم بِٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا مِنَ ٱلْـَٔاخِرَةِ ۚ فَمَا مَتَـٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ إِلَّا قَلِيلٌ ﴿٣٨﴾ ﴾التوبة.

(الكمال بن الهُمام)یش لەو بارەوە گوتوویەتی: (يصيرالجهاد من فروض الأعيان، سواء كان المُسْتَنْفِرُ عَدْلاً أو فاسقاً، فيجب على جميع أهل تلك البلدة، النَّفْرَةُ..)[1]

واتە: لەوحاڵەتەدا جیهاد دەبێتە فەرز لەسەر یەك یەکیان، یەکسانە بابای دەنگدەر بۆجەنگ، دادگەر بێ یان لادەر، لەسەر تێکڕای خەڵکی ئەو شوێنە فەرزە دەربچن بۆ جیهاد.

## ٣)- لەکاتی پێویستیی هەبوونی سوپای مسوڵماناندا بەشارەزایی کەسێکی دیاریکراو:

دەشگونجێ زۆر بەڵگان لەسەر ئەم حاڵەتەش بێنینەوە، بۆ وێنە پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فەرموویەتی: (المُسْلِمُ أَخُو المُسْلِمِ، لاَ يَظْلِمُهُ، وَلاَ يُسْلِمُهُ)[2]، واتە: مسوڵمان برای مسوڵمانە، نە ستەمی لێدەکاتو نە پشتی بەردەدات لە تەنگانەدا.

---

١) شرح فتح القدير، ج٤ ص٢٨٠، ٢٨٤.

٢_ أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٤٤٢)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٥٨٠).

## ٤)- لەکاتی ئامادەبوونی جەنگدا:

چونکه خوا "سبحانه وتعالى" فەرموویەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ زَحْفٗا فَلَا تُوَلُّوهُمُ ٱلۡأَدۡبَارَ ١٥ وَمَن يُوَلِّهِمۡ يَوۡمَئِذٖ دُبُرَهُۥٓ إِلَّا مُتَحَرِّفٗا لِّقِتَالٍ أَوۡ مُتَحَيِّزًا إِلَىٰ فِئَةٖ فَقَدۡ بَآءَ بِغَضَبٖ مِّنَ ٱللَّهِ وَمَأۡوَىٰهُ جَهَنَّمُۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ ١٦ ﴾الأنفال.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! هەرکات بەرەنگاری هێرشی بێبڕوایان بوونەوە، پاشیان تێ مەکەنو، هەرکەس لەئێوە لەوڕۆژەدا پشتیان تێ بکات، مەگەر وەك تاکێکی جەنگ، یان پەیوەستبوون بەکۆمەڵێکی دیکەی جەنگاوەرەوە، ئەگەرنا تووڕەیی خوای پێبڕاوەو، جێگای دۆزەخەو، ئەوەش خراپترین سەرەنجامە.

## ب - جۆرەکانی جەنگ‌و جیهاد:

لەبارەی جۆرەکانیشیەوە، هەربەکورتی دەڵێین: لەڕاستیدا دابەشکردنی (جەنگ‌و جیهاد) بۆ هەردووك جۆری: بەرگریی کردن (الدِّفاع)و بەدواکەوتن (الطَّلَب) هەڵقوڵاوی ئیجتیهادو بۆچوونی زانایانەو، دووزاراوەی بەکارهێنراوی قورئان‌و سوننەت نین.

ئەوە لەلایەکەوەو، لەلایەکی دیکەشەوە: پابەند (مُلْزَم) بوونی دەوڵەتی ئیسلامیی کە دەبێ ساڵانە جارێك جەنگ بکات! دیسان ڕای زانایانەو، پەیوەندیی هەبووە بەو واقیعە سیاسییەوە، کەکاتی خۆی دەوڵەتی ئیسلامیی بەتایبەت‌و، سەرجەم دەوڵەتانی دنیا بەگشتی تێیدا ژیاون، کە هەرکام بەهێزتربووبێ، کەڵکەکەڵەی خستنە ژێر ڕکێفی خۆی، ئەوانی دیکەی کەوتۆتە کەللەوە، وەك گوتراوە: (ومَنْ لم يَظْلِم الناس يُظلم)، ئنجا ئەو کاتە پەیماننامە (میثاق)یەکیش نەبووە "وەك ئەوەی ئێستا هەیە، لە پەیماننامە (میثاق)ی نەتەوەیەکگرتووەکاندا" کەنابێ هیچ دەوڵەتێك هێرش بکاتە سەر ئەوی دیکە.

ئەگەرنا مادام بناغە لەپەیوەندیی نێوان مسوڵمانان‌و نامسوڵماناندا، ئاشتیی (سِلْم) بێ.

وەك ئایەتەکانی قورئان بەڕوونیی دەیگەیەنن، بۆنموونە:

١. ﴿ وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمۡ وَلَا تَعۡتَدُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ١٩٠ ﴾البقرة.

٢. ﴿ وَإِن جَنَحُواْ لِلسَّلۡمِ فَٱجۡنَحۡ لَهَا وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ٦١ ﴾الأنفال.

٣. ﴿ لَّا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓا۟ إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٨﴾ ﴾الممتحنة

بەڵێ مادام ئەسڵو بناغەی ئاشتیی بێ، لەپەیوەندیی نێوان دەوڵەتی ئیسلامییو دەوڵەتانی دیکەداو، ئیسلامیش بەسروشت خوازیاری صولحو ئاشتیی بێو، دژی جەنگو ئاژاوە بێ، بەهیچ جۆرێك ناگونجێ: قەوارەی ئیسلامیی هەمیشە قەوارە سیاسیەکانی دیکە بخاتە حاڵەتی ئاگادار کرانەوە (إنذار)ەوەو، هەرکامیان دەستی لەسەر دڵی بێ، داخۆ ئەمساڵ نۆرەی کامیانە، دەوڵەتی ئیسلامیی هێرشی بکاتە سەر!! ئنجا ئاشکراشە لەحاڵێکی وادا دەوڵەتەکان گەلەکۆمەکێی لەدژ دەکەنو، بەرلەوەی بیانکاتە خواردنی ئێوارە، دەیکەنە خواردنی نیو ڕۆژ! (يَتَغَدَّوْن بها، قبل أن تَتَعشَّى بهم)!!

## بڕگەی شەشەم: جیهادو جەنگ ئامڕازە، نەك ئامانج

ئـەمیش ڕاسـتییەکی ڕوونو ئاشـکرایەو، دەشـتوانین زۆر بـەڵگانی لەسـەر بێنینەوە، بەڵام ئەم ئایەتە موبارەکە بەسە بۆ ئەو مەبەستە:

﴿ وَرَدَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِغَيۡظِهِمۡ لَمۡ يَنَالُواْ خَيۡرٗاۚ وَكَفَى ٱللَّهُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٱلۡقِتَالَۚ وَكَانَ ٱللَّهُ قَوِيًّا عَزِيزٗا ﴿٢٥﴾ ﴾الأحزاب.

کە دەربارەی کۆتـایی پێهـاتنی ئابڵوقـەی کافرەکانـە لەجـەنگی ئەحزابدا، لـە دەوری شاری مەدینە بەبێ ڕوودانی جەنگو کوشتار.

واتــە: خـوا ئەوانــەی بێــبڕوا بــوون، بــەبێ مرادیــیو بــەڕقو داخــی زۆرەوە بەرپەرچدایەوەو، هیچیان بەردەست نەبوو،وەخوا جەنگی لـەکۆڵ بـڕواداران کـردەوە، وەخوا بەهێزی زاڵە.

وەك دەبینین خوای بەخشەر کۆتایی پێهێنانی جەنگی خەندەکی بـەبێ کوشـتار، بەنیعمەتی خـۆی دانـاوە لەسـەر بـڕواداران، یـانی: جـەنگو کوشـتار لەئیسـلامدا، شتێکی ویستراو (مرغوب فیه) نیەو، بەناچاریی پەنای پێ دەبرێ، کەواتـە: ئـامڕاز (وسیلة)ە، نەك ئامانج (هدف)!

## ئایەتێكو دوو دەقی سوننەتی مشتو مڕ هەڵگر، لەبارەی جەنگو جیهادەوە:

ئەوانەی کە زێدە ڕۆیی دەکەن لەبارەی جەنگو جیهـادەوەو، زیـاتر وەك ئامـانج (هـدف) ئەماشـای دەکـەن، نـەك ئـامڕاز، چـەند دەقێکـی شـەریعەت بـە بەڵگـەی ڕاستیی بۆچوونەکەیان دێننەوە، کە باوترینیان ئایەتێکە ناویان ناوە: ئایەتی شمشـێر

(آية السَّيف)، هەروەها دوو دەقی سوننەتن، ئنجا بەپێویستم زانی تیشکێك بخەینە سەر ئەو سێ دەقەو، چەمكو واتای ڕاستەقینەیان، كە بەهیچ جۆرێك پشگیریی ئەو بیرو بۆچوونە لارەی ئەوان ناكات.

## یەكەم: ئایەتی شمشێر!

هەرچەندە ئەوانەی ئەو بیرو بۆچونانەیان هەیە، لەسەر ئەوە كە ئایا ئایەتی شمشێر كامەیە؟ ڕێكنەكەوتوون، بەڵام زۆربەیان ڕایان وایە كەئایەتی: (٥)ە، لە سوڕەتی (التوبة) كە ئەمە دەقەكەیەتی:

﴿ فَإِذَا ٱنسَلَخَ ٱلْأَشْهُرُ ٱلْحُرُمُ فَٱقْتُلُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ وَخُذُوهُمْ وَٱحْصُرُوهُمْ وَٱقْعُدُوا۟ لَهُمْ كُلَّ مَرْصَدٍ ۚ فَإِن تَابُوا۟ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ فَخَلُّوا۟ سَبِيلَهُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٥﴾ ﴾التوبة.

واتە: ئنجا هەركات مانگە (جەنگ تێدا) حەڕامكراوەكان تێپەڕین، لەهەر شوێنێك هاوبەشدانەرەكانتان لێ هەڵكەوتن، بیانكوژنو، بیانگرنو، دەوریان بگرنو، لەهەموو كەمینگایەك لێیان بچنە بۆسەوە، ئنجا ئەگەر گەڕانەوە (بۆلای خوا)و، نوێژیان بەرپاكردو، زەكاتیاندا، ئەوە ڕێیان بەردەن، بێگومان خوا لێبوردەی بەبەزەییە.

شایانی باسیشە كە هەندێك لەزانایان گوتوویانە: ئەم ئایەتە سەدو چل (١٤٠) ئایەتی نەسخ كردۆتەوە، كە بریتین لەو ئایەتانەی فەرمان بەخۆڕاگریی‌و لێبوردەیی‌و بانگەواز بەحیكمەتو...هتد دەكەن!!

كە لەڕاستییدا وانیەو، بگرە هیچ ئایەتێك لەقورئان دانیە "وەك لە تەفسیری سووڕەتی (البقرة)دا باسمان كردوە" بەو چەمكو واتایەی زانایانی پاشین (خَلَفْ) وشەی (نسخ)یان بۆ بەكارهێناوە، كە بریتیە لە: لابردنی حوكمێكی شەرعیی

بەبەڵگەیەکی شەرعیی دواتر، (رَفْعُ حكم شرعي بدليلٍ شرعي مُتأَخِّر)و، هاوەڵانو زانایانی پێشین کەوشەی (نسخ)یان بەکار هێناوە، مەبەستیان پێی: تایبەتکردنی گشتی (تخصيص العام) یان بەنددار کردنی رەها (تقييدالمطلق) یان روونکردنەوەی نارِوون (تبيين المجمل) بووە[1].

ئنجا ئەگەر سەرنجی ئەو ئایەتانە بدەین کە ئایەتی ژمارە: (٥)ی (التوبة) لە ریزیاندا هاتوە، زۆرباش روون دەبێتەوە، کەمەبەست لەئایەتەکە، جەنگ کردنە دژی ئەو هاوبەشدانەرانە، کە پەیمانشکێنو ئەهلی غەدر بوون، نەك تێکرای هاوبەشدانەران:

﴿ بَرَآءَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ إِلَى ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّم مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١﴾ فَسِيحُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّكُمْ غَيْرُ مُعْجِزِى ٱللَّهِ ۙ وَأَنَّ ٱللَّهَ مُخْزِى ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٢﴾ وَأَذَٰنٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ إِلَى ٱلنَّاسِ يَوْمَ ٱلْحَجِّ ٱلْأَكْبَرِ أَنَّ ٱللَّهَ بَرِىٓءٌ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ۙ وَرَسُولُهُۥ ۚ فَإِن تُبْتُمْ فَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ۖ وَإِن تَوَلَّيْتُمْ فَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّكُمْ غَيْرُ مُعْجِزِى ٱللَّهِ ۗ وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٣﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّم مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ثُمَّ لَمْ يَنقُصُوكُمْ شَيْـًٔا وَلَمْ يُظَٰهِرُوا۟ عَلَيْكُمْ أَحَدًا فَأَتِمُّوٓا۟ إِلَيْهِمْ عَهْدَهُمْ إِلَىٰ مُدَّتِهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٤﴾ فَإِذَا ٱنسَلَخَ ٱلْأَشْهُرُ ٱلْحُرُمُ فَٱقْتُلُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ وَخُذُوهُمْ وَٱحْصُرُوهُمْ وَٱقْعُدُوا۟ لَهُمْ كُلَّ مَرْصَدٍ ۚ فَإِن تَابُوا۟ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ فَخَلُّوا۟ سَبِيلَهُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٥﴾ وَإِنْ

---

١) بڕوانە: (إعلام الموقِّعين)، ج١ ص٢٨، و (الموافقات، ج٣ص٧٥).

أَحَدٌ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ٱسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ ثُمَّ أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُۥ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْلَمُونَ ﴿٦﴾ ﴾التوبة.

وەك دەبینین:

١)- ئەو ئایەتانە بەگشتی لەبارەی ئەو هاوبەشدانەرانەوەن کەپەیمانیان لەگەڵ مسوڵمانانندا بەستوە، چ پێیەوە پابەند بووبن، چ پابەند نەبووبن، ئایەتی (١).

٢)- ئنجا ئەوانەی کە بە پەیمانەکانیانەوە پابەند نەبوون، چوار مانگ مۆڵەت دراون، کە هەڵوێستی خۆیان یەکلایی بکەنەوە، لەو ماوەیەدا، چ بەسەلماندنی پابەندییان، چ بەمسوڵمان بوون، چ بەئامادەی جەنگ بوون، مادام ئەوان هەر دەرفەتیان لێ هەڵکەوێ، زەبر لەمسوڵمانان دەدەن، لەبەرگی هاوپەیمانیەتییدا! ئایەتەکانی (٣و٢).

٣)- بەڵام ئەوانەی پابەندبوونەو هیچ کەموکوڕییان لەپەیمانداریێتییدا نەبووەو، هاوکاریی دوژمنانی ئیسلامیان نەکردوە، پێویستە پەیمانەکەیان لەگەڵ ببرێتە سەر، ئایەتی (٤).

٤)- بەڵام ئەوانەی پابەندنین بەپەیمانەکانیانەوەو، هەر دەرفەتێکیان لێ هەڵکەوێ زەبر لەمسوڵمانان دەدەن، ئەوە پاش ئەو چوار مانگە مۆڵەتە، مسوڵمانان بۆیان هەیە لێیان بخەفتێن‌و، دەستیان لێ بوەشێنن، بەڵام نەك لەبەر بێ ئیمانییان، بەڵکو لەبەر بێ پەیمانیی! ئایەتی (٥).

٥)- هەرکات یەکێك لە هاوبەش بۆ خوا دانەران، بەمەبەستی گوێ بیست بوون‌و لێتێگەیشتنی قورئان، داوای پەنادران (جوار)ی کرد، پێویستە پەنا بدرێ‌و، پاشانیش ئەگەر قەناعەتی بەئیسلام نەهات، بەسەلامەتیی بگێڕرێتەوە شوێنی دڵنیایی خۆی، ئایەتی (٦).

کەواتە: ناونانی ئایەتی ناوبراو بە ئایەتی (شمشێر) هیچ پاساوێکی نیە، ئایەتی ناوبراو بەهیچ شێوەیەك جاڕدانی جەنگی گشتیی (إعلان النّفیرالعام)ی تێدانیە دژی ئەهلی کوفر، بە بەڵگەی فەرزبوونی پابەندیی بەپەیمانی کافرانی پابەند بە پەیمانەکانیانەوە، پێویستبوونی پەنادانی هاوبەش بۆ خوا دانەری پەنابەر (المشرك المستجیر) بۆ تێگەیشتنی قورئانو شارەزابوونی ئیسلامو، پاشانیش گەیاندنەوەی بەشوێنی دڵنیایی خۆی.

ئنجا لە هەمووشی سەرنجڕاکێشتر ئەوەیە کە:

لە ئایەتی ژمارە (٥)ی (**التوبة**)دا وشەی: شمشێر (سیف) نەهاتوە، بگرە لە هەموو قورئاندا وشەی (سیف) نەهاتوە، کەچی هەندێك لە زانایان –خوا بیانبوورێ- ئایەتی شمشێر (آیة السیف)یان کردۆتە بنێشتە شینکەی سەرزاریان!!

## دووەم: دەقی : (**بُعِثْتُ بين يدي الساعة بالسَّيف**..):

دەقێکی دیکە لەو بارەوە، ئەو فەرموودەیە کە ئەمە دەقەکەیەتی: (**بُعِثْتُ بَيْنَ يَدَيْ السَّاعَةِ بِالسَّيْفِ حَتَّى يُعْبَدَ اللَّهُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ، وَجُعِلَ رِزْقِي تَحْتَ ظِلِّ رُمْحِي، وَجُعِلَ الذُّلُّ وَالصَّغَارُ عَلَى مَنْ خَالَفَ أَمْرِي، وَمَنْ تَشَبَّهَ بِقَوْمٍ فَهُوَ مِنْهُمْ**).[1]

واتە: پێش هاتنی کاتی کۆتایی هاتنی دنیا، بەشمشێرەوە ڕەوانە کراوم، هەتا تەنیا خوا دەپەرسترێو هاوبەشی نابێو، بژیوم خراوەتە سێبەری نێزەمەوەو، زەبوونیی و ملکەچیی لەسەر هەرکەسێك دانراوە کە دژی فەرمانمەو، هەرکەسێك خۆی بەکۆمەڵێك بچوێنێ، ئەوە لەوانە.

١) رواه أَحْمَد برقم: (٥١١٤)، وَصَحَّحَهُ الألباني في صحيح الجامع الصغير، وزيادته: ٢٨٣١.

دیارە زانایان چ لەڕووی سەنەدو، چ لەڕووی نێوەڕۆك (مَتْن)ەوە، قسەی زۆریان لەسەر ئەو فەرموودەیە کردوە:

## یەك: لەڕووی سەنەدەوە:

بەشێك لە زانایان لەڕووی سەنەدەوە، ئەو دەقەیان بە باش (حسن) یان ڕاست (صحيح) داناوە، وەك (أحمدشاكر)و (الألباني)، بەڵام بەشێكیان بە بێهێز (ضعيف)یان داناوە، وەك: (شعيب الأرناؤوط، ومحمد نعيم، والعرقسوسي، وإبراهيم الزيبق) كە (تخريج)ی (المسند)ی (أحمد)یان كردوەو، گوتوویانە: (إسنادٌ ضعيف).

دیارە ئەویش بەهۆی ڕاجیاییانەوە لەبارەی یەكێك لە گێڕەرەوە (راوي)ەكانی ئەو دەقەوە كە (عبدالرحمن بن ثابت ابن ثوبان)ە.

بۆ وێنە:

(الحافظ المِزِّي) لەكتێبی: (تهذيب الكمال)دا، بەژمارە: (٣٧٧٥) باسی (ابن ثوبان) دەكاتو، لەم زانایانەوە ئەم هەڵسەنگاندنانە لەبارەیەوە دێنێ:

١-أحمد بن حنبل: أحاديثهُ مناكير.

٢-يحيى بن مَعين: ضعيف، لەشوێنێكی دیكە: {صالح}، لەجێیەكی دیكە: {لاشيئ}.

٣-النسائي : ضعيف، لَيْس بالقوي، ليس بثقة.

٤-أبوداود: ليس به بأس.

٥- ابن خِراش: في حديثه لين.

٦-ابن الجوزي: من الضعفاء.

٧-الحافظ ابن حجر: صدوق يُخطئ، ورُميَ بالقدر، وتغيَّر بأخرة.

هەڵبەتە بابایەکی ئاواش ناگونجێ فەرموودەیەکی بەو نێوەڕۆکە مەترسیدارەی لێ وەربگیرێ: کە گوایە ئیسلام ئایینی شمشێرەو، بژێوی پێغەمبەریش لەسێبەری ڕمو نێزەی دایە!!

## دوو: لەڕووی نێوەڕۆکەوە:

لە هیچ ئایەتێکدا، خوای کاربەجێو زاڵ نەیفەرمووە: کە پێغەمبەری کۆتایی خۆی بەهێزو شمشێرەوە ناردوە!

بەڵکو لەچەندان ئایەتدا ڕایگەیاندوە، کە پێغەمبەری کۆتایی خۆی بە:

ڕێنمایی‌و ئایینی هەق (بالهدى ودين الحق).

بەزەیی بۆ جیهانییان (رحمة للعالمين).

١ – ئامۆژگاریی‌و شیفا (موعظة وشفاء).

٢ – ڕوونکەرەوەی هەموو شتێك‌و موژدە (تبياناً لكل شيء وبشرى).

٣ – هەق‌و ڕاستیی(بالحق).

٤ – موژدەدەرو وریاکەرەوە (بشيراً ونذيراً).

ناردوە، وەك خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی:

١)- ﴿ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ ٱلْحَقِّ لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْمُشْرِكُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾التوبة.

٢)- ﴿ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ ٱلْحَقِّ لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا ﴿٢٨﴾ ﴾الفتح.

٣)- ﴿ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ ٱلْحَقِّ لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْمُشْرِكُونَ ﴿٩﴾ ﴾الصف.

٤)- ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ١٠٧ ﴾الأنبياء.

٥)- ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدۡ جَآءَتۡكُم مَّوۡعِظَةٞ مِّن رَّبِّكُمۡ وَشِفَآءٞ لِّمَا فِي ٱلصُّدُورِ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٞ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ ٥٧ ﴾يونس.

٦)- ﴿ وَنَزَّلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ تِبۡيَٰنٗا لِّكُلِّ شَيۡءٖ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٗ وَبُشۡرَىٰ لِلۡمُسۡلِمِينَ ٨٩ ﴾النحل.

٧)- ﴿ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ بِٱلۡحَقِّ بَشِيرٗا وَنَذِيرٗاۖ وَلَا تُسۡـَٔلُ عَنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلۡجَحِيمِ ١١٩ ﴾البقرة.

کەواتە: دەقی ناوبراو نەلەڕووی سەنەدەوە، نەلە ڕووی نێوەڕۆکەوە، ناگونجێ پشتی پێ ببەسترێو، بەفەرموودەی پێغەمبەری خوا (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دابنرێ.

## سێیەم: دەقی: (أُمِرْتُ أَنْ أُقاتِلَ النَّاسَ حَتّى يَقُولوا لا إِلهَ إِلاّ اللهُ):

دەقی سێیەم کە پەرگیرانو تێپەڕێنەران لەبواری جیهاد دا، پشتی پێ دەبەستن، ئەم فەرموودەیە:

**(أُمِرْتُ أَنْ أُقاتِلَ النَّاسَ حَتّى يَشْهَدوا أَنْ لا إِلهَ إِلاّ اللهُ وَأَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ، وَيُقِيمُوا الصَّلاةَ وَيُؤْتُوا الزَّكاةَ، فَإِذا فَعَلُوا ذَلِكَ عَصَمُوا مِنّي دِماءَهُمْ وَأَمْوالَهُمْ إِلاّ بِحَقِّ الإِسْلامِ، وَحِسابُهُمْ عَلى اللهِ)**[1]

واتە: فەرمانم پێکراوە لەدژی خەڵك بجەنگم تاکو: شایەتمان دێنن: کەجگە لە خوا هیچ پەرستراونینو، کە موحەممەد ڕەوانە کراوی خوایەو، نوێژ بەرپا دەکەنو، زەکات دەدەن، ئنجا ئەگەر ئەوانەیان کرد، ئەوە خوێنو سامانی خۆیانیان لەمن

١) أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٢٥)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٢).

پاراستوه، مەگەر بەهەقی ئیسلامو، لێپرسینەوەشیان عایدی خوایە.

دیارە پەرگیران وا لەم فەرموودەیە حاڵی بوون، کە ئەوەپێغەمبەری خوا(صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّم) ئیعلانی جەنگ دژی هەموو مرۆڤایەتی کردوە، هەتا دێنە نێو ئیسلامەوەو دەبنە مسوڵمان!! شایانی باسیشە کەزۆرێك لەزانایان قسەیان لەسەر ئەم فەرموودەیە کردوە، چونکە ڕواڵەتەکەی لەگەڵ زۆر ئایەتو فەرموودەو سیرەو ژیانی پێغەمبەریشدا تێك دەگیرێ، بابزانین چۆن؟!:

**١- ئەوەی لە دژی مسوڵمانان نەجەنگێ، دروست نیە جەنگی لەدژ بکەن:**

وەك خوای کارزان فەرموویەتی:

﴿ وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمۡ وَلَا تَعۡتَدُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ١٩٠ ﴾البقرة.

**٢- هەرکات ئەهلی کوفری شەڕەنگێز مەیلی ئاشتییان کرد، دەبێ ئەهلی ئیسلامیش لای ئاشتیی بگرن:**

وەك خوا تبارك وتعالى فەرموویەتی:

﴿ وَإِن جَنَحُواْ لِلسَّلۡمِ فَٱجۡنَحۡ لَهَا وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ٦١ ﴾الأنفال.

**٣- نامسوڵمانانێك کەبێ لایەنیی (الحِیادْ) لەنێوان ئەهلی ئیسلامو ئەهلی کوفردا هەڵدەبژێرن، دروست نیە مسوڵمانان جەنگیان لەدژ بکەن:**

وەك خوای دادگەر فەرموویەتی: ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ يَصِلُونَ إِلَىٰ قَوۡمِۭ بَيۡنَكُمۡ وَبَيۡنَهُم مِّيثَٰقٌ أَوۡ جَآءُوكُمۡ حَصِرَتۡ صُدُورُهُمۡ أَن يُقَٰتِلُوكُمۡ أَوۡ يُقَٰتِلُواْ قَوۡمَهُمۡۚ وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَسَلَّطَهُمۡ عَلَيۡكُمۡ فَلَقَٰتَلُوكُمۡۚ فَإِنِ ٱعۡتَزَلُوكُمۡ فَلَمۡ يُقَٰتِلُوكُمۡ وَأَلۡقَوۡاْ إِلَيۡكُمُ ٱلسَّلَمَ فَمَا جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمۡ عَلَيۡهِمۡ سَبِيلٗا ٩٠ ﴾النساء.

**٤- ئەو نامسوڵمانانەی پەیمانیان لەگەڵ مسوڵمانانندا هەیە "کەدژی یەکدی جەنگ نەکەن" دروست نیە تەنانەت لەسەر دەستدرێژیی کردنە سەر مسوڵمانانی ژێر دەستیشیان، پەیمانیان لەگەڵ بشکێنرێ‌و جەنگیان لەدژ بکرێ:**

وەك خوای زاناو توانا فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ ءَاوَواْ وَّنَصَرُوٓاْ أُوْلَٰٓئِكَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍۚ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمْ يُهَاجِرُواْ مَا لَكُم مِّن وَلَٰيَتِهِم مِّن شَيْءٍ حَتَّىٰ يُهَاجِرُواْۚ وَإِنِ ٱسْتَنصَرُوكُمْ فِي ٱلدِّينِ فَعَلَيْكُمُ ٱلنَّصْرُ إِلَّا عَلَىٰ قَوْمٍ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَٰقٌۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٧٢﴾ ﴾الأنفال.

**٥- ئیسلام لەنامسوڵمانانی خاوەن کتێب (أهل الکتاب)و بێ کتێب قبووڵ دەکات کە لەدەوڵەتەکەیدا هاووڵاتیی بن، بەو شێوەیەی کە بەیەکەوە ڕێك دەکەون، لەڕووی سەرانە (جزیة) دانو نەدانەوە:**

باشترین نموونەش: سێ هۆزە جولەکەکەی نێومەدینەن: (بني قینقاع، بني النضیر، بني قریظة)

هەر بۆیەش زانایان خۆیانیان بەناچار بینیوە، کەئەو فەرموودەیە تەئویل بکەن، یان بەجۆرێك مانا بکەن، کەلەگەڵ ئەو هەموو ئایەت‌و فەرموودانەدا تێك نەگیرێ، کەبەئاشکرا ئەوە دەگەیەنن: ئیسلام ئیعلانی جەنگی نەکردوەو ناکات دژی مرۆڤایەتیی!

دیارە زانایان بەچەند شێوەیەك هەوڵی لابردنی ئەو ئیشکالە ڕواڵەتییەیان داوە، بۆ وێنە:

١/ (الحافظ ابن حجر العسقلاني) لە (فتح الباري)دا شەش وەڵامی هێناون[1]،

---

١) ج١ص ١٤٥ ، ١٤٦.

بەڵام بەڕای من لەهەموویان بەهێزتر ئەو ڕایەیە کە دەڵێ: مەبەست لە: (الناس) کافرانی شەڕفرۆش (الكفار المحاربون)ەو، ئەلیفو لامی سەر (ناس) بۆ(عهد)ە، نەك بۆ (جنس)، ئەوکاتەش مانایەکەی ئاوای لێدێ:فەرمانم پێکراوە کەلەدژی خەڵکی کافری شەڕفرۆش بجەنگم،تاکو دەڵێن: (لا إله إلاّ الله)...

٢/ (ابن تيمية)ش لەبارەی ئەو فەرموودەیەوە، گوتوویەتی:

(والمعنى: أنّي لم أُؤْمَرْ بالقتال إلاّ إلى هذه الغاية، وليس المراد: أنّي أُمِرْتُ أن أقاتِلَ كل أحدٍ إلى هذه الغاية! فإنّ هذا خلاف النَّصِّ والإجماع، فإنه لم يفعل هذا قط، بل كانت سيرتَهُ: أنَّ مَنْ سالَمَهُ لم يُقاتِلْهُ)[1].

واتە: مانایەکەی: من فەرمانم پێنەکراوە بجەنگم، مەگەر هەتا ئەو ئامانجەو، مەبەست ئەوە نیە: من فەرمانم پێکراوە کە لەدژی هەرکەسێك بجەنگم، هەتا ئەو ئامانجە! چونکە ئەمە پێچەوانەی دەقو کۆڕاشە، ئنجا هەرگیز -پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ)- شتی وای نەکردوە، بەڵکو سیرەی وابووە، کەهەر کەس ئاشتیی لەگەڵدا کردبێ، لەدژی نەجەنگاوە.

٣/ هەروەها (الصنعاني)یش لەو بارەوە قسەیەکی جوانی کردوە، کە گوتوویەتی: (..بأنَّ الحديث سيق لبيان الغاية التي أُبيحَ إليها القتالُ، بحيث إذا فعلوها، حَرُمَ قتالُهم، أي: لم أُؤْمَر بقتالهم، إلاّ إلى أن يَقعَ منهم هذا القولُ، فإذا قالوهُ، حَرُمَ قِتالُهُم..)[2]

واتە: ئەو فەرموودەیە بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو ئامانجە هاتوە، کە جەنگی بۆ ڕەوا کراوە، بەجۆرێك کە ئەگەر کردیان، کوشتاریان قەدەغەبێ، یانی: فەرمانم پێنەکراوە لەدژیان بجەنگم، مەگەر تا ئەو کاتەی ئەو قسەیە دەکەن، ئنجا هەرکات گوتیان، کوشتاریان قەدەغەیە.

---

١) قاعدة مختصرة في قتال الكفار ومهادنتهم وتحريم قتلهم لمجرد كفرهم، ص٢٣٨،٢٣٦.

٢) بڕوانە: بحث في قتال الكفار، ضمن مجموعة: ذخائر علماءِ اليمن ص١٥٤.

## بڕگەی حەوتەم: ڕەوشتەکانی جیهادو جەنگ:

لە ئیسلامدا خووڕەوشتی بەرزو بەها جوانەکان، هەوێنو هەناون بۆ هەموو شتێكو، مسوڵمانان پێویستە لەهەموو بوارەکانی دینداریی‌و دنیادارییدا ڕازاوەبن، بەئاکاری پەسندو ڕەوشتی جوانو، بواری جەنگو جیهادیش لەو بنچینەیە بەدەر نیە.

هەڵبەتە دەشگونجێ زۆر شت لەبارەی ڕەوشتو ئاکارە پەسندەکانی بواری جیهادەوە باس بکەین، بەڵام بەخستنە ڕووی حەوتیان واز دێنین:

## یەك: بەس خوا پێ مەبەست بوون:

یەکەمینو سەرەکیترین ئاکاری بەرزو پەسندی پێویست، بۆ ئەنجامدانی جەنگو جیهاد لەڕێی خوادا، بریتیە لەنیازو مەبەستی خۆ ساغکردنەوە (إخلاص النِّیة) بۆ خوا "سبحانه و تعالى" چونکە کردەوە باشەکان، بەبێ ڕووحی خوا پێ مەبەست بوون، وەك جەستەیەکی مردوون، هەر بۆیەش خوای بەبەزەیی فەرموویەتی:﴿ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ وَيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُواْ ٱلزَّكَوٰةَۚ وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلۡقَيِّمَةِ ﴿٥﴾ ﴾البينة.

واتە: تەنیا بەوە فەرمانیان پێکرابوو، کە بەملکەچییەکی ساغەوە، خوا بپەرستنو، خۆیان دوور بگرن لەهەر ڕێبازێکی دیکە.

پێغەمبەری خواش (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فەرموویەتی: (**إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ ، وَإِنَّمَا لِكُلِّ امرِئٍ مَا نَوَى**)[1].

واتە: بێگومان کردەوە (چاکە)کان بەپێی نیازو مەبەست وەردەگیرێن‌و، هەرکەس تەنیا بەگوێرەی نیازی (نێودڵی) پاداشت دەدرێتەوە.

بەتایبەت لەبارەی جەنگ‌و جیهادەوەش فەرموویەتی:

(**مَنْ قَاتَلَ لِتَكُونَ كَلِمَةُ اللَّهِ هِيَ الْعُلْيَا فَهُوَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ**)[2]

واتە: هەرکەسێك بۆ ئەوە بجەنگێ، کە وشەی خوا بەرزترین بێ، ئائەوە لەڕێی خوادایە.

ئنجا قەناعەتم وایە کە دڵسافیی‌و نیازو مەبەست ساغیی لەگەڵ خوادا، دەبێتە مایەی ڕێنمایی مرۆڤ بەرەو حەق‌و، پارێزرانی لەخلیسکان، بەرەو زەلکاوی هەڵەو تاوان، بۆیە کاتێك کەسانێك دەبینم بەناوی جیهاد لەڕێی خوادا، ستەم‌و دەستدرێژیی دەکەنە پیشە، لەمێشکمدا نیشانەی پرسیار دەکەوێتە سەر نیازو مەبەست‌و دڵ‌و دەروونیشیان! بەڵگەشم فەرمایشتی خوایە کە فەرموویەتی:

﴿ وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَاۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٦٩﴾ ﴾العنكبوت.

واتە: ئەوانەی لەپێناوی ئێمەدا تێدەکۆشن، مسۆگەر ڕێبازەکانی خۆمانیان (یانی ئەو ڕێبازو شێوازانەی ئێمە پێمان پەسندن بۆ تێکۆشان) پێشان دەدەین‌و، بەدڵنیایی خوا لەگەڵ چاکەکارانە.

---

١) أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٦٥٥٣)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٩٠٧)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٢٠١)، وَالتِّرمذيُّ برقم: (١٦٤٧)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٣٧٩٤)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٤٢٢٧).

٢) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٩٥١١)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٧٠٢٠)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٩٠٤)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٥١٧)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٦٤٦)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٣١٣٦)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢٧٨٣).

کەواتە: سەرگەردانییو ڕێ دەرنەکردن بەرەو حەقو چاکە، بەڵگەی نەبوونی قیبلە نومای ئیخلاسو تەنیا خوا پێ مەبەست بوونە!.

## دوو: خۆ دوورگرتن لە دەستدرێژییو ستەم:

چونکە خوای دادگەر دەستدرێژیی (إعتداء) ی قەدەغە کردوە، دیارە هەموو دەست درێژییەکیش ستەمە، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمۡ وَلَا تَعۡتَدُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ﴿١٩٠﴾ ﴾البقرة.

کە پێشتر ماناماں کردوەو (إعتداء) یش لێرەدا دوو واتایان هەڵدەگرێ:

یەکەم: جەنگ کردن لە دژی نامسوڵمانانێك، کە لە دژی مسوڵمانان ناجەنگنو، پشتی دوژمنانیشیان لەدژیان ناگرن.

دووەم: کوشتنی کەسانێك کە جەنگ ناکەن، وەك: ژنو منداڵو پیرو نەخۆشو جوتیارو کرێکارو....هتد کە نەبەجەستەیان، نە بەبیروڕاو تەگبیریان، بەشداریی جەنگ ناکەن.

ئنجا لەڕاستییدا هەردووك واتایەکەش لەیەك کاتدا مەبەستنو، وشەی (إعتداء) دەیانگرێتەوە، چونکە هەردووکیان ستەم (ظلم)نو، ستەمیش قەدەغەیە، وەك خوای بەرزو مەزن لەفەرمایشتێکی قودسییدا فەرموویەتی: (**يَا عِبَادِي! إِنِّي حَرَّمْتُ الظُّلْمَ عَلَى نَفْسِي، وَجَعَلْتُهُ بَيْنَكُمْ مُحَرَّمًا، فَلا تَظَّالَمُوا**)[1]

واتە: ئەی بەندەکانم! من ستەمم لەخۆم قەدەغەکردوەو، لەنێو ئێوەشدا گێڕاومە بە قەدەغەکراو، دەجا ستەم لەیەکدی مەکەن.

١) أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٤٦٧٤).

## سێ: نەکوشتنی جگە لە جەنگاوەران:

هەرچەندە خاڵی پێشووش ئەمە دەگرێتە خۆی، بەڵام لەبەر زێدە ترسناکیی تاوانی کوشتنی بەناهەق، بەتایبەتییش هێنامان.

ئێمە پێشتریش باسی ئەم مەسەلەی کوشتنی بەناهەقمان کردوە، بۆیە لێرەدا بەکورتیی لەوبارەوە دەدوێین‌و، بەهێنانی دوو فەرموودە، کەیەکەمیان پێشتریش هێناومانە ، وازی لێ دێنین:

١)- **(عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ، أَنَّ امْرَأَةً وُجِدَتْ، فِي بَعْضِ مَغَازِي رسول الله (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، مَقْتُولَةً، فَأَنْكَرَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَتْلَ النِّسَاءِ وَالصِّبْيَانِ)**[١].

واتە: لە هەندێك لە جەنگەكانی پێغەمبەری خوادا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (تەرمی) ژنێكی كوژراو دۆزرایەوە، پێغەمبەری خواش (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ڕەخنەی گرت لە كوشتنی ژنان‌و منداڵان.

٢)- هەروەها ئەم فەرموودەیەش دێنین: **(لاَ تَقْتُلُوا شَيْخاً فَانِياً، وَلاَ طِفْلاً صَغِيراً، وَلاَ امْرَأَةً)**[٢].

واتە: نەپیاوی پیری كەنەفت، نە منداڵی گچكە، نە ئافرەت مەكوژن.

شایانی باسیشە هەندێك لەزانایان ئەو فەرموودەیە "كە ئێستا دەیهێنن" ئیشكالی بۆ دروست كردوون‌و، ناچاری كردوون بڵێن: ئەو فەرموودانەی پێشتر هێنامانن، نەسخیان كردۆتەوە! فەرموودەكەش ئەمەیە: **(عَنِ ابْنِ عَبَّاس أن الصَّعْب بن جَثَّامة قَالَ: مَرَّ بي النبيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بالأبواء**

١) أَخْرَجَهُ الْبُخَارِي برقم: (٣٠١٤)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٧٤٤).
٢) أَخْرَجَهُ إِبْنُ أَبِي شَيْبَة برقم: (٣٣٧٩٠)، وَأَبُو دَاوُدبرقم: (٢٦١٤)، وَالبَيْهَقِيُّ برقم: (١٧٩٣٢).

"أوبودَّان"؟! فَسُئِلَ عَنْ أَهْلِ الدَّارِ يُبَيَّتُونَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ، فَيُصَابُ مِنْ نِسَائِهِمْ وَذَرَارِيِّهِمْ قَالَ: هُمْ مِنْهُمْ)[1]

واتە: پێغەمبەر (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە ئەبواء "یان لەوەددان" بەلامدا تێپەڕی، لەبارەی ماڵێکی هاوبەشدانەرانەوە پرسیاری لێکرا: کە شەبەیخوونیان دەکرێتە سەرو ژنو منداڵیان دەپێکرێن؟ فەرمووی: ئەوانیش لەخۆیانن.

بەڵام، وەك (الخطّابي) گوتوویەتی، پێویست بەوە ناکات بڵێین: فەرموودەکەی (الصّعب بن جَثّامة) نەسخ کراوەتەوە، بەڵکو دەڵێین: کەفەرموویەتی: (هم منهم) واتە، لەکاتی شەبەیخوون (بیات)دا، چونکە ناگونجێ لەیەك جیابکرێنەوە، دروستە جەنگ لەدژی کافرەکان بکرێ، با ژنو منداڵیشیان پێوە بن، ئەو فەرموودانەی دیکەش، باسی ئەوە دەکەن کەدروست نیە ژنو منداڵی کافرانی جەنگاوەر بکرێنە ئامانج، بەو شێوەیەش فەرموودەکان پێکەوە کۆدەکرێنەوە[2].

## چوار: خۆدوورگرتن لەئەتك کردنو شێواندنی جەستەی کوژراوانی دوژمن:

وشەی (مُثْلَة) یان (تمثیل) بەکوردیی (ئەتك)و (شێواندنی جەستەی مردوو)ی پێدەڵێین، ئنجا ئیسلام ئەو ڕەفتارەی قەدەغەکردوە، نەك هەر وەك دەستپێشخەریی، بەڵکو وەك کاردانەوەو مامەڵەی هاوشێوە (ردُّ الفعل والمعاملة بالمثل)یش، ئنجا لەبەر ئەوەی پێشر {لە ئاڵقەی هەشتەمی بەشی دووەمدا} بەدرێژیی باسی ئەم مەسەلەیەمان کرد، لێرەدا بەهێنانەوەی ئەم دوو فەرموودەیە وازدێنین، کەپێشتریش هێناومانو ماناشمان کردوون:

---

١) أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٣٠١٢)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٧٤٥).

٢) بڕوانە: معالم السنن، الخطابي، ج٣ص١٥،١٤، و "فتح الباري"، ج٧ص٥٧٨.

١)- (**اغْزُوا وَلاَ تَغُلُّوا وَلاَ تَغْدِرُوا وَلاَ تُمَثِّلُوا**)[١].

واتە: جەنگ بکەن‌و دزیی لەدەستکەوت (غنیمة) مەکەن‌و، پەیمان مەشکێنن‌و، جەستەی کوژراوان مەشێوێنن.

٢)- (**أَعَفُّ النَّاسِ قِتْلَةً أَهْلُ الإِيمَانِ**)[٢].

واتە: بڕواداران لەهەمووکەس دەستپاکترو ڕەوشت جوانترن، لە کوشتندا.

## پێنج: وەفاداریی بە پەیمان‌و، خۆپاراستن لەپەیمان شکێنیی:

با لەو بارەوە لەبەر ڕۆشنایی چەند ئایەتێکی قورئان‌و فەرمایشتێکی پێغەمبەری خاتەمدا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) چوار خاڵ بخەینە ڕوو:

١/ وەفاداریی‌و پەیمان بردنەسەر، یەکێکە لەڕەوشت‌و ئاکارە داکۆکیی لە سەرەکراوەکان لەئیسلامدا بەگشتیی‌و، لەکاتی جەنگدا بەتایبەت‌و، بەپێچەوانەوە: پەیمان شکێنیی (غَدْر) بەیەکێك لە سیفەت‌و کردەوە هەرە خراپەکان دانراوەو، بەسیفەتی ئەهلی کوفرو نیفاق دانراوە، وەك خوا "سبحانه وتعالى" دەفەرموێ:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشۡتَرُونَ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ وَأَيۡمَٰنِهِمۡ ثَمَنٗا قَلِيلًا أُوْلَٰٓئِكَ لَا خَلَٰقَ لَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ ٱللَّهُ وَلَا يَنظُرُ إِلَيۡهِمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَلَا يُزَكِّيهِمۡ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿٧٧﴾ ﴾ آل عمران.

واتە: بەڕاستیی ئەوانەی نرخێکی کەم بەپەیمانی خواو سوێندەکانیان دەکڕن، ئائەوانە هیچ بەشێکیان لەڕۆژی دوایی (لەبەهەشت)دانیەو، خوا لەڕۆژی قیامەتدا نایاندوێنێ‌و، تەماشایان ناکات‌و، پاکیان ناکاتەوەو، سزایەکی بەئێشیان هەیە.

---

١) أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (١٧٣١)

٢) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٣٧٢٨)، تعليق شعيب الأرنؤوط: حَسَّنَهُ أَبُو دَاوُد برقم: (٢٦٦٦)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم:(٢٦٨٢).

٢/ پێغەمبەری خواش (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) لەبارەی گەورەیی تاوانی پەیمان شکێنییەوە فەرموویەتی: (**ذِمَّةُ الْمُسْلِمِينَ وَاحِدَةٌ يَسْعَى بِهَا أَدْنَاهُمْ**...)[1].

واتە: پەیمانی مسوڵمانان یەکێکە خوارترینیان دەبێ بیپارێزێ...

٣/ ئنجا شایانی باسە کەتەنانەت لەبەرانبەر پەیمان شکێنیی و خیانەتی دوژمنیشدا، دروست نیە پەیمان بشکێنرێ، هەر بۆیەش خوای دادگەر فەرموویەتی: ﴿ وَإِمَّا تَخَافَنَّ مِن قَوْمٍ خِيَانَةً فَانۢبِذْ إِلَيْهِمْ عَلَىٰ سَوَآءٍ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْخَآئِنِينَ ﴿٥٨﴾ ﴾الأنفال.

واتە: هەر کات مەترسیی خیانەت (پەیمان شکێنیی)ت لەکۆمەڵێك هەبوو، بەئاشکرا پەیمانەکەیان بدەوە، با هەردووك لاتان وەك یەك ئاگاداربن (لەنەمانی ئەو پەیمانە) بێگومان خوا پەیمان شکێنانی خۆشناوێن.

٤/ پێغەمبەری خواش (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) لەوبارەوە کەدروست نیە، لەبەرانبەر پەیمان شکێنیی دوژمندا، پەیمان شکێنیی بکرێ، فەرموویەتی: (**أَدِّ إِلَى مَنِ ائْتَمَنَكَ وَلاَ تَخُنْ مَنْ خَانَكَ**)[2].

واتە: هەرکەسێك ئەمانەتی پێ سپاردی، سپاردەکەی بدەوەو، ناپاکیی و پەیمان شکێنیی بەرانبەر بەکەسێك مەکە، کەخیانەتت پێ دەکات.

---

١) أَخْرَجَهُ الْبُخَارِي برقم: (١٨٧٠)، وَمُسْلِمْ برقم: (١٧).

٢) أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ برقم: (٣٥٣٥)، وَالتِّرمذي برقم: (١٢٦٤)، وَالدَّارِمِيُّ برقم: (٢٥٩٧)، وَالحَاكِمُ (٢\٤٦)، وَصَحَّحَهُ عَلَى شَرْط مُسْلِم، ووافقه الذهبي وصحّحه الألباني في صحيح أبي داود: ٣٠١٩.

## شەش: خۆپاراستن لەخراپەکاریی و تێکدان، وەك بڕینی درەخت و ڕووخاندنی خانوو:

ئــەمیش یــەکی دیکەیــە لەوڕەوشــت و ئاکــارە پەســندانەی، کــە ئیســلام شوێنکەوتووانی خۆی لەحاڵەتی جەنگیشدا پێوەی پابەند دەکات.

خوای بەرزو مەزن لەبارەی کەسانێکی خراپەکارو ئاشووب گێڕەوە، وەك ڕەخنـە لێگــرتن و سەرزەنشــتکردن، فەرموویــەتی:﴿ وَإِذَا تَوَلَّىٰ سَعَىٰ فِي الْأَرْضِ لِيُفْسِدَ فِيهَا وَيُهْلِكَ الْحَرْثَ وَالنَّسْلَ ۗ وَاللَّهُ لَا يُحِبُّ الْفَسَادَ ﴿٢٠٥﴾ ﴾البقرة.

واتە: هەر کـات پشـتی هـەڵکرد (ڕووی وەرگێـڕا) هـەوڵی خراپـەکاریی دەدا لـە زەویداو، تێدەکۆشێ کە کشت وکاڵ و وەچە بفەوتێنێ و، خواش حەز لـە خراپـەکاریی ناکات.

ئنجا ئەگەر یەکێکیش فەرموودەی خوا:﴿ مَا قَطَعْتُم مِّن لِّينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَائِمَةً عَلَىٰ أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ اللَّهِ وَلِيُخْزِيَ الْفَاسِقِينَ ﴿٥﴾ ﴾الحشر.

واتــە : هــەر دار خورمایــەك کــە بڕیتــان (لــە جــەنگی هــۆزی (بـني النضـير)ی جوولەکەدا) یان بە پێوە لەسەر ڕەگ و بنکەکانی هێشتتانەوە، ئەوە بەمۆڵەتی خـوا بوو، بۆ ئەوەبوو کە لەڕێ دەرچووان زەبوون بکات.

بەبەڵگە بهێنێتەوە، دەڵێین:

زانایــان گوتوویانــە: ئــەو ڕەفتــارەی پێغەمبــەری خــوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ)و مسوڵمانان لەو جەنگەدا، هەڵاوێردراو (مستثنی) بووە، لەو بنچینەیەو، ئێسـتاش هەرکاتێك بەرژەوەندیی جەنگ ئەو جۆرە ڕەفتارە بخوازێ و، پەکی لەسەری بکـەوێ، دروستە بکرێ، ئەمە ڕای زۆر بەی هەرە زۆری زانایانە[1].

---

١) بڕوانە:المغني، لابن قدامة: ج١٣، ص١٤٣,١٤٤.

## حەوت: دەستپاکیی لەبەرانبەر دەستکەوتی جەنگدا:

یەکی دیکە لە ڕەوشتو ئاکارە بەرزو پەسندەکانی بواری جەنگو جیهاد، بریتیە لە دەستپاکیی (النزاهة)و خۆ دوورگرتن لەدەستکاریی دەسکەوتی جەنگ (الغنيمة) کە ئەویش، واتە: دەستکاریی کردنی دەستکەوتی جەنگ، دووحاڵەتی هەن:

**یەکەم:** دەستکاریی کردنیو بردنی بە ئاشکرا، کە ڕفێنراو (نُهبَة)ی پێدەگوترێو، پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) لەوبارەوە فەرموویەتی: (**إِنَّ النُّهْبَةَ لَيْسَتْ بِأَحَلَّ مِنَ الْمَيْتَةِ**)[1].

واتە: بێگومان ڕفێنراو "لە غەنیمەت" لە مردار حەڵاڵتر نیە .

**دووەم:** دزینی بەپەنهانیی، کە (غُلول)ی پێدەگوترێو، خوای دادگەر لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿ وَمَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَغُلَّ ۚ وَمَن يَغْلُلْ يَأْتِ بِمَا غَلَّ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ۚ ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿١٦١﴾ ﴾ آل عمران.

واتە: هیچ پێغەمبەرێك ناکرێ دزیی لە غەنیمەت بکاتو، هەر کەس ناپاکیی (لە دەسکەوتی جەنگ) بکات، ڕۆژی قیامەتێ ئەوەی دزیویەتی (لە دەستکەوت) دەیهێنێ، پاشان هەرکەسە بەگوێرەی ئەوە کردوویەتی، سزاو پاداشت دەدرێتەوەو، ستەمیان لێناکرێ.

پێغەمبەری خواش (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) لەوبارەوە فەرمایشتی زۆرن، بۆ نموونە:(**عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ ، قَالَ : صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) يَوْم حُنَيْنٍ إِلَى جنب بَعِير مِنَ المَقَاسِمِ، ثُمَّ تَنَاوَلَ شيئاً مِنَ الْبَعِيرِ فأخذ منه قَرَدَةً "يعني وَبْرةً" فَجَعَلَهَا بَيْنَ إِصْبَعَيْهِ ثم قال: يَا أَيُّهَا النَّاسُ! إِنَّ هَذَا**

[1] أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُد برقم: (٢٧٠٥)، وَصَحَّحَهُ الألبَانِي فِي صحيح أبي داود: (٢٣٥٤).

غَنَائِمُكُمْ فَأَدُّوا الْخَيْطَ وَالْمِخْيَطَ، فَمَا فَوْقَ ذَلِكَ، فَمَا دُونَ ذَلِكَ، فَإِنَّ الْغُلُولَ عَارٌ عَلَى أَهْلِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَشَنَارٌ وَنَارٌ)[١].

واتە: عوبادەی کوڕی صامت خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: لەجەنگی حونەیندا پێغەمبەری خوا (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) لە تەنیشت حوشترێکی غەنیمەتەوە نوێژی پێکردین، ئنجا تۆزە تووکێکی لە وشترەکە دەرکێشاو، خستیە نێوان دوو پەنجەیەوەو فەرمووی: ئەی خەڵکینە! ئەمە لە دەستکەوتەکانتانە! دەزوو و دەرزی (یان بەنو سووژن)و زیاترو کەمتر لەوەش، تەسلیم بکەن، چونکە نا پاکیی لە دەستکەوت لە ڕۆژی قیامەتدا، نەنگیی‌و عەیبو (مایەی چوونە) ئاگرە.



١) أَخْرَجَهُ ابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢٨٥٠)، وَصَحَّحَهُ الألباني في "صحيح ابن ماجه": (٢٣٠٠).

## وەڵامی پرسیارێکی فەقیر حاڵانە!

لە ئەنجامی هەڵسەنگاندنم، بۆ ڕێکخراوی دەوڵەتی ئیسلامیی ناسراو بە (داعش)دا، چەند جارێك ئەو پرسیارەم لێکراوە: ئایا ئەو (یەکێتی نیشتیمانیی)یەی ئێستا ئێوە شەڕی داعش لە دژی، بە ناهەق و تیرۆر دەزانن، هەر هەمان (یەکیەتی) نیە، کە کاتی خۆی ئێوە بەناوی (بزووتنەوە)وە، جەنگتان لە دژی دەکرد، جەنگەکەی خۆشتان بە جیهاد دەزانی؟!

لە وەڵامدا دەڵێین:

١. کاتی خۆی (یەکیەتی) دەستپێشخەری شەڕبوو، نەك بزووتنەوە، ئنجا یەکیەتی حوکمڕانی دەڤەرە کە بوو و، دەبووایە زیاتر هەستی بەبەر پرسیارێتیی کردبایەو، هەوڵی چارە سەری کێشەکەی دابایە، نەك زیاتر قووڵکردنەوەی و سەرەنجام گرتنی سەرجەم بنکەو بارەگاکانی بزووتنەوە!.

٢. هەر چەندە قیادەی ئەوسای بزووتنەوەش وردبینانەو واقیع بینانە مامەڵەی لەگەڵ هەل و مەرجەکەدا نەکرد، ئەگەرنا ئەویش تا ڕاددەیەك دەیتوانی خۆی لەو شەڕە لابدات، وەك چۆن قیادەی کۆمەڵی ئیسلامیی لە ساڵی: (٢٠٠٣)دا ڕەفتاری کرد، وێڕای چەند ستەمێکی دووبارە، دانی بەخۆیدا گرت و، شەڕێکی نەکرد، کە دەیزانی هەموولایەك تێیدا زیانبارن.

٣. بەڵام شەڕ فرۆشتنی ئێستای (داعش) بەهەرێمی کوردستان، شەڕێك نیە تەنها ڕووی لەحیزبێك و دوو حیزب بێ، هەرچەندە ئەگەر واش بێ، هەرستەمەو دەستدرێژیی گشتیی بێ، یان تایبەتیی، هەر دەستدرێژییە، بەڵکو شەڕەکەی (داعش) گێچەڵێکە بەکۆی هەرێمی کوردستان دەکرێ، بەڵکو بەکوردستان بەگشتی لەباشووری و ڕۆژئاوای!

٤. بەڵام هێزەکانی هەرێمی کوردستان بەرگریی لەخاكو خەڵکەکەیان دەکەنو، هەڵیان نەکوتاوەتە سەر بنکەو بارەگاو موڵكو ماڵی خەڵکی دیکە!

٥. ئنجا دیارە (داعش) ئێستا وەك ڕێکخراوێکی پەڕگیرو تیرۆریست، بۆتە هەڕەشەو مەترسیی بۆ سەر خەڵکێکی زۆر، لە پانتاییەکی فراوانی هەردووك وڵاتی عێراقو سووریاداو، لەو شوێنانەدا کە دەستەڵاتیان هەیە، خەڵکیان زۆر بێزارو نارەحەت کردوەو، خەڵکەکە خواخوایانە هەرچی زووتر لەدەستیان قوتار بن.

٦. هەروەها (داعش) "وەك لە ئالقەی یەکەمی ئەم بەشەدا خستمانە ڕوو" بەبیرو بۆچوونی پەڕگیرانەو لارو، ڕەفتاری ناشەرعییانەی نالەباریان، بوونەتە پەڵەیەکی ڕەش بەنێوچاوانی مسوڵمانانەوەو، کارێکیان بەئیسلام کردوە "لەڕووی بەناهەق بێزراندنو شێواندنیەوە" کە بەزۆر لەدوژمنو ناحەزانی نەدەکراو، پەندی (قد يبلغ الجاهل من نفسه، مالا يبلغ منه عَدوُّه)یان بەسەردا چەسپیوە!

٧. کەواتە:

هەقم بوو بەو پرسیارە بڵێم: پرسیارێکی فەقیر حاڵانە!

**٢٠/موحەڕڕەمی ١٤٣٦ کۆچی**

**٢٠١٤/١٢/١٢ی زایینیی**

**هەولێر**

**مێژووی پێداچوونەوە بۆ چاپی دووەم:**

**١٥ محرم ١٤٤٠ك**

**٢٥ ئەیلوولی ٢٠١٨ز**




# بەرهەمەكانی دانەر

## أ - كتێبە كوردییەكان :

| ژ | كتێبەكان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| | قورئان و سوننەت | | |
| ١ | پوختەیەك دەربارەی ئیسلام لەبەر ڕۆشنایی سورەتی فاتیحەدا | چاپی یەك/١٩٨٤<br>چاپی دوو/٢٠٠٦ | |
| ٢ | با لە خزمەت قورئاندا بین، {كۆی هەردووك كتێبی: (چۆن باشتر لە قورئان بەهرەمەند دەبین؟)و (ئەركی سەرشانمان بەرانبەر بە قورئان)ە} | چاپی یەك/٢٠٠٨<br>چاپی دوو/٢٠١٥ | |
| ٣ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی یەكەم: سووڕەتەكانی: (الفاتحة) و (البقرة) | چاپی یەك/٢٠١٢ | |
| ٤ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی دووەم : سووڕەتی: (آل عمران) | چاپی یەك/٢٠١٢ | |
| ٥ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی سێیەم: سووڕەتی: (النساء) | چاپی یەك/٢٠١٣ | |
| ٦ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی چوارەم: سووڕەتی: (المائدة) | چاپی یەك/٢٠١٤ | |
| ٧ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی پێنجەم: سووڕەتی: (الأنعام) | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ٨ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی شەشەم : سووڕەتی: (الأعراف) | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| ٩ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی حەوتەم: سووڕەتی: (الأنفال) | چاپی یەك/٢٠١٦ | |

| ژ | كتێبەكان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١٠ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی هەشتەم: سوورەتی: (التوبة) | چاپی یەك/٢٠١٧ | |
| ١١ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی نۆیەم: سوورەتی: (یونس) | چاپی یەك/٢٠١٨ | |
| ١٢ | بەرگی دەیەم سوورەتی: (هود) | چاپی یەك / ٢٠١٨ | |
| ١٣ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی یازدەیەم: سوورەتی: (یوسف) | چاپی یەك / ٢٠١٩ | |
| ١٤ | شوێنكەوتنی سوننەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەنێوان كەمتەرخەمیی و زێدەڕۆییدا | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ١٥ | ڕێبازی پێغەمبەری خوا: پێناسەو گرنگیی و پێویستیی | چاپی یەك/٢٠١٨ | |
| | **بیروبرواو فیكری ئیسلامیی** | | |
| ١٦ | دەبەرێك ڕاچوونی ئیسلام و ڕێچكان | چاپی یەك/١٩٨٥<br>چاپی سێ/٢٠٠٦ | |
| ١٧ | پرۆژەی بەرنامەی فیكریی كاری ئیسلامیی | چاپی یەك/١٩٩٦ | |
| ١٨ | بنەما شەرعییەكان و هێڵە گشتییەكانی كۆمەڵی ئیسلامیی | چاپی یەك/٢٠٠١<br>چاپی سێ/٢٠١٤ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبییش |
| ١٩ | چەند مەسەلەیەكی باوی سەردەم، سەرنجێكی واقیعییانەو هەڵسەنگاندنێكی شەرعییانە | چاپی یەك/٢٠٠٢<br>چاپی شەش / ٢٠١٦ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی و توركیی و فارسییش |
| ٢٠ | خواناسیی، ئایین، ئیمان (ڕاستییەكانی ئیسلام دەدرەوشێنەوەو ئەفسانەكانی ڕێچكان دەپووچێنەوە) | چاپی یەك/٢٠٠٢<br>چاپی دوو/٢٠٠٩ | |
| | مەوسووعەی : ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا، (٦ بەرگ) | چاپی یەك/٢٠٠٦-٢٠٠٨ چاپی دوو/٢٠١٦ | |
| ٢١ | بەرگی یەكەم: ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی چیەو چۆنە؟ | | |
| ٢٢ | بەرگی دووەم: خوا بەیەكگرتن لە بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگارێتییدا | | |

| ژ | كتێبەكان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ٢٣ | بەرگی سێیەم: خوا بەیەكگرتن لە ناو و سیفەت و لەپەرستراوێتییدا | | |
| ٢٤ | بەرگی: چوارەم: ئیمان بە: فریشتەكانی خوا، كتێبەكانی خوا، پێغەمبەرانی خوا | | |
| ٢٥ | بەرگی پێنجەم: ئیمان بە: ڕۆژی دوایی و قەزاو قەدەر | | |
| ٢٦ | بەرگی شەشەم: تایبەتمەندیی و دیدوبۆچوونەكانی پەیڕەوانی ڕێبازی ڕاست | | |
| ٢٧ | ڕێبـازی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم كامەیە ؟! | چـاپی یەك/١٩٨٩ | دواتر خرایە نێو كتێبی (مسـوڵمانی كامڵ: بەشی یەكەم: بیروباوەڕی مسـوڵمان) |
| ٢٨ | مسـوڵمانی كـامڵ : بەشی یەكـەم : بیـروباوەڕی مسـوڵمان | چـاپی یەك/١٩٩٧ | دواتر خرایە نێو كتێبی (ئیمان و عەقیدەی ئیسـلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سـوننەتدا) |
| ٢٩ | تەوژمی ئیسلامیی و عەلمانیی و خاڵە هاوبەش و جیاوازەكانیان | چاپی یەك/٢٠٠٨<br>چـاپی سێ/٢٠١٥ | زۆربەی بە (٢٤) ئاڵقــە لە هەفتەنـامەی (هـاووڵاتیی) و، ئەوەی دیكەش بە (٩) ئاڵقە لە هەفتەنامەی (ئاوێنە)دا بڵاوكراوەتەوە |
| ٣٠ | ڕوونكردنەوەی بنەما شەرعییەكان و هێڵە گشتییەكانی كۆمەڵی ئیسـلامیی | چاپی یەك/٢٠١٢<br>چاپی سێ/٢٠١٤ | |
| ٣١ | تەرجەمەی كوردیی عەقیدەی طـەحاویی | چاپی یەك/٢٠١٤ | |
| ٣٢ | ڕوونكردنەوەی عەقیدەی طەحــاویی | چاپی یەك/ ٢٠١٥<br>چاپی دوو/٢٠١٧ | |
| ٣٣ | سیكۆلاریزم و دیموكراسیی لەئەزموونی كوردستاندا (دیبەیتی ساڵ) | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| | مەوسووعەی: بیركردنەوەی ئیسلامی لەنێوان وەحیی و واقیع دا | | |
| ٣٤ | كتێبی یەكەم: پێناسەو چییەت و سەرگوزشتەو سەرچاوەكان و گرنگیی: بیركردنەوەی ئیسلامیی | چاپی یەك / ٢٠١٨ | |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ٣٥ | کتێبی دووەم: هێڵە گشتییەکانی ڕێبازی جەماوەری مسوڵمانان | چاپی یەك / ٢٠١٨ | |
| ٣٦ | کتێبی سێیەم: تەوژمە فیکرییە سەرەکییەکانی مێژووی مسوڵمانان | چاپی یەك / ٢٠١٨ | |
| ٣٧ | کتێبی چوارەم: پایەکانی بیرکردنەوەی ئیسلامی | چاپی یەك / ٢٠١٨ | |
| ٣٨ | کتێبی پێنجەم: چەند پرسێکی فیکریی هەنووکەیی جۆراوجۆر | چاپی یەك / ٢٠١٩ | |
| | **فیقهی ئیسلامیی** | | |
| | مەوسووعەی: خواپەرستیی ئیسلامیی (٤ بەرگ) | چاپی یەك/٢٠٠٠ چاپی دوو/٢٠٠٩ | |
| ٣٩ | بەرگی یەکەم: خواپەرستیی بەگشتیی، وردە بابەتە خیلافییەکان، پاك و خاوێنیی | | |
| ٤٠ | بەرگی دووەم: نوێژ بەرپاکردن یەکەمین دروشمی خواپەرستیی | | |
| ٤١ | بەرگی سێیەم: زەکات و ماڵ بەخشین | | |
| ٤٢ | بەرگی چوارەم: ڕۆژو گرتن، حەج و عومرەکردن، زیکری خواکردن | | |
| ٤٣ | بنچینە گرنگەکانی هەڵسەکەوتی شەرعییانەو ژیرانە لەگەڵ وردە بابەتە خیلافییەکاندا | چاپی یەك/١٩٩٩ | بۆ زمانی عەرەبیش وەرگێڕراوە |
| ٤٤ | جەژن و یادو بۆنەکان و هەڵسەنگاندنێك | چاپی یەك/٢٠١٣ | |
| ٤٥ | چەند بابەتێکی هونەریی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا | چاپی یەك/٢٠٠٩ چاپی دوو/٢٠١٥ | بۆ زمانی فارسییش تەرجەمە کراوە |
| ٤٦ | چەند بنەمایەکی گرنگی ماڵ و سامان بەخشین لەڕێی خوادا | چاپی یەك/٢٠١٣ | |

| ژ | كتێبەكان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| | **تەزكیـەی نەفس و ڕەوشت و ئاكـار** | | |
| ٤٧ | یادی خوا، گرنگیی یادی خوا لە ژیانی مرۆڤدا | چاپی یەك/١٩٨٧ | |
| ٤٨ | ڕێگای صاڵح بوون و بەرەو خوا چوون، تەزكیەی نەفس لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا | چاپی یەك/١٩٩٠ چاپی پێنج/٢٠١٢ | وەرگێڕدراوە بۆ زمانی عەرەبی و فارسییش |
| ٤٩ | مزگەوتەكانی كوردستان لەنێوان ئاوەدانكردنەوەو وێرانكردندا | چاپی یەك/١٩٩٩ | |
| ٥٠ | گەڕانەوە بۆ لای خـوا (سبحانە وتعالی)، بەرەو خوا وەرچەرخان و وازهێنان لە گوناهو سەرپێچیی و گۆڕانكاریی ڕیشەیی بەسەر خۆدا هێنان | چاپی یەك/٢٠٠١ چاپی پێنج/٢٠١٠ | |
| ٥١ | شـەهید كێیەو چ پلەوپایەیەكی هـەیە ؟! | چاپی یەك/٢٠٠٢ | |
| ٥٢ | باسێك لەبارەی بینینی خوای بەرزو مەزن لەدنیاو دواڕۆژدا | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ٥٣ | گیانی ژیـان، باش خوا پەرستن و خۆ پاك و چاك كردن | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ٥٤ | مەوسـوعەی: ڕەوشت و ئاكاری ئیسـلامیی لەبەر ڕۆشـنایی قورئان و سـوننەتدا | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| | **بانگـەوازو كـاری ئیسـلامیی** | | |
| ٥٥ | كۆمەڵی خــوا | چاپی یەك/١٩٨٨ | |
| ٥٦ | پێشمەرگەی ئیسـلام، یان مسـوڵمانی موجاهید كێیەو چۆنە؟ | چاپی یەك/١٩٨٨ چاپی سێ/١٩٩٨ | |
| ٥٧ | دەردو دەرمانی بزووتنەوەی ئیسـلامیی | چاپی یەك/١٩٩٠ | |
| ٥٨ | بزووتنەوەی ئیسـلامیی لە دووڕیانی مان و نەماندا | چاپی یەك/١٩٩٣ | |
| ٥٩ | بزووتنەوەی ئیسـلامیی و قۆناغی نوێی | چاپی یەك / ١٩٩٤ | |
| ٦٠ | چەند ڕێڕوونییـەك بۆ ئیسـلامییەكانی كوردستان | چاپی یەك / ١٩٩٧ | |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ٦١ | بزووتنەوەی ئیسلامیی و ئاسۆیەکی گەش و ڕوون، بنەما شەرعی یەکان و بنچینە ئەخلاقی یەکان | چاپی ١ / ١٩٩٧ | |
| ٦٢ | ئیسلام و کێشە هەنووکەیی یەکان | چاپی یەك / ١٩٩٨ | |
| ٦٣ | زانایانی ئیسلام کێن و چۆنن ؟! | چاپی یەك/ ٢٠٠٢<br>چاپی سێ / ٢٠١١ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی |
| ٦٤ | کۆمەڵی ئیسلامیی: ئامانج و هەڵوێستەکانی | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ | |
| ٦٥ | چۆن هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵکی دا بکەین؟! | چاپی یەك / ٢٠٠٢ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی |
| ٦٦ | چۆن لە جیهاد بگەین؟ | چاپی یەك / ١٩٩٨ | |
| ٦٧ | جیهاد لە ڕێی خواداو چەند سەرنج و ئاگادارییەك | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ | |
| ٦٨ | بۆئەوەی لەسەر جیهادکردنمان قەرزدار نەبینەوە! | چاپی یەك / ٢٠٠٢ | |
| ٦٩ | جیهاد لە ڕێی خوادا چی یەو بۆچی دەکرێ و چۆن دەکرێ ؟ | چاپی یەك / ٢٠٠٢ | |
| ٧٠ | چەند ڕێڕوونییەك بۆ خوشك و برایانمان لە هەندەران | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ | |
| ٧١ | ئیسلام و مسوڵمانەتیی و کاری ئیسلامیی، لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا | چاپی یەك/٢٠٠٦ | |
| ٧٢ | هاوپەیمانێتی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا | چاپی یەك / ٢٠٠٩ | |
| ٧٣ | بەشدارییکردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا، هەڵسەنگاندنێکی شەرعییانەو ژیرانە | چاپی یەك / ٢٠٠٩<br>چاپی دوو / ٢٠١٣ | چاپی یەکەم بە دوو ئاڵقەی جیاوازو بە دوو ناوونیشانی جیاواز کراوە، بەم شێوەیە:<br>ئاڵقەی یەکەم: بەڵگەکانی ئەوانەی بەشداریکردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا بەشەرعیی نازانن و هەڵوەشاندنەوەیان.<br>ئاڵقەی دووەم : بەڵگەکانی ڕەوایی بەشداریکردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا |

| ژ | كتێبەكان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ٧٤ | هەڵوەشاندنەوەی بیروڕاو ڕەفتارە پەڕگیرانەكانی ڕێكخراوی (داعش) | چاپی یەك/ ٢٠١٥<br>چاپی دوو/٢٠١٧ | وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسیی |
| ٧٥ | با لادان و تاوانی پەڕگیران، بەرانبەر بە ئیسلام نەمانخاتە دوودڵیی و گومان | چاپی یەك/٢٠١٥ | وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسیی |
| ٧٦ | پەڕگیریی: پێناسەی، نیشانەكانی پەڕگیران، هۆكارەكانی پەڕگیریی، شوێنەوارو دەرهاویشتەكانی، چارەسەری | چاپی یەك/ ٢٠١٥ | وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسیی |
| زنجیرەی بنەما شەرعییەكانی كۆمەڵی ئیسلامیی | | | |
| ٧٧ | ئاڵقەی یەكەم: بەڵگە شەرعییەكانی بنیاتنانی كۆمەڵی ئیسلامیی | چاپی یەك / ٢٠٠١ | |
| ٧٨ | ئاڵقەی دووەم و سێیەم: حوكمی لادانی خەلیفەو كاربەدەستانی مسوڵمان لەكاتی لاریی و ستەمكارییدا | چاپی یەك / ٢٠٠١ | |
| ٧٩ | ئاڵقەی چوارەم : شێخ ئەبو بەصیرو هەڵسەنگاندنێكی شەرعییانەو ژیرانەی فەتوانامەكەی | چاپی یەك / ٢٠٠١ | |
| وتاری كۆنگرەكانی كۆمەڵی ئیسلامیی كوردستان | | | |
| ٨٠ | كارو پڕۆژەی ئیسلامییمان (وتاری كۆنگرەی یەكەمی كۆمەڵی ئیسلامیی) | چاپی یەك/٢٠٠٥<br>چاپی دوو/ ٢٠٠٦ | |
| ٨١ | ڕاپۆرتی : ئیمانیی، فیكریی، سیاسیی كۆمەڵی ئیسلامیی كوردستان (وتاری كۆنگرەی دووەمی كۆمەڵی ئیسلامیی) | چاپی یەك/٢٠١٠ | |
| ٨٢ | چاوپێداگێڕانەوەیەكی بارودۆخی نێوخۆمان و واقیعی دەرەكییمان (وتاری كۆنگرەی سێیەمی كۆمەڵی ئیسلامیی)، ٣٠ /٥/ ٢٠١٥ | چاپی یەك/٢٠١٦ | |

| ژ | كتێبەكان | بەروار و چاپ | تێبینـی |
|---|---|---|---|
| | **نەتەوایەتیی و مەسـەلەی كورد** | | |
| ٨٣ | كوردسـتان بۆ وێران بوو و چۆن ئاوەدان دەبێتەوە؟! | چاپی یەك / ١٩٨٩ | |
| ٨٤ | حوكمی گەڕانەوە ژێر نیـری طاغوت لە ڕوانگەی ئیسـلامەوە | چاپی یەك/١٩٩٠<br>چاپی دوو/٢٠٠٥ | |
| ٨٥ | سـۆزی نەتەوایەتیی و بیری ناسـیۆنالیزم لە تەرازووی ئیسـلامدا | چاپی یەك/١٩٩٠، چاپی دوو/ ١٩٩٨، چاپی سێ/٢٠٠٥، چاپی چوار/ ٢٠١٨ | |
| ٨٦ | چارەســەری كێشــەی كـورد لە نێوان ئیمان و پەرلەماندا | چاپی یەك/١٩٩٢ | |
| | **سیاسـەت و حوكمڕانیی** | | |
| ٨٧ | چەند بابەتێكی سیاسـی هاوچەرخ لەبەر ڕۆشـنایی عەقـڵ و وەحییدا | چاپی یەك / ٢٠١٠ | |
| | مەوسووعەی: ئیسلام و دەوڵـەتداریی، (٤ بەرگ) | چاپی یەك / ٢٠١٤-٢٠١٦ | |
| ٨٨ | بەرگی یەكەم: قەوارەی سیاسیی لەئیسلامدا: بەڵگەكانی پێویستبوونی، چۆنیەتی بنیاتنانی، سروشت و بناغەی فیكریی، پێناسەی چەند وشەو زاراوەیەك | | |
| ٨٩ | بەرگی دووەم: بنەمایەكانی سیستمی حوكمڕانیی لەئیسلامدا | | |
| ٩٠ | بەرگی سێیەم: (سێ دەستەڵاتەكان):<br>یاسادانان<br>جێبەجێكردن<br>دادوەریی | | |
| ٩١ | بەرگی چوارەم: نا مسوڵمانان لە كۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامییدا | | |
| ٩٢ | ڕوانینێكی ئیسلامییانە بۆ واقیعی ئێستامان | چاپی یەك/٢٠١٧ | |
| ٩٣ | قورئان و پاكسازیی و چاكسازیی لە هەرێمی كوردستاندا | چاپی یەك/٢٠١٨ | |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ٩٤ | گرنگیی ڕەوشت لە سیاسەتدا. | | |
| | **ئافرەت و خێزان** | | |
| ٩٥ | ئافرەتی مسـوڵمانی کورد، مافە شەرعییەکانی و ئەرکە گرنگەکانی | چاپی یەك / ٢٠٠٣ | |
| ٩٦ | مەوسـووعەی : ئـافرەت و خێزان لە سایەی شــەریعـەتدا | بەرگی یەکەم چاپی یەك/٢٠٠٢<br>بەرگی یەك و دوو چـاپی سێ/٢٠١٣ | |
| | **مـێـــژوو** | | |
| ٩٧ | پوختەی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، دەرس و پەندەکانی | چاپی یەك/٢٠٠٩<br>چاپی سێ/٢٠١٣ | |
| ٩٨ | چەند مەڵۆیەك لە خەرمانی تەمەنم (بیرەوەرییەکانم)، بەشی یەکەم (١٩٦١-١٩٩١) | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ٩٩ | بەرکوڵێکی کاروچالاکیی و ڕووداو و وێستگەکانی ژیانم | چاپی یەکەم/٢٠١٨ | |
| | **دیدارو گفتوگۆ** | | |
| ١٠٠ | سـنووره قەدەغەکان مەشکێنن! (چاوپێکەوتنی دکتۆرحسـین محمد عزیز) | چاپی یەك/٢٠٠١<br>چاپی دوو/٢٠٠٤ | |
| ١٠١ | ئەشـکەنجــەو زیندان، پێشــمەرگەیەك بیسـت و دوو مانگ لە زینــدانی داگیرکــەردا | چاپی یەك / ٢٠٠٥<br>چاپی سێ / ٢٠٠٩ | وەرگێڕراوەتە سـەر زمانی عەرەبی، هەروەها دوو تەرجەمەی فارسـیشی کراوەو چـاپ و بڵاوکراوەتەوە، هەروەها بۆ زمانی ئینگـلیزیش وەرگێڕراوەو چـاوەڕێی چاپە |
| ١٠٢ | گەنج لە چەمکە هەنووکەییەکاندا | چاپی یەك/ ٢٠١٠ | |
| | **زنجیرەی بابەتە هەنووکەییەکان** | | |
| ١٠٣ | گەنجەکانــمان لە نێوان ڕەسـەنایەتیی و لاســایی کردنەوەدا (١) | چاپی یەك/ ٢٠٠٦ | بۆ زمانی فارسـییش وەرگێڕراوە |

| ژ | كتێبەكان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١٠٤ | با وریا بین ! داڕووخانی ڕەوشت كۆمەڵگاكەمان بەرەو هەڵدێر دەبات (٢) | چاپی یەك / ٢٠٠٢<br>چاپی دوو/ ٢٠٠٦ | |
| ١٠٥ | بەدوورخستنەوەی ئافرەت لە ئیسلام چ زیانێك دەكەین؟! (٣) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١٠٦ | چۆنیەتی بوونە پێشەنگ و بنیاتنانی بنكەی جەماوەریی (٤) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١٠٧ | سیاسەتی ئیسلامیی و چەند ڕوونكردنەوەیەك (٥) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١٠٨ | چەند بنەمایەكی گرنگی وتاربێژیی (٦) | چاپی یەك / ٢٠٠٦ | بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕاوە |
| ١٠٩ | قوتابیانی زانیاری شەرعیی و چەند سەرنج و ڕێنمایی یەك (٧) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١١٠ | خوو ڕەوشتی بەرزو پەسند سەنگی مەحەكی مسوڵمانەتییە (٨) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١١١ | بانگەواز بۆ لای خودا، چی یەو چۆنەو بە كێ دەكرێ؟ (٩) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕاوە |
| ١١٢ | قوتابیان لەم هەل و مەرجەدا، پێویستە چۆن بن و چی بكەن ؟! (١٠) | چاپی یەك / ٢٠٠٨ | |
| ١١٣ | واقیعی هەرێمی كوردستان، دیدێكی ئیسلامییانە (١١) | چاپی یەك / ٢٠٠٨ | |
| ١١٤ | سروشت و پایەكانی خێزان و مەسەلەی چەندژنیی لە تەرازووی شەرع و عەقڵدا (١٢) | چاپی یەك/٢٠٠٩ | ئەم نامیلكەیە بە(١٤) ئاڵقە لە ڕۆژنامەی (ڕۆژنامە)دا بڵاوكراوەتەوە |
| ١١٥ | كاری ئیسلامیی و ڕەواندنەوەی چەند تەمومژێك (١٣) | چاپی یەك / ٢٠١١ | |
| ١١٦ | حوكمی لە ئیسلام هەڵگەڕانەوەو هەڵسەنگاندنێك (١٤) | چاپی یەك/ ٢٠١١ | |
| ١١٧ | مەلای گەورەی كۆیەو تەفسیرەكەی و چەند سەرنجێك (١٥) | چاپی یەك / ٢٠١١ | |
| ١١٨ | لێكۆڵینەوەیەك لەبارەی : هەبوون و نەبوونی نەسخ لە قورئاندا (١٦) | چاپی یەك / ٢٠١٢ | |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١١٩ | تاقیکردنەوەی خوا بۆ بەندەکانی چی یەو چۆنە؟ (١٧) | چاپی یەك/ ٢٠٠٣<br>چاپی دوو/ ٢٠١٢ | |
| ١٢٠ | ڕەوەندی کورد لە هەندەران و ئەرکی سەرشانی (١٨) | چاپی یەك / ٢٠١٢ | |
| ١٢١ | خاتوون مەلاژن : ئافرەتێکی هەڵکەوتوو و هاوسەرێکی ناوازە (١٩) | چاپی یەك / ٢٠١٢ | |
| ١٢٢ | گەنج و قەیرانی ڕووحیی: هۆکار، شوێنەوار، چارەسەر (٢٠) | چاپی یەك ٢٠١٧ | |
| ١٢٣ | ژیان لەسایەی ئیمانداو ڕەواندنەوەی گومانەکان (٢١) | چاپی یەك/ ٢٠١٧ | |
| | **ب- کتێبە عەرەبییەکان** | | |
| ١٢٤ | موسوعة : الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله | ط الأولى/٢٠١٥ | کە لە چاپی یەکەمدا (٨) بەرگەو، لە چاپی دووەمیدا لە (١٢) کتێبدا دەبێ، بەم شێوەیە: |
| ١٢٥ | الكتاب الأول: الإسلام: معرفة صحيحة بالخالق عز وجل والخلق | ط الثانية/٢٠١٦ | |
| ١٢٦ | الكتاب الثاني: تعريف الإيمان | ط االثانية/٢٠١٧ | |
| ١٢٧ | الكتاب الثالث: الإيمان بالله تبارك وتعالى: الخالق الرب المالك الإله ذي الأسماء الحسنى والصفات العلى | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١٢٨ | الكتاب الرابع: الإيمان بالملائكة و بالجن | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١٢٩ | الكتاب الخامس: الإيمان بكتب الله الحكيم | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١٣٠ | الكتاب السادس: الإيمان برسل الله تعالى وأنبيائه الكرام | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١٣١ | الكتاب السابع: خاتم النبيين محمد صلى الله علية وسلم: موجز سيرته وبراهين نبوّته ط الثانية / ٢٠١٨ | | |
| ١٣٢ | الكتاب الثامن: الإيمان باليوم الآخر وموجز عن القدر ط الثانية / ٢٠١٨ | | |
| ١٣٣ | الكتاب التاسع: إهتداء الإنسان بهدى الله، أو الإلتزام الفردي بشريعة الله | | |

| ژ | كتێبەكان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١٣٤ | الكتاب العاشـر: إلتزام الـمجتمع بشريعة الله تعالـى | | |
| ١٣٥ | الكتاب الحـادي عشـر: تطبيق الـمجتمع للشــريعة و معــالم الدولة فـي الإســلام | | |
| ١٣٦ | الكتاب الثاني عشــر: الإســـلام: نظــرة ســديدة تجــاه الناس وتعامل صحيح معهم | | |
| ١٣٧ | نقض فـكــرة التطــرف | "ط الأولى/٢٠١٦-لندن-، ط الثانية/ ٢٠١٧، -القاهرة (نقض التطرف ودحض أفكار المتطرفين)" | |
| ١٣٨ | ضــيف و قضــية (مقابلة مع قنــاة العربية) | ط الأولى/٢٠٠٦ | |
| ١٣٩ | لقاء خاص (مقابلــة مع قنــاة العــالم) | ط الأولى/٢٠٠٦ | |
| ١٤٠ | حديث مختصر حول مايجري على الساحة العراقية | ط الأولى /٢٠١٦ | |
| ١٤١ | طريق الصلاح والسير الى الله / تزكية النفس في ضوء القرآن والسنة | ط الأولى/٢٠١٢ | |
| ١٤٢ | أمير وراء القضبان | ط الأولى/ ٢٠٠٩ | |
| ١٤٣ | مسائل عصرية رائجة | ط الثانية/٢٠١٤ | |
| ١٤٤ | قواعد مهمة في التعامل الشرعي الحكيم مع المسائل الفرعية الخلافية | ط الأولى/ ٢٠١١ | |
| ١٤٥ | علماء الإسلام من هم وماهي صفاتهم؟ | ط الأولى/ ٢٠٠٥ | ط الثانية / ٢٠١٨ |
| ١٤٦ | الأُصول الشرعية والخطوط العامة للجماعة الإسلامية | ط الأولى/ ٢٠١٢ | |
| ١٤٧ | كيف نتعامل مع الناس؟ | ط الأولى/٢٠٠٢ | |
| ١٤٨ | حوارات ساخنة حول قضايا راهنة، في ميادين الفكر والفقه والدعوة والسياسة | ط الأولى/٢٠١٨ | |
| ١٤٩ | العلمانية والديمقراطية في تجربة كوردستان | ط الأولى/٢٠١٨ | |
| ١٥٠ | مختصر نشاطات وأحداث حياتي / ١٩٦١ - ٢٠١٧م | ط الأولى/٢٠١٨ | |
| | **ئەو كـتـێبانـەی لـەژێـر چاپــن** | | |
| ١٥١ | تەفســـیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی دوازدەیەم: ســوورەتەكانی: (الرعد، إبراهيم، الحجر) | | |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١٥٢ | درەوشاوەیی ئیمان و پووچەڵیی ئیلحاد، لە بەرتیشکی زگماك و عەقڵ و زانست و وەحیی دا. | | |
| ١٥٣ | چاو پێدا گێڕانەوەیەكی كاری ئیسلامیی | | |
| ١٥٤ | نظرات فاحصة في قضايا شاخصة: الإسلام والأمة، القضية الكوردية، الوضع العراقي | | |




## ناوەرۆک

**بەشی دووەم**




# کورتەیەک لە مێژووی ژیانی

# مامۆستا عەلی باپیر



• ناو: عەلی باپیر وەتمان.
لەدایکبووی: ساڵی (١٩٦١ز)دا لەقەزای پشدەر سەر بەپارێزگای سلێمانیی.

• زانیارییە ئیسلامییەکانی لە پەیمانگای ئیسلامیی (ڕانیە و سلێمانیی) و لای زانایانی کوردستانی عێراق و کوردستانی ئێران بەدەستهێناون، لەساڵی (١٩٨٠ز)دا قورئانی بەپێزی لەبەر کردوە.

• لەساڵی (١٩٨١ز)دا لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە بڕیاری دەستگیرکردنی دراوە، هەربۆیە ئەوکات عێراقی جێهێشتوەو ئاوارەی ئێران بووە، کە ئەوکاتە لە قۆناغی دووەمی زانکۆ بووە، کۆلیجی شەریعەت.

• لەساڵی (١٩٨٣ز)دا گەڕاوەتەوە کوردستانی عێراق و لە بەڕێوەبەرایەتی ئەوقافی هەولێر تاقیکردنەوەی ئیمامەتی داوەو، لە مزگەوتی (نۆڕسیی) لە شاری ڕانیە دامەزراوەو بەردەوام بووە لەسەر دەرس گوتنەوەو بانگەوازی ئیسلامیی و...هتد.

• لەساڵی (١٩٨٧ز) دا پاش ساڵانێك لە خەباتی ئاشكراو نهێنیی پەیوەست لەگەڵ {بزووتنەوەی پەیوەندیی ئیسلامیی}دا، چۆتە چیا و دەستی بەخەباتی چەكداریی كردوە لە چوارچێوەی بزووتنەوەی ئیسلامیی دا، كە لەچەند ناوچەیەكی كوردستاندا بنكەو بارەگای سەربازیی هەبوو دژی ڕژێمی بەعس و، هێزی حەمزەی لە بناری چیای قەندیل دامەزراند.

• لە ساڵی (١٩٨٨ز)دا بووە بە ئەندامی مەکتەبی سیاسیی بزووتنەوەی ئیسلامیی.
• لەساڵی (١٩٩١ز)دا ڕۆڵی هەبووە لەڕاپەڕینی ئازاری (١٩٩١ز) داو ورپاکردنەوەی خەڵکی کوردستان، لە مەبەست و ئامانجەکانی ڕاپەڕینی جەماوەریی و ناساندنی بزووتنەوەی ئیسلامیی دا.
• تاکو ساڵی (٢٠٠١ز) لەنێو بزووتنەوەدا درێژەی بەخەباتی خۆی داوەو، لەهەمان ساڵدا لەگەڵ زۆربەی هەرە زۆری هێزو مەڵبەندەکانی بزووتنەوەی ئیسلامیی لەبەر چەند هۆکارێکی مەنهەجیی (کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان) ڕاگەیانراو بەئەمیری کۆمەڵی ئیسلامیی هەڵبژێردرا.
• لە (٢٠٠٣/٧/١٠ز) لەسنووری سلێمانیی لەلایەن هێزەکانی ئەمەریکاوە بەتۆمەتی ناڕەوا دەستگیرکراو، بۆ ماوەی (٢٢) مانگ لەزینداندا مایەوەو، هەر لەزینداندا مەوسووعەی: (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله)ی لە دوازدە کتێب و زیاتر لە چوار هەزار (٤٠٠٠) لاپەڕەدا نووسی و، لە (٢٠٠٥/٤/٢٨ز)دا لەزیندان ڕزگاری بووە.
• تا ئێستا زیاتر لە (١٠٠) کتێب و نامیلکەی نووسیوە لەبوارەکانی: (فیکری ئیسلامیی و عەقیدەو فیقهو حوکم و سیاسەت و تەزکیەی نەفس...)هتد.
• ئێستا پڕۆژەی تەفسیرکردنی قورئانی بەرزو بەپێزی دەستپێکردوەو نیوەی زیاتری تەواوکردوە.
• کۆمەڵی ئیسلامیی تائێستا سێ کۆنگرەی بەستوە، لەساڵانی: (٢٠٠٥ و ٢٠١٠ و ٢٠١٥ز) داو، لەهەموویاندا، بەئەمیر هەڵبژێردراوەتەوە.
• لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی (٢٠١٠-٢٠١٤ز)دا، بۆ ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراق لەسەر بازنەی پارێزگای هەولێر کاندید بووەو، دەنگی یەکەمی هێناوە، زیاتر لە (٦٠،٠٠٠) دەنگ.

**بۆ زانینی زیاتر لەسەر ژیانی دانەر، سەردانی لینکی خوارەوە بکەن:**

www.alibapir.net

/alibapir   /alibapir1   /MediaAmeerOffice

# هەڵوەشاندنەوەی
# پەڕگیری

**ئـەم کتێبـــە :**

جوانیـی و ڕەونەقـی ئیسـلام: تاکـە ئایـن و بەرنامـەی پەسـندی خـوای کارزان بـۆ بەندەکانـی، لەهاوسـەنگیی (إتِّـزان) و ڕێکیـی (إعتدال)ەکـەی دایـە، کـە فەرمایشـتی بـێ وێنـەی خـوا عزوجـل و ڕێبـازی پێغەمبـەری پێشـەوا (صلـی اللـه علیەوسـلم) بەچاکتریـن شـێوە بەرجەسـتەیان کـردوەو، پێشـینی چاکیشـمان، بەتایبـەت هاوەڵانـی دڵسـۆزی پێغەمبـەری خـوا و چـوار جێنشـینە بەڕێزەکـەی: ئەبوبەکـر و عومـەر و عوسـمان و عەلـی (خوا لێیان ڕازی بێ) زۆر بەباشیی جێبەجێیان کردوەو پراکتیزەیان کردوە.

ئنجـا لەسـۆنگەی ئـەوەوە کـە تێکدانـی ئـەو حاڵـەتی هاوسـەنگیی و ڕێکییـە، لـە ئایـن و بەرنامـەی تێروتـەواوی خـوادا، چ بەبـاری شـلگیریی و کەمتەرخەمیـی (تفریـط)دا، چ بـە بـاری پەڕگیریـی و زێدەڕۆیـی (إفـراط)دا، دەردو نەخۆشـییەکی کوشـندەیە، بـە پێویسـتم زانـی: ئـەم کتێبـە تەرخـان بکـەم بـۆ خسـتنەڕووی هاوسـەنگیی ئیسـلام، لەگەڵێـك بـواری دینداریـی و دنیادارییـداو، پووچەڵکردنـەوەی پەڕگیریـی (تطرُّف)و تێپەڕانـدن، کـە دەردێکـی سـامناکی ئـەم ڕۆژگارەیـە، بـۆ ئیسـلام و مسـوڵمانان و، زیـان و دەرهاویشـتە خراپەکانـی، ئـە گەر لەهی شلگیریی و بەزایەدان زیاترنەبن، کەمتر نین.




**نوسینگەی تەفسیر**
بۆ بڵاوکردنەوە
هەولێر - شەقامی ۳۰مەتری تەنیشت منارەی چۆڵی



+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com
/TafseerOffice